به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبانەوە

پێشکەشە:

- بە گیانی پاکی ئەو شەهیدانەی کە لە پێناوی کورد و کوردستان خۆیان بەخت کرد.

- بە سیاسەتوانان و رۆشنبیرانی کورد کە بەرگرییان لە مافە رەواکانی گەلی کورد کردووە.

- بەو برا عەرەب و فارسانەی کە گیانی فیداکارییان تێدایە بەرانبەر گەل و نیشتمانەکەیان، وە باوەڕیان هەیە کە ئەبێت کوردستانی گەورە دامەزرێت.

- بە هەموو ئەو هاوولاتییانەی کە باوەڕیان بەوە هەیە کە تاکە رێگا بۆ سەرکەوتنی گەلی کورد لەناوبردنی جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانییە بە راپەرینێکی جەماوەری گشتی لە سەرانسەری کوردستانی گەورە.

خزمەتکاری کورد و کوردستان

رەفیق پشدەری

تێبینی:

هاوولاتییەکی زۆر پرسیاریان ئاراستە کردم کە هۆی چییە وێنە و دیکۆمێنتەکانت بڵاو ناکەیتەوە، بە داخەوە هیچ بەڵگەنامەیەکم نەماوە، تەنها خۆم ماوم بۆیە چیم دیبێت و چیم بە سەر هاتبێت دەیڵێمەوە.

1. هەموو ئەو وێنە و دیکۆمێنتانەی کە هەمبوو لە سەرەتای شۆڕشی 14ی تەمووزی ساڵی 1958، کە کاتێک گرتیانم لە ساڵی 1961 کە ماڵەکەیان پشکنیم هیچی نەما.

2. کاتێک کە "نازم کزار" کودەتاکەی کرد ئەوە بوو کە بەخدە رامکرد بۆ دەرەوەی وڵات "قاهیرە"، ئاگاداری دایکم کردەوە کە هەرچی بەڵگەنامە و وێنەیە و کاسێتێکم هەبوو هەر هەمووی لە توونی حەمام سووتانبوو.

3. لە 14.09.1976 کە گیرام هەموو ئەو شتە گرینگانەی کە هەمبوو لەگەڵ دەمانچەیەکی بێدەنگ"کاتم الصوت"، کە مەسعوود بارزانی بۆی ناردبووم کە راوە جۆلەکەی پێبکەم، لەناویان بردبوو. ئەوەی کە دەمانچەکەی تەسلیم کردم هێشتا لە ژیاندایە.

4. ئامادەم لە دادگا شەهادەتی رووبەڕوو لەسەر شەخسی مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بدەم کە لە کتێبەکانم ئاماژەم پێداوە.

خزمەتکاری کورد و کوردستان

رەفیق پشدەری

سەرەتا

24 رۆژ پێش کۆبوونەوەی نێوان ئوردوغان ،سەرۆک ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا و جۆرج دەبلیو بوش ،سەرۆک کۆماری ولایەتەیەکگرتوەکانی ئامریکا،کەلە 2007/10/ بەسترا.لەرێگای چەند کەناڵێکی تایبەتی پەیامێکم ئاراستەی بەرێزان جەلال تاڵەبانی ومەسعود بارزانی کرد. لەو پەیامەدا پێم راگەیاند بوون کەکۆبوونەوەیەکی دوو قۆڵی لەنێوان بوش و ئوردوغان دەبەسترێت. پیلانێکی داڕێژراوی ستراتیژیان ئامادەکردوە بۆ لەناو بردنی بزوتنەوەی کورد لەباکوری

کوردستان بەڕێبەرایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان و پیلانێکیشەبۆ بەناودانی ئەو دەسکەوتەسیاسی و ئابوریەکانەکوردستانی باشوردا بەدی هاتوە.

پێشم راگەیاندبوون ئەگەر بێتو فەرمانی بوش و ئوردوگان جێبەجێ بکەن،ئەوا بینەوەی بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و بنەماڵەی بارزانی دەکەونەبەر ئەفرەتی مێژوی میلەتی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورە.

راستەجێبەجێ نەکردنی فەرمان و راسپاردەکانی بوش و ئوردوغان گەلی کورد باجێکی گەورەو گران دەدات،بەڵام پلەو پایەی ئێوەش لەسەرانسەری کوردستانی گەورەدا دەگاتەئاستی شێخ مەحمودی نەمر و پێشەوا قازی موحەمەد.

بەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی ،باروذۆخێک هاتوەتەپێش بۆ ئەوەی کوردستانی گەورەرابەڕێت .

سەرەتا پێشەکیەکەم بەپەیامێک دەست پێدەکات :

بەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان ،رەفیق پشدەری و بنەماڵەی بارزانی و هۆشیار زێباری و جەلال تاڵەبانی و کوڕەکانی،باڤڵ و قوباد و ئاراس شێخ جەنگی و بەرهەم سالح و هەر هەموومان بەقوربانی گڵکۆی سەر گۆڕەکەی ئەو 9 شەهیدەی داستانی زاب بین کەوانەیەکی تری بەرەنگاریان لەمێژووی روبەڕوو بوونەوەلەگەڵ دوژمنانی کوردیان تۆمار کرد.

ئەمانەش ناوی ئەو ئەمرانەی شەهیدانی داستانی زابن: 1. یاران ئورفا 2.جاهد کوبانی 3. عەگید جان 4.زلدان شیار 5. کورسیلەنەیوان 6. جوفان بوتان 7. ئەردال ئامەز 8. ئورکان ماریسا

بڕیارم دابوو واز لەنوسینەوەی بیرەوەریەکانی خۆم بهێنم و ئەو نهێنیانەی کەئاگاداریانم لەگەڵ خۆم بیخەمەناو گۆڕەکەم و ئەوەی پێشتر نوسیبووم چاپیان نەکەمەوە.

بەڵام هەڵوێستی ناپاک و خەیانەتکارانەی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و نێچیروان بارزانی بەرانبەر بەگەلی کورد و بەتایبەتی بەرانبەر پارتی کرێکارانی کوردستان و حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان ،وایان لێکردم لەو بڕیارەم پاشگەز ببمەوەو سەر لەنوێ دەست بکەمەوەبەتۆمار کردنی خەیانەتەکانی ئەم دوو سەرکردەیەلەمێژوی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا ،کەخۆم شاهێدی حاڵی ئەو رابردوەبووم و لەگەڵ رووداوەکانیاندا ژیاوم .ئەمەمێژووی کلتوری کوردە،مەرجەتاکو لەژیاندا ماوم ئاماژەی پێ بدەم ...

درێژەی هەیە...

دوای هەڵبژاردنەکەی ساڵی 1992 و ئاکامەکانی،هەردوو زلهێزەکە،یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، جڵەوی دەسەڵات و بەڕێوەبەرایەتی وڵات بەتەواوەتی کەوتەژێر کونترۆڵیان.

ماوەیێک خەڵکەکەلەخەوندا ژیان و چاوەڕوانیان دەکرد کەئارامی و ئاشتی و ئازادی و ئاسایش بەرقەرار بێت.بەڵام ئەم ماتگەهەنگوینەتەمەنی کورت بوو،ئەوەبوو ململانێی دەسەڵاتخوازی هەریەکەبۆ خۆی شوێنی بەرژەوەندی گشتی گرتەوەو شەڕی ناوخۆ و براکوژی دەستی پێکرد.دەنگی شەقافی کوردیان خەفەکرد و ژێرخانی کوردستانیان بەتەواوەتی لەپێناوبەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا هەڵتەکاند.چەندەها پێشمەرگەریزی شۆڕشیان بەجێ هێشت و دانیشتن یان رێگەی هەندەرانیان گرتەبەر.لەماوەی شەڕی نێو خۆ و براکوژیدا،زەرەرمەندی گەورە،گەلی کورد و قازانجبەریش داگیرکەرانی کوردستان بوون.

بنەماڵەی بارزانی پەنایان بۆ حکومەتی تورکیا بردەوەبوو سوپای تورک هاتەکوردستانی باشور و جێگیر بوون و ئێستاش لەناوچەی بامەڕنی و ئامێد ماون.

مام جەلالیش سوپای پاسدارانی ئێرانی هێنایەسەر بارەگای سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کردستانی ئێران.

بەڕێزان مەسعود بارزانی وسەدام حسین ڕێککەوتن،ئەوەبوو لە/ئاب/1996 سوپای گاردی کۆماری عێراق بەسەرۆکایەتی قوسەی سەدام حسین،پایتەختی کوردستانیان داگیرکردوپۆستاڵی بەعثیەکان کەوتەناو پارلمانی کوردستان کەبەخوێنی شەهیدانی کوردستان رزگار کرا بوو.

سەرۆک کۆماری ئەوکاتەی ولایەتەیەکگرتوەکانی ئامریکا،بیل کلینتۆن وتی: کردەوەکانی کورد کەسوپای عێراقیان هێنا و پارلمانی کوردستانیان پێشێل کرد،هر وەکو ئەوە وایە کە من بڕۆم سوپای روسی بێنم و کۆشکی سپی کۆماریان تەسلیم بکەم.

کوردستانی باشور بوو بەدوو حکومەت،زیانێکی یەکجار زۆری لەهەموو بوارێکدا بەگەلی کورد گەیاند.داگیرکەرانی کوردستان(تورک،فارس و عەرەب)بەبەردەوامی دوژمنایەتی یەکتریان کردوە،بەڵام بەرامبەر کێشەی کورد و بۆ لەناوبردنی،لەگەڵ یەک لە% تەبا بوونە.ئەمەش وای کردوەجەماوەری کورد بەگوێ دان بەشەڕی ناوخۆ و برا کوژی، لەدەوری حزبەکوردیەکان کۆ بنەوە.

بەڵام بەهۆی توندی ململانێکەوەو چەندین فاکتەری دیکە،حیزبەکوردستانیەکان بەئاشکرا پێوەندیان لەگەڵ وڵاتانی ئیقلیمیدا گرێیەست کرد.

ئەم پارتەسیاسیانەی کوردستان هەر یەکەو بەم شێوەیەلەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پێوەندیان لەگەڵ داگیرکەری کوردستان هەبووە.

1. پارتی دمکراتی کوردستانی ئێران : نوسینگەی لەعێراقدا هەبوو،هاوکاری لەگەڵ رژیمی سەدام حسین هەبوو لەپێناو خزمەت کردن بەدۆزی کورد.مێژو شاهیدەهیچ سەربازێکی عێراقیان نەبردوەتەناو خاکی ئێران.
2. یەکێتی نیشتمانی کوردستان: نوسینگەی لەسوریا و تورکیا و ئێران هەبوو لەپێناو خزمەت کردن بەدۆزی کورد.
3. پارتی دیموکراتی کردستان : نوسینگەی لە( سوریا،تورکیا،ئێران)هەبوو لەپێناو خزمەیکردن بەدۆزی کورد،بنەماڵەی بارزانی پێوەندیان هەبوو لەگەڵ شەخسی سەدام حسین.راوێژ و باری مخابراتی لەنێوان بنەماڵەو دیکتاتور سەدام حسین بەنهێنی و ئاشکرا لەرێگای کاک نێچیرڤان بارزانی و قصی سەدام حسین لە/ئاب/1996 تاکو روخانی رژیم لەساڵی 2003 دا بەردەوام بوو.
4. پارتی زەحمەتکێشان: نوسینگەی لەئێران و سوریا هەبوو لەپێناو خزمەتکردن بەدۆزی کورد.
5. پارتی سوسیالیست: نوسینگەی لەئێران هەبوو لەپێناو خزمەتکردن بەدۆزی کورد.
6. پارتی کرێکارانی کوردستان:نوسینگەی لەسوریا(ئێران) هەبوو لەپێناو خزمەتکردن بەدۆزی کورد.

دوو نمونە. شۆڕشی ئەیلول گەورەترین شۆڕشی چەکداری گەلی کورد بوو کەرۆڵێکی گەورەی لەمێژووی کورد بینی،بەڵام لەبەر هەبوونی پێوەندی گوماناوی لەنێوان سەرکردەی کورد و شای ئێراندا،کەخوالێخۆشبوو مەلامستەفا هەموو کارەکانی دابووەدەست شای ئێران،وەهەروەها بەبۆنەی هەبوونی سیاسەتی زاڵی خێڵەکیبەسەر شۆڕشدا، کەلەلایەن بنەماڵەی بارزانیەوەرەفتاری پێدەکرا،بەفەرمانی شا و بڕیاری مەلامستەفا .ئاشبەتاڵ بە شۆڕشی ئەیلول کرا.ئەو رێککەوتنەی نێوان شای ئێران و سەدام حسین بەئاگاداریCIA و حکومەتی ئیسرائیل و تورکیا جێبەجێ کرا.

2. سەرۆک ئاپۆ ئەدەبوو بارەگای سەرەکی خۆی لەسوریا کەدەوڵەتێکی داگیرکاری کوردستانە دابنێت . ئاکامەکەی ئەوەبوو بەپیلانی دارێژراوی نێوان ئامریکا و ئیسرائیل و تورک و شەخسی حوسنی موبارەک،ئەوەرویدا کەرویدا و لەسەراسەری کوردستانی گەورەماتەمینی گێردرا.

سەرۆک ئەنجومەن وەزیرانی تورکیا بەرێز ئەجاوید لەکۆبوونەوەیێکی رۆژنامەگەری وتی: ئەمریکا عەبدوڵڵا ئۆجەلانی تەسلیمی تورکیا کرد.

راپەرینەمەزنەکەی ساڵی 1991

لەشارۆچکەی رانیەدەستی پێکرد جەماوەری بەشەرەفی کوردستانی باشور دەوری سەرەکییان هەبوو لەم راپەرینەدا.هەر وەها بەبەشداری 92% لەجاش و فەوجی خەفیفەی چەکدارەکانی رژێمی سەدام حسین و بەهاوکاری و سەرپەرشتی پارتەسیاسیەکانی کوردستان(یەکێتی نیشتمانی،پارتی دیموکراتی کوردستان،زەحمەتکێشان و سوسیالیست)

بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی بەشەمەندەفەری کۆماری ئیسلامی ئێران و کۆماری تورکیا گەڕانەوەکوردستانی باشور و دەسەڵات کەوتەدەستیان.

بەهۆی توندی ململانێکەوچەندین فاکتەری دیکەکەهەر یەکەلەکۆماری ئیسلامی ئیران و حکومەتی تورکیا دەورێکی سەرەکیان هەبوو بۆ ئەوەی راپەرینەکە لە بەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکێشنە ژێر دەستی بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی،لەبەر ئەوەی کارەکانیان یەکەیەکەبۆ ئەنجام بدەن.

رۆژگار بۆ کورد بەراشکاوی و بەتەواوەتی ئاشکرا و روون بوەوەکەئەو دوو سەرکردەرێزدارانەتاڵەبانی و بارزانی چەندەها گرێبەستیان لەگەڵ تورکی رەگەز پەرست وناخوێندەوێزەر رەشەکانی دژی ئازادی و دیمکراسی ئێران ئیمزا کردوەو گفتیان داوەبۆ ئەوەی کەلەخزمەتیانا بن.

تاوانەکانی ئەو دوو بەرێزە"تاڵەبانی و بارزانی " کەدژی کورد لەساڵەکانی 1992 تا 2003 ئەنجامیان داوە ئەوەندەزۆروحەساس و ترسناک و گرینگن، بەسەدها کتێب تۆمار ناکرێت و تەواوی نابێت.

وا لەخوارەوە ئاماژەبەچەند تاوانێکیان دەدەم کەبەپیلانێکی دارێژراوی "میت"ی تورکیا و ئیتلاعاتی ئێران ئامادەکرابوون.

بەرێزان بارزانی وتاڵەبانی دەقی ئەو داواکارییانەی کەلەگرێبەستەکاندا هاتبوو ،وەئەمانیش ئیمزایان کردبوو،جێبەجێیان کرد.

1. دربارەی چۆنیەتی پاراستنی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا لەرێگای لاوازکردن و بەچۆکدا داهێنانی گەریلا و پێشمەرگەکان.

بەپێی ئەو رێکەوتنەی کەلەنێوان "میت"ی تورکی وئیتلاعاتی ئێران و شەخسی بارزانی و تاڵەبانیدا،ئەو رێزدارانەبەرپرسن لەپاراستنی خاکی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا لەناوەوە لەسنورەکانی هەرێمی کوردستان لەهەموو هێرشێکی تیرۆریستانن.بەهیچ جۆرێک نابێت گەریلاکان و پێشمەرگەکان هیچ جموجوڵێکی سیاسی و پارتیزانیان هەبێت بۆ سەر خاکی ئێران و تورکیا.بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پرۆژەیەپیلانێکی ستراتیژیک دادەرێژن و پەیامێک ئامادەدەکەن و لەرێگای ئەوکەناڵانەی خوارەوەدەست بەکار دەکەن.

یەکەم جار راستەوخۆ پێوەندی بەپارتی کرێکارانی کوردستان و حیزبی دینکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و یەکێتی شۆرشگێرانی کوردستانەوەدەکەن و وتووێژیان لەگەڵدا دەکەن،

هەرێمی کوردستان پێویستی بەیارمەتی ئێوەهەیەلەهەموو بوارێکەوە،پاراستن،چاودێری و چەسپاندنی ئەرکێکی سەرەکیەکەوتوەتەسەرشانی هەریەکێک لەئێوەلەپێناو مانەوەو سەرکەوتنی .

هەرێمی کوردستان هەرچەندەئەمڕۆ سەلوایەبەڵام ئەوایەکەبۆ کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەبۆ ئیستا و دوارۆژ.گەورەترین کێشەی هەرێمی کوردستان ئەمڕۆ ئەوەیەکەهیچ رێگایەکی بۆ پێوەندی راستەو خۆ لەگەڵ دونیای دەرەوەنیە، هەرێم لەلایەن هەر چوار دەوڵەتەئیقلیمیەکانەوەگەمارۆ دراوە،نەرێگای ئاسمانی، نە زەوینی و نەدەریاییمان هەیە.

لەسەر بریاری ئێمەبەرێوەبەری مەکتەبی پارتی و یەکێتی لەگەڵ لێپرسراوانی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا چەندەها کۆبوونەوەیان ئەنجام داوەو هەوڵێکی زۆریان داوەکەرێگامان بۆ هاسان بکەن تاکو بەسەربەستی راستەو خۆ پێوەندی بەدەوڵەتانی بیانیوەبکەین.بەرێز سەفین دزەیی هەموو توانا و رێگایەکی گرتوەتەبەر لەپێناو چارەسەر کردنی ئەو پرۆژەیە.

لێپرسراوانی حکومەتی تورکیا ئاگاداری رێبەری مەکتەبی "پارتی"یان کردۆتەوە و ئەمەش دەقی پەیامەکەی تورکیایە:
مەرجەگەریلاکان هەموو جموجۆڵی پارتیزانی راگرن لەناوەوەو دەرەوەی سنوری هەرێمی کوردستان.حکومەتی تورکیا یەکسەر رێگای زەوی و ئاسمانی سانایی دەکات بۆ هاتو چۆی هەرێم،هەروەها لێپرسراوانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش هەمان شێوەوەڵام لەرێگای رێبەرانی نوسینگەی پارتی و یەکێتی لەتاران (تەهران) بە حکومەتی هەرێم دەدەنەوە.

ئەم کێشەیەرووبەرووی هەرێمی کوردستان بوەتەوەو چارەسەرەکردنی کەوتوەتەسەرشانی پارتەسیاسیەکانی کوردستانی باکور و رۆژهەڵات و رۆژ ئاوا. حکومەتی هەرێم ئیمڕۆ ساوایەو بەڵام لەماوەیەکی نزیکدا بەهێز و توانا دەبێت،لەپێناو بەرژەوەندی گشتی گەلی کورد داواتان لێدەکەین بۆ ماوەیەکی کورت هەموو جموجۆڵ و چالاکیێکی پارتیزانی گەریلا و پێشمەرگەکان لەدژی تورکیا و ئێران لەناوەوەو دەرەوەی سەر سنوری هەرێمی کوردستان رابگرن .هەرچەند داواکەی دوژمنانی کوردستان زۆر سەختەبەڵام کاتییە.

کۆبوونەوەکەچەند سەعاتێک دەخایێنێ ،پارتەسیاسیەکانی ئامادەبوو لەوەڵامدا هەر یەکەدەڵێن ئێمەدەبێت لەسەر ئەم داوای ئێوکۆبونەوەی خۆمان بکەین و پاشان وەڵامتان ئاراستەدەکەین.بەپێی ئەو بڕیارەچۆن بێت ئاگادارتان دەکەینەوە.

پارتی کرێکارانی کوردستان :

سەرۆک ئاپۆ پێشنیارەکەی بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی پەسەند نەکرد و رەتی کردەوە،چونکی خزمەت بەنوزی کورد ناکات.

بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی لەساڵی 1992 لەسەر داواکردنی حکومەتی تورکیا هێزێکی گەورەیان لەپێشمەرگەکانی پارتی و یەکێتی کۆ کردەوەو هێرشێکی فراوانیان بردەسەر بارەگاکانی گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە" شاخی قەندیلی سێ سوچکە" کەدوای شەڕێکی دژوار و رووبەڕوو ،کوردیان بەکورد بەکوشت دا لەپێناو سەروەت و سامان و رەزامەندی ژنراڵەکانی تورکی کۆنەپەرست و نژادپەرست و دژی ئازادی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ. خۆشبەختانە لەسایەی خودای مەزن ،بەرێزان تاڵەبانی و بارزانی سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا و تا کوردستان بەیەکجاری بکەوێتەژێرچنگیان تاکو بازرگانی پێوەبکەن.

سەرۆکی ولایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا لە10.2007 لەواشنگتون کۆبوونەوە،بوش بڕیاری دا (ئەمریکا و تورکیا و عێراق ) دژی پارتی کرێکارانی کوردستان شەڕ بکەن بۆ لەناوبردنیان.

بەئاشکرا بوش و ئەردوغان و نوری مالکی داوایان لەتاڵەبانی وبارزانی و نیچیرڤان کرد کەپێشمەرگەهەرێمی کوردستان بەشداری ئەو شەڕەبکات بۆ پاککردنەوەی ناوچەشاخاویەکان لەگەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و لەناوبردنیان.

بەرێزان بارزانی و تاڵەبانی ناچار بوون دوای پازدەساڵ راستیەکان ئاشکرا بکەن و دان بەوەدا بنێن کەسی هەزار پێشمەرگەیان بەکوشتن داوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران:

بەبڕیاری رێبەرایەتی سەرۆک کۆماری کوردستان"شەهید قازی موحەمەد" لەساڵی 1945 ئەم پارتەسیاسیەدامەزرا.

پێویستەئاماژە بەم راستیە بکرێ کەهەموو حزبەسیاسیەکانی هەرچوار پارچەکەی کوردستان پاش کۆماری کوردستان دامەزراون.

کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا پەنایان بۆ شەخسی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی برد بۆلەناوبردنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی کرێکارانی کوردستان.دوای تیرۆر کردنی دوکتور شەرەفکەندی لەساڵی 1992 ئەم پیلانەدەستی پێکرد.دەزگای زانیاری یەکێتی و دەزگای پاراستنی پارتی بەهاوکاری ئیتلاعاتی ئێران و "میت"ی تورکیا هەموو رێگایەکیان گرتەبەر بۆ لەناو بردنی پارتی کرێکارانی کوردستان و حیزبی دیموکراتی کردستانی ئێران.لەهەر چوار لاوە"ئێران،تورکیا،بارزانی،تاڵەبانی" هەوڵیان دا ،بەتایبەتی تاڵەبانی و پارتەسیاسیەکەی دەوری سەرەکییان هەبوو بەرامبەر حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.حدکا لەسەربڕیاری مامەگیان ئەساڵی

1988لەناوچەی بۆلی جێگیربوون،لەساڵی 1992 بەپیلانی مامەگیان و گوشاری کۆماری ئیسلای ئێران دەرکران.لەساڵی 1992 لەکۆیێ جێگیربوون .ساڵی 1996 بەئاگاداری و فەرمانی مامەگیان سوپای پاسدارانی ئێران هێرسیان هێنایەسەر رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەشارۆچکەی کۆیە.

لەساڵی 1992 تاکو ساڵی 1996 ژمارەی ئەوپێشمەرگانەی کەشەهید کراون 270 کەسن. لەکادر و پێشمەرگەو ئەندام و لایەنگرانی حیزب 200 کەس تیرور کراون .حەوت پێشمەرگەلەسەر سنوری هەڵەبجەمەلا عەلی خۆفرۆش و سیخوری ئێران، دەستگیریان دەکات وتەسلیم بەئیتلاعاتی ئێرانیان دەکات. یەکێکیان لەدەست پاسدارەکان رادەکات و دەگاتەوەناو حیزب .

بەرێزان تاڵەبانی و بارزانی رێگای جێبەجێ کردنی دەقی پرۆگرام و پلانی ستراتیژی کۆماری ئیسلامی ئێران و تورکیایان گرتەبەر و بۆیان جێبەجێکردن. ئەوەبوو کەئەوەرویدا کەئەدەبوو رووبدات.حیزبی دیموکراتی ئێرانیان کێشایەحاڵەتی ئەسلی و هەموو ویستەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیان راکێشا و چۆکیان بەحیزب دادا و ئێستاش هەر درێژەی هەیە..

ئیمرۆکەکەبرواری 2008/11/28 کەئاماژەبەو باروئۆخەناهەموارەدەدەم،خۆشبەختانەو پیرۆز بێت ئەمرۆ بیستەمین ساڵیادی دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستانە.درێژەی هەیە...

ئەم پرسیارەئەمرۆ دێتەپێش کەکێ بەرپرسەلەلەتکردنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان ؟ تەنیا تاڵەبانی و بارزانی؟ لەوەڵامدا دەبێ بڵێین نا،بەڵکو چەند دەوڵەتانێک دەستیان تێدایە. درێژەی هەیە...

بەرێزان تاڵەبانی و بنەماڵەی بارزانی چیرۆکێکی رەشیان بۆخۆیان تۆمار کرد.مێژوو شەرم لەکەس ناکات و ئەم خەیانەتەیان هەرگیز ناسڕێتەوە.

خوشک و برایانی ئازیزم:

بەردەوامم لەروونکردنەوەو شیکردنەوەی ئەوگرێبەستانەی کەلەنێوان شەخسی تاڵەبانی و بارزانی ئیمزا کرا لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا، کەلەسەرەتای راپەرینەکەی ساڵی 1991 ئەم خاڵانەجێبەجێ بکەن دەربارەی هاتوچۆ کردن:

فەرمانەپارێزگاری ئەمنی و سلامەتی لێپرسراوان و کارمەندان و چاودێریان و یارمەتی دانیان لەهاتن و گەڕانەوەیان ،ئێوەبەرپرسی ژیانیاتن و هەموو جۆرەکۆمەکێکیان ناراستەدەکەن،هەر وەها بەرامبەر هاولاتیان ،ئێوەبەرپرسن لەهاتنی هەر هاولاتیێک بۆ ناو خاکی ئێران و تورکیا.

بۆ نمونە: لێپرسراوێکی کۆماری ئیسلامی ئێران یان لێپرسراوێکی حکومەتی تورکیا یان کارمەندێکی ئیتلاعاتی ئێران یان "میت"ی تورکی چەند سانایەسەفەر بکات لەترانەوەبۆ تەورێز یان لەئەنکەرەوەبۆ دیاربەکر،هەر بەشێوەش سانایی بوو بۆ هەموو کارمەندێکی حکومەتی ئێران یان تورک سەفەر بکات بۆ کوردستانی باشور، بەپێی پرۆگرامی دارێژراوی خۆی جموجۆڵ بکات یا دەزگای سیخوری دابنێت لەهەرێمی کوردستان.

ناوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان:

فەرمانە هەموو پرۆژەیەکی گەورەیان بچوک ئەبێت بدرێتە کۆمپانیەکانی تورکیا یان ئێران،بالێندەرە کەبەرپرسە لەئەنجامدانی ئەو پرۆژەیە،مەرجەهەموو جۆرەیارمەتێکی دارائی و ئابوری ناراستەبکەن.

بۆ نمونە: چەند جار رێزداران تاڵەبانی و بارزانی و ئێچیرڤان پێوەندیان بەکومپانیە کوردەکان کردوە کەلەپێناو بەرژەوەندی گشتی ئەو پرۆژەیەی وەرتان گرتوەوە تەسلیمیەو کومپانیە تورکیە یان ئێرانیەی بکەن.

ئەو بەرێزانە رێگا گرن لەوەی کوردێک ببێتە خاوەن سەروەت سامانێک یان ببێتە ملیاردرێک.

بازرگانی: بەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی لەڕێگای چەند کەناڵێکەوەئاگاداری هاوڵاتیانیان کردەوەکەبەهۆی ئەوبارودۆخە ناهەموارە کە دیکتاتۆر سەدام حسین ئابلوقەی خستوەتە سەرمان، کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا بەدەنگیانەوە هاتن وبڕیاریان دا لەپێناو بەرژەوەندی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان سنوریان بۆ چوون و گەڕانەوەی هاوڵاتیان، شەو و رۆژ کراوەبێت بۆ کڕینو فرۆشتن،هێنانی خۆراک،هەموو جۆرەشتومەکێک کەخانەوادەپێویستی پێ بێت.هەر وەها سەردانی پزیشک و بیمارستان و سەردانی شەخسی و گەشت و گوزار.

ئامۆژگاری بۆ ئاسایشی سلێمانی و هەولێر ،فەرمانەبارەمەتی هەموو ئەو بازرگانانەی کەهاتوچۆی هەرێمی کوردستان دەکەن بۆ کار و باری بازرگانی رێگایان بۆ ئاسانی بکەن و رێزیان لێبگرن.

سەرەتا هاوڵاتیان بەگشتی بەو هەڵوێستی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا خۆشحاڵ بوون کەبەدەنگی ڕێزداران بارزانی و تاڵەبانیەوە هاتن. بەڵام زۆر زوو لای هاوڵاتیان بەگشتی ئاشکرا بوو، ئەوەی دەزگای "میت"ی تورکیا و ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلای ئێران لەبەشی هەرەزۆری شارو شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان بنکەی سیخوڕیان دامەزراندوە. ئەو هەڵوێستەنزمەنامرۆڤانەی دژی گەلی کورد ئەنجامیاندا ژەهرێکیان چاند کەلەئەنفال و کیمیابارانەکەی هەڵەبجەو زیندەبەچاڵەکان ترسناکترە،کەبوو بەهۆی ئەوەی خەڵکانێکی زۆر کەلەژمارەنایێت،توشی مادەی بێهۆشی هاتوون.

تلیاک و هیرۆیین و مادەی بێهۆشی:

کێشان و بڵاوکردنەوەی لەسەرانسەری جیهاندا قەدەغەیەو لەهەندێ وڵات حوکمی لەسێدارەدانی لەسەرە، یەکێک لەو وڵاتانەکۆماری ئیسلامی ئێرانەو ساڵانەچەندەها هاوڵاتی رەگەز فارس لەسێدارەدەدرێن.

کۆماری ئیسلامی ئێران بەنهێنی مادەیبێهۆشی لەرێگای دەزگای تایبەتی لەتاران بڵاوی دەکاتەوە،لەرێگای چەند کەناڵێکی بازرگانی رەوانەی هەرێمی کوردستانی دەکات بەخۆرایی،بەداخێکی پڕوارەوەخەڵکانی کوردی سیخوڕ و چڵکاوخۆر و نەفس نزم لەپێناوی پارەدژایەتی گەلەکەی خۆیان دەکەن.

ئاسایشی سلێمانی و هەولێر بەفەرمانی خۆیان هەستاون و دەریغی ناکەن ، چەندەها خەڵکیان دەستگیر کردوەو رەوانەی دادگا کراون و سزاش دراون و خراونەتە بەندیخانە.

ڕێزداران بارزانی و تاڵەبانی بەنهێنی فەرمانیان دەرکردوەنابێت بەهیچ جۆرێک ناوی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا بێت،کە ئەو دوو دەوڵەتە ئاگاداری تەواویان هەیە لە ناردنی مادە بێهۆش کەرەکان.

بۆ نمونە: لەمانگی چواری ساڵی 2007 لەگەڵ هاوڵاتیێکی نیشتمان پەروەر سیاسەتمەدار بەناوی (...) گفتوگۆمان دەکرد دەربارەی مادەی بێهۆشی ترسناکە بەم شێوەیەبڵاوبوەتەوە لە کوردستان،ئەو بەڕێزەپرسیارێکی ئاراستەکردم.

وتی: لەپێناو بەرژەوەندی گشتی لێرەلە سوید روو بەڕوو ئاگاداری ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانم کردەوە کە پۆلیسی سویدی ئامادەن لەسەر حسابی تایبەتی خۆیان سەفەر بکەن بۆ کوردستان بۆ ئەوەی دەست بکەن بەلێکۆڵینەوە تاکو دەگەنە سەرچاوەی ئاراستەکردنی مادەی بێهۆشی بۆ هەرێمی کوردستان. بەڵام هیچ وەڵامێکیان نەداوەتەوە.تۆ بڵێی هۆی چیە وەڵامم نادەنەوە؟

لەوەڵامدا وتم: بەپێی ئاگاداری خۆم تەنیا ئاسایشی گشتی سلێمانی گەندەڵ تێدا نییە،ژیانی هاوڵاتیان پارێزراوەو ئەمن و ئاسایش بەرقەرارە،ڕێزداران عەمید حەسەن نوری و کارمەندان بەگشتی لەخزمەتی گەلی کوردن بەبێ جیاوازی. بەڕێز عەمید حەسەن نوری ئاگاداری و دیکومێنتی تەواوی هەیە کە سەرچاوەی مادەی بێهۆشی (تلیاک و هێرۆیین و ..) کە ئاراستەی هەرێمی کوردستان دەکرێت ،کۆماری نامبارەکی ئیسلامییە لە ئێران.

ئەم زانیارییەش هەیە کە ئەو تاوانبارانەی بەناوی بازرگانی هاتوچۆی کوردستان دەکەن ناسراون و لەدەزگای میتی تورک و ئیتلاعاتی ئێران کارمەندن ولێرەش (لەهەرێم) بنکەی سیخوڕیان داناوە.لەناو ئەم تاوانبارانەدا کەسانێک هەن کە بە هەزاران کوردیان تیرۆر کردوە لە کوردستانی باکور و کوردستانی رۆژهەڵات.

بەرێزانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەر هەموویان ئاگاداری تەواویانهەیەو لەوەش زیاتریان لایە.بەڵام هیچ یەکێکیان ئەو دەسەڵاتەی نیەوەکو من بۆت شی بکاتەوە،بۆیەتا ئێستاش هیچ وەڵامێک دەربارەی ئامادەبوونی پۆلیسی سوید بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی هاتنی مادەبێهۆشیەکان لەلایەن ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیەوەنەگەیشتوەتەدەستت.چون ئەوان ناوێرن و بۆیان نیەئەم کارەبکەن.

یەکێک لەو هەڤاڵانەی (...) کە لە بەندیخانەی ئەبو غەریب لەساڵی 1987 بەیەکەوە بەند بوین پێوەندی پێوەکردم و داوای کتێبەکانی کرد و چەند پرسیارێکی ئاراستەکردم .گوتی ئیستا بەتەنها نیم کاتێکمان بۆ دیاری بکەسەردانت دەکەین.

لەبرواری 2008/8/17 چوار هەڤاڵ سەردانی کردم،خۆشحال بووم بەدیداری ئەو رێزدارانەو ئاشنا بوونم لەگەڵ ئەو نیشتمان پەروەرانە.بۆ ئەوەی دانیشتنەکەخۆش کەمبەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێکم هەبوو بێت بەپێکەنینەوەگوتم:( دوو خەڵکی باکور و یەکێکیان خەڵکی رۆژهەڵات و یەکێکیان رۆژ ئاوایی و ئەویتریان باشوری)ئێوەنوێنەری هەرچوار پارچەداگیرکراوەکەی کوردستانن.هاتونەتەماڵی بەندەکوردستانی گەورەلێرەدادەزرێنن.تکاتان لێدەکەم ئەو بارودۆخەی هاتوەتەئاراوەتەنیا لە بەرژەوەندی بنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی دایە، لێیان تێک مەدەن.ناوچەدابڕاوەکانی کەرکوک و خانەقین و شێخان کێشەیە.سلێمانی و هەولێر و دهۆک بەسە... رێگایان پێ نەدام کەبەردەوام بم لەقسەکانم.

هەر پێنجیان یەکەیەکەدەربارەی بارودۆخی کورد بەگشتی و هەرێمی کوردستان بەتایبەتی هەڵسەنگاندنیان کرد و رەخنەیەکی زۆریان لەبەندەگرت،ترسناکی و تاوانیان خستەپاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هێرش و تاوانێکی گەورەیان خستەسەر کەسایەتی و سەرۆک هۆزەکان،بەتایبەتی سەردار جاف و هۆزی جاف و محسن دزەیی و سەفین دزەیی و هۆزی دزەیی.

چاوەڕوان بووم هەتاکو بەتەواوەتی کۆتاییان بەوتووێژەکەیان هێنا.وتم ئەوەدوو سەعات زیاترە روو بەڕووی بەندە قسە دەکەن و منیش گوێم لەئێوەی بەرێز گرتوە، هەڵوێست و بۆچونی من جیاوازی هەیەلەنوسینی کتێب،بیرەوەریەکانی خۆم چیم دیبێت و چیم بەسەرهاتبێت،ئەوەی شەخسی خۆم بەشداریم تێدا کردوەو ئاگادارم،من شاهید حاڵی مێژوو و کلتوری کوردم ،شەرتەئاماژەی پێ بدەم،ئینجا رێگای چارسەری بۆ دەدۆزمەوەو دوژمنانی کورد ئاشکرا دەکەم.من چوار کتێبم بڵاو کردوەتەوە،هەتاکو ئێستا هیچ لایەنێک وەڵامی نەداوەتەوە.بەڵام بنەماڵەی بارزانی هەتاکو ئێستا چوار جار هەوڵی تیرور کردنیان داوم.ئایا هۆی چیەکەئەم بنەماڵەخێڵەکیەئەوەندەلەبەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان دەترسن و ئێستاش هەر لەهەوڵی ئەوەدان بمکوژن؟ چونکی من شاهیدی حاڵ و زیندوی مێژووم.

هەڤاڵانی بەرێز ئەگەر بەڵێنم پێدەدەن قسەکانمان ئەمانەتەو لەم ژورەدەرناچێت.بەراشکاوی ئەوەی ئێوەمەبەستانەبۆتان شی دەکەمەوە،هەڵوێست و بۆچون و تاوانەکانتان زۆری هەڵەبوو،ئەگەر دەتانەوێت بۆتان راست دەکەمەوە.وەڵامتان چیە؟

هەر هەموویان سوپاسیان کردم و گشتیان دا بەهیچ جۆرێک لەلای هیچ هاوڵاتیێک باس لەم کۆبوونەوەنەکەن و ....

وتم دەربارەی رەخنەکانتان بەرانبەر بەندە: بەتەنهام،بەژمارەزیاد لەکەس و کارم لەئەروپا ژیان دەبەنەسەر بەڵام هیچیان ئامادەنین یارمەتیم بدەن،رەخنەشم لێدەگرن کەخەریکی نوسینی کتێبم.هەروەها هەموو کەس و کارم لەکوردستان بەوە(نوسین)رازی نین.

لەگەڵ ئەوەشدا ئینشاءاللەساڵی 2009 هەر شەش کتێبەکەم لەجیهاند ا دەچنەکتێبخانەکان و دەست خوێنەری بەرێز دەکەوێت.بەرگی 4/3/2/1 رێکخراوەتەوەو پێنجەکەی ئامادەیە.ئینجا سەرەخاڵەگرینگەکانی هەر چوار کتێبەکەکورت دەکەمەوەلەلاپەڕەوەکورتی دەکەمەوەبۆ 200 لاپەڕەو وەریدەگێڕمەوەسەر زمانی بیانی.

بەرگی پێنجەم ئامادەیەو وەڵامی بیرەوەریەکانی کاک مەسعود بارزانیم داوەتەوەکە% راست نیەو روونمکردوەتەوەبۆ جەماوەر. لەکتێبی شەشەمدا باس لەهەڵوێستی بەرێزان تاڵەبانی و بارزانی بەرامبەر بڕیاریەکەی بوش بۆ لەناو بردنی پارتی کرێکارانی کوردستان و گەش بینیەکانیان دەکەم کەلەمانگی یازدەی ساڵی 2007 دەستم بەتۆمار کردنی کردوە،هەروەها نیهێنیەکانی بنەماڵەی بارزانی و تاڵەبانی ئاشکرا و روون دەکەمەوە.

بەرانبەر رەخنەتان بەرانبەر پارتی دیموکراتی کوردستان،لەلەکتێبەکانمدا بەراشکاوی روونم کردوەتەوەکەپارتی و یەکێتی لەسەرەتاوەچۆن دامەزان، چۆن دوای روخانی دیکتاتور سەدام حسین بەپلەی 180 دەرەجەگۆران بەسەر کوردستانی باشوردا هات.هەموو هاوڵاتییەک مافی ئامۆژگاری هەیە،بەڵام رەخنەکانتان جێی جۆی نەبوو،هەر وەکو چۆن دەریا پیس نابێت،حیزب و هۆز هەرگیز پیس نابێت.

پارتی و یەکێتی بەشراکەت ئیدارەی هەرێمی کوردستانیان گرتەدەست. شک و گومان لەوەدا نیە،کارمەندان بەپێی توانا خزمەتی زۆریان بەهاوڵاتیان کردوە. ئەو گەندەڵیەش کەئێستا هەموو وڵاتی گرتوەو بوەتەقسەی رۆژ و هەمووڵایەک باسی لێدەکەن،سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوەبۆ بەرێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی.بەهۆی خۆیەکەمزانین و حساب بۆ خەڵک نەکردنیان ،کەوتونەتەژێر گوشاری دوژمنان و خۆیان بەئێرانیگەری و عێراقچیەتی و تورکمانییەتەوەگرێداوەو مەسەلەی کوردیان لەبەرچاوو نەماوە، درێژەی هەیە..

هۆزی دزەایی: یەکێکن لەو هۆزەکوردبەروەرانەی کەلەشۆڕشەکانی کورد بەشدارییان کردوەوچەندەها شەهیدیان داوەو رۆڵی گەورەیان لەخەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد هەبووە.

هۆی سەرەکی لەبەرێوەبەرایەتی هۆزی دزەیی بەگشتی کەتوانی هەمو چینەکان یەک بخات،دەگەڕێتەوەبۆ کەسایەتی مەزنی نیشتمان پەروەرو شۆڕشگێڕ و سیاسەتمەدار شەخسی ئەحمەد حەمەئەمین ئاغای دزەیی.

ئەنوەر عەزیز دزەیی: کەسایەتێیکی ناسراوی بەگزادەی دزەیی مامۆستا ئەنوەر دزەیی پارێزەری رۆژنامەی خەبات زمان حاڵی پارتی دیموکراتی کردستان ، لەساڵی 1961 کاک ئەنوەر و بەندەو پەنجا کادر و ئەندام و پاڵێراوی پارتی لەبەندیخانەی (الئەنبار قسم المحجر) بۆ ماوەی 45 رۆژ دەست بەسەر بووین.مامۆستا ئەنوەر رۆڵێکی ئازا و خۆڕاگر و شەفاف بوو ،دەستی یارمەتی درێژدەکرد بۆ هەموو ئەو هەڤاڵانەی کەبنەماڵەکانیان دوور بوون و پێویستیان بەیارمەتی هەبوو.

بنەماڵەی سەیدی گردەعازەبان سەر بەناحیەی گوشتیەی هەولێر:ئەم بنەماڵەرۆشنبیر و نیشتمان پەروەر و شۆڕشگێڕ و سیاسەتمەدارەلەمێژووی بزوتنەوەی کورددا رۆڵێکی جوامێرانەیان هەبووەو لەشۆڕشی ئەیلولی 1961 دا لەرێزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان چەندەها شەهیدیان داوە.

بۆ ئاگاداری

1. بەفەرماتی بنەماڵەی بارزانی خەڵکانێکیان لێ ترۆر کراوەو ئێستاش هەوڵ بۆ لەناوبردنیان ئەدەن.
2. بەرێز هەڤاڵ سەید قادر یەکێک لەو پەنجا کەسەی کادرەکانی پارتی لەبەندیخانەی (الئنبار قسم الحجر) بوو کەلەسەرەوەئاماژەم پێ داوە.

خدر ئەحمەد پاشای دزەیی: کەسایەتی بەگزادەی ناسراو لەسەرانسەری عێراق و بەتایبەتی لەکوردستانی باشور،لەکاتی پاشاییدا توانا و بەدەسەڵات بوو لەناو حکومەت .ئەو توانایەبەکار دەهێنا بۆ ئەوەی بەبێ جیاوازی لەخزمەت بەهاوڵاتیاندا بێت .دەورێکی هەبوو بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان بۆ لاوان تا بچن لەوێ بخوێنن و لەداهاتودا بتوانن پلەو پایەی باش وەربگرن.خەڵکانێکی زۆری لەنوسینگەکانی دەوڵەت دامەزراندوە.

ئەم بەرێزەبەوەناسراو بوو کەهەڵوێست و بۆچونی خۆی بەراشکاوی و ئاشکرا لەمەڕ شتەکان دەر دەبڕێت و گفت و گۆی لەسەر دەکات. بۆ نمونە: لەساڵی 1960 رێزدار مەلامستەفا بارزانی بەجەنابی خدر ئاغا دەڵێت کەپێم خۆشەلەگەڕان سەردانێکدا کەلەگەڵ سەرۆک هۆزەکان دەبێت تۆم لەگەڵدا بێت.بۆ ئەم کارەم مەبەستێکی تایبەتم هەیەکەبۆت شی دەکەمەوە،بەڵام لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆک هۆزەکان بەم شێوەراشکاوانەئاگاداریان ناکەم.

لەکۆبوونەوەیێک بارزانی وتارێک ئاراستەی ئامادەبووان دەکات تا سەرۆک هۆزەکان هەرهەموویان بەڵێن و گفت دەدەن بەبارزانی کەئامادەن سەر و ماڵ بەخت بکەن لەپێناوی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی.

خدر ئاغا دزەیی روو دەکاتەبارزانی : لوتفت بوو کەبۆ ئەم گەڕانەئاگادارت کردم. سەرۆک هۆزەکانیش وەڵامەکەیان گەش بین بوو،بەڵام باوەر بەهیچ یەکێک لەو سەرۆک هۆزانەی کەئامادەن باوەر مەکە.چون ئەگەر رۆژێ لەرۆژان

بارودۆخەکەلەنێوان کورد و حکومەت گەیشتەئەوەی کەشەڕ دەستی پێکرد،ئەم سەرۆک هۆزانەچەکی تاوانباری هەڵدەگرن.تەمەنی بەندەو تەندروستیم باش نیەکەبەڵێن و گفتت پێ بدەم کەچەک هەڵدەگرم و شان بەشانی جەنابتان دژی حکومەت رادەوەستم.

لەساڵی 1962 قسەکەی خدر ئاغا هاتەئارا و هەموو سەرۆک هۆزەکان چەکی تاوانیان هەڵگرت.

ساڵی 1962 سەرۆک کۆماری دیکتاتۆری عێراق عبدالسلام عارف سەردانی هەولێر دەکات و دیدارێکی بەڕێز خدر ئاغا دەکات و دەڵێت:هاتتم بۆ هەولێر بەمەبەستی چاوپێکەوتنی تۆ بووەدەر بارەی بارودۆخی ئێستای شماڵی عێراق کەکۆمەکی حکومەت بکەیت.چەک هەڵگریت و شان بەشانی سوپای عێراق دژی چەتەکان شەڕ بکەیت،هەموو سەرۆک هۆزەکان ئامادەن چەک هەڵگرن و دژی مەلا مستەفا بارزانی شەڕ بکەن و تەنیا مەرجیان هاوکاری و چەک هەڵگرتنی تۆیە.

بەڕێز خدر ئاغا لە وەڵامدا دەڵێت تەمەنی بەندەو بارودۆخەی ئێستا لەبار نیەتاکو بتوانم چەک هەڵگرم.

جوگرافیای ناوچەی دزەیی شەری پارتیزانی لێ ناکرێت، زۆر زەحمەتە.بەڵام بەهۆی بەرز بوونی بیری نەتەوەیی دانیشتوانی ناوچەکە.ئەوەندەبەتوانا و خۆ راگرن کەرووبەڕووی حکومەتە عەرەبەیەک لەدوای یەکەکانی عێراق راوەستاون و دەشتەکەی دزەییان کردوەتە قەندیل لە روی دوژمنانددا.

ئەحمەدی حەمەئەمین ئاغای دزەیی: بەداخەوەکەسایەتێکی کەی وەکو ئەم زاتەلەهەموو رووێکەوەمەزنە،لەدوای تەواف کردنی هەڵنەکەوتوەو تاکو بتوانێ جێگای کاک ئەحمەد بگرێتەوەو سەرۆکایەتی هۆزی دزەیی بکات و لەناو گەلی کورد بەشێوەی کاک ئەحمەد دیار بێت.

لێرەوەساردی دەستی پێکرد لەنێوان بارزانی و دزەیی. لەساڵی 1963 کەدوو بەرەکی لەنێوان سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان هاتەئاراوە.

بەندەلەکتێبەکانمدا "کورد دوژمنی خۆت بناسە" بەراشکاوی روونمکردوەتەوەکەبەدەسیسەو پیلانی حکومەتی دیکتاور عەبدالسلام عارف ئەم دوو بەرەکیەدروست کرا و سەرکەوتن چونکی تاوانبار دەفی پیلانەکەی لەپێناو بەرژەوەندی بنەماڵەی بارزانی بۆ ئەوەی تەواەدەست بەسەر شۆرشی ئەیلولی 1961دا بگرێت،جێبەجێ کرد.

خەڵکانێکی زۆر لەسەرۆک هۆزو کەسایەتیەناسراوەکانی کورد هەوڵیکی زۆریان دا،یەکێک لەخەڵکانەسەرۆکی هۆزی دزەیی کاک ئەحمەد حەمەئەمین ئاغای دزەیی بوو.دوای هەوڵدانێکی ئێجگار زۆر لەنێوان سەرۆکی پارتی،مەلامستەفا بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد،دەگاتەئەو باوەڕەکەشەخسی بارزانی دەیەوێت بەتەواوەتی دەست بەسەر شۆرشی ئەیلولدا بگرێت لەپێناو بەرژەوەندی بنەماڵەی بارزانی و شک دەکات کەحکومەتی عبدالسلام عارف دەستی تێدا هەیە.

کاک ئەحەد لەپێناو چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەکەرووبەرووی کورد بووەتەوەسەفەری بارزان دەکات،بۆ ئەوەی سەردانی شێخ ئەحمەد بارزانی،براگەورەی مەلا مستەفا بارزانی و سەرۆکی هۆزی بارزان بکات.

لەگەڵ جەنابی شێخ ئەحمەد بارزانی کۆدەبێتەوەو بەدوور و درێژی هەموو شتێکی بۆ روون دەکاتەوەو دەڵێت کەئەم کێشەیەئەوەندەقەوارەبووەو دەستی بیانی هاتوەتەناوی کەتەنها بەجەنابتان چارەسەر دەکرێت.

هاتووم بۆ خزمەت جەنابتان سکاڵا و شکاتی شەخسی مەلا مستەفا بارزانی بکەم کەدەستی گەورەی هەیەلەو دوو بەرەکی و ناکۆکیەی کەروو بەرووی گەلی کورد بەگشتی بوەتەوە.

مەلا مستەفا بارزانی :

ئەوەی بەباش دەزانی و باوری بەوەهێنا بوو کەدژایەتی کاک ئەحمەد یانی دژایەتی هەموو هۆزی دزەیی و دۆستایەتی شەخسی کاک ئەحمەد دەبێتەهۆی ئەوەی کەهۆزی دزەیی بەگشتی بارزانی بەسەرۆک دابنێت.بارزانی لەپێناو بنەماڵەی بارزانی هەموو تواناو رێگا و پیلانی دارشت و بەکاری هێنا کەوەکو رابردو دۆستایەتیان بەهێزترش بکەن،بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.کاک ئەحمەد جارێکی تر دیدار و سەردانی مەلا مستەفا نەکرد.

مەلا مستەفا بارزانی شارەزا بوو لەناسینی خاڵەلاوازەکانی خەڵکان و ئەم شارەزاییەی بۆ بەرژەوەندی خۆی لەکاتی پێویستدا بەکاری دەهێنا.نمونەی ئەم کارەی شەخسی محسن حەمەئەمین ئاغای دزەییە.کاک محسن دزەیی برای حەقی کاک ئەحمەد دزەییەبەڵام لەهیچ بارێکەوەلێک ناکەن. ئەوەندەلێک دوورن بە پێوانەی نێوان ئاسمان و زەوی.خاڵی لاوازی کاک محسن دزەیی سەروەت و سامان و پلەبوو .زۆری پێ نەچوو کاک محسن بوو بەخاوەن پلەو سەروەت و سامان،جێگای پێی خۆی کردەوەلای شەخسی بارزانی.سەروەت و سامانی شۆرش لەپارەی نەقد (225) ملیون دولار بوو کە لەساڵی 1975بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی‌نائیبەتاڵ کرا ،ئەم 225 ملیون دولارە، بنەماڵەی بارزانی دەستی بەسەردا گرت و تەسلیم بەکاک محسن دزەیی کرا .لەساڵی 1975 وەتا ئێستا 2008/12/12 تەنیا کاک محسن و کوڕەکانین کەئاگادارن لەم سەروەت و سامانەی کەبنەماڵەی بارزانی دەستیان بەسەردا گرتوە،هەر ئەوانیش بازرگانی پێوەدەکەن و کەسیش نیەلیان بکۆڵێتەوەکەئەم سەروەت و سامانەلەکوێوەدەست ئێوەگەیشتوەو چۆن بوونەتەخاوەنی؟هیچ دەزگا و دەسەڵاتێک نییە کەئەم کاری لێپرسینەوە بکات.بەڵام خۆزگا هەر دزینی پارەبوایێت!!

چەم بێ چەقەڵ نابێت.

لەناو هۆزی بەگزادەی دزەیی دوو شەخسی ناسراو هەن: یەکێکیان عزو دزەیی سیخوڕ و نەفس نزم ،ئەویتریش سەفین دزەیی یە: کادرێکی پاراستەپێوەندییەک سەر بەکاک مەسعود بارزانیە.

ئەندامێکی "میت"ی تورکیەتوانا و دەسەڵاتێکی گەورەی هەیەبەهۆی ئەوەی هاوکاری و زانیاریەکانی ئاراستەی دەزگای میت کردوەو بەردەوامە،بەفەرمانی کاک مەسعود بارزانی خۆی خستەتەو زلکاوە.
بەرێوەبەری پێوەندیەکانی دەرەوەیە،بەهۆی ئەو پلەیەبەردەوام راپۆرتەکانی دەر بارەی کوردستانی باشور بەتایبەتی جموجۆڵی پارتی کرێکارانی کوردستان بەسانایی ئاراستەی دەزگای "میت"ی تورکی دەکات.
دۆستی دێرینی کورد ،دانیال میتران سەرۆکی کۆماری فەرانسەپرۆژەیەکی ستراتیژیی ئامادەکردبوو بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی گەورەلەساڵی 19 .
تاوانبار و دوژمنێ کورد سیخور "سەفین محسن دزەیی" ئەو پرۆژەیەی بەفەرمانی کاک مەسعود بارزانی تەسلیمی دەزگای میت کرد.
بەدڵنیایەوەکورد حوکم دەگرێتەدەست و ئازادی و دیمکراسی و یاسا بەرقەرار دەبێت و لەدادگای شۆڕش دا ئەم تاوانبارانەدادگایی دەکرێن.
هۆزی جاف
یەکێکن لەو هۆزەکوردپەروەرانەی کەلەهەموو شۆڕشەکانی کورد بەشداریان کردوەو رۆڵی گەورەیان هەبووەلەخەباتی گەلی کورد تا ئەمڕۆی مێژووی کورد. تاکەهۆزی کورد کەدەوری سەرەکیان هەبوویێت لەشۆڕشەکەی شێخ مەحمودی نەمر هۆزی جاف بوو.
کەریم بەگی جاف سەرۆکی هۆزی جاف رووبەڕوی سوپای ئینگلیزی راوەستا و شەڕی ئاوباریکی کرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا.شەڕی ئاوباریک داستانێکەلەمێژووی کورد هۆزی جاف تۆماری کردوەو شایانی باسکردنە.
شۆڕشی 14 گەلاوێژی ساڵی 1958 یاسای زەوی و دابەشکردنی دەرکرد بەسەر وەرزێرەکاندا. رێزداران خاوەن زەوی، ئەنوەر بەگی جاف (خاوەن 76000 دونم)زەوی و شەوکەت جاف ( 67000 دونم ) زەوی بوو . ئەم دوو رێزدارەنیشتمان پەروەرەزەویەکانیان دابەشکرد بەسەر جوتیاراندا.
هۆزی جاف بەژمارەلەهەموو هۆزەکانی باشوری کوردستان شەهیدیان زۆرتر داوە. یەکەم شەهیدی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی 1961 جاف بوو.برای کەسایەتی پایەبەرز و نیشتمان پەروەر، کوێخا سمایل تەلاند کە لەنێوان دەربەندی بازیان و چەمچەماڵ شەهید کرا،لەبەرگی پێنجی کتێبەکەمدا ئاماژەم پێداوە.
بەندەخزمەتکاری کورد و کوردستان ئامر بەتەلیونی 9ی قەرەداغ بووم،مەسئول ناوچەی جافیەتی گەرمیان بەتالیونی 9 بووم.
لەساڵی 1964 لەرێگای رێکخراوەدڵسۆز و نیشتمان پەروەرانەکانەوەئاگادر کراینەوەکەلە% دوژمن نیازی هێرشێکی گەورەو فراوانی هەیەبۆ سەر ناوچەی جاف بۆ ئەوەی بەخێرایی‌ناوچەکەبەتەواوەتی لەپێشمەرگەپاک کەنەوە.
پێوەندیمان بەدانیشتوانی ناوچەکەکرد و ئاگادارمان کردن،ئێمەبەهیچجۆرێک ناوچەکەچۆڵ ناکەین ئەگەر هەر هەمووشمان شەهید بکرێین.
جا بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆتان چ رێگایەک باشە، روو دەکەنەشار و شارۆچکەکانی دەسەڵاتی حکومەت.یان روو لەناوچەشاخاویەکانی قەرەداغ دەکەن.ئێمەرازین بەهەموو بڕیارێکی ئێوەو سەربەستن،تەنیا یەک یارمەتیمان لەئێوەدەوێت،لەهەر چەند گوندێک،ئێمەخۆمان گوندێک دەست نیشان دەکەین "نان و دۆیلەمان" بو دانێن.
داوامان لەمەکتەبی بارزانی و تاوانباری سیخور ئامر هێزی خەبات عبدالوهاب ئەتروش کرد فیشەکمان نییە،بەردەوام ئاگادارمان دەکردن. بەڵام دوای چوار رۆژ بەرەنگار بوونەوە،کێشەی گەورەمان بێ فیشەکی بوو.
شەڕەکە چەند رۆژی خایاند،12 پێشمەرگەشەهید بوو،19 پێشمەرگەزامدار بوون و هەشت هاوڵاتی شەهید کران.
بەهاوکاری و هیممەتی دانیشتوانی ناوچەکەبەگشتی و مستەفا بەگی جاف بەتایبەتی( لەسەردارەکانی هۆزی جاف و کەسایەتێکی پایەدار وسیاسەتمەدار،بەشداری بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کردووە) بڕی 7 هەزار فیشەکی بڕنەوی ئینگلیزی لەناو کوێخاکانی جاف کۆبکاتەوەو بۆیی ئاراستەکردین. رۆستەم ئاغای زەنگەنەش کەسەردارێکی ناسراوی هۆزی زەنگەنەیەو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزە،بڕی دوو هەزار فیشەکیان داینێ.
ئەم هەڵوێست و کۆمەکەبوو پێشمەرگەسەرکەوتنی بەدەستی هێنا.شەڕ تەواو بوو بارەگای بارزانی هەشت هەزار فیشەکی بۆ ناردین.
کەوتمەرێگا بەرەو بارەگای مەکتەبی سیای پارتی لەیەندزی،کاک حەمەی عەزیز و کاک نافز جەلال،منیان بردەلای حەبیب مەحمود کەریم و د.مەحمود عەلی عثمان و محسن دزەیی.هەر هەموویان بەپیرمەوەهاتن و بەجۆرێک بەخێرهاتنیان کردم،سەرم سوڕ ما،چونکی هیچیان بەدەست نەبوو،کێشەکەم لای بارزانیە بوو و ئەوداوای کردووم.

د.مەحمود عثمان وتی راستەئەڵێن وتارت خوێندوەتەوەدژی خودی بارزانی؟وەلامم دایەوە: راست نیە.(بەڵام راست بوو) دوای دروست کردنی دوو بەرەکیەکەی ساڵی 1963 و بەردەوامی ئەم دوو بەرەکیەبۆ ناو شۆڕشی ئەیلولی 1964 و هێرش بردنەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەماوت،گەیشتمەئەوباوەرەئەو خێلەکیەترسناکەکورد

بەرەو رۆژێکی رەش بین دەبات.هەر بۆیەکەبارزانی داوای لێکردم خۆم هەڵبژێرم بەئەندامی لێژنەی مەرکەزی پارتی،ئەم پلەیەم وەرنەگرت.چونکەبارزان خزمەت شێخ ئەحمەدی بارزانی شکاتم کرد لەمستەفا بارزانی.
هاورێیەک بۆی گێرامەوە،کاتێک باسی سەرکەوتنەکانم کرا بوو،بارزانی وتبوی "ئەم سەگبابەکەی نەکوژرێت و رزگارمان دەبێت بەدەستیەوە.
بۆ نمونە: 1. یەک هاوڵاتی یان پێشمەرگەیەک رووی لەحکومەت نەکرد و هیچ کێشەیەکیشمان توش نەبوو. 2. بەهۆی دانیشتوانی ناوچەکەگرفتی خوراکمان نەبوو.
چەند جارێک ئەمەروویدا کەسەربازەکان دەگەڕێن بەشوێن پاتاڵ لەگوندەچۆڵەکان و لەماڵان دەگەڕێن،دەبینن خانوویەک پڕەلە ناتەرمق و دۆینەی وشک کراو.سەربازەکان دۆینەکەدەبەن بۆ ئەفسەرێک ،ئەویش روو دەکاتەسەربازێکی کورد و پرسیاری لێ دەکات ئەوەچیەو چۆن دەخورێت؟ سەربازەکەش دۆینەکەدەخاتەناو ئاوی سارد و شلی دەکاتەوەو کەوچکێکی لێ دەخوات.ئەفسەرەکەدەیەوێت کەوچکێک بخوات بەڵام دایدەنێتەوەو دەڵێت: تۆپ و تانگ و فرۆکەیان نیە،ئەمەش خواردنیانە،ئینجا بەرامبەرمان راوەستاون !
3. شەو ئاگرێک رووناکیەکەی زۆر بەرز بوو، بەهەڵەوا تێگەیشتم کەئەوەئاگری دوژمنەزۆر نزیک بوونەتەوەلەتیمە.لەگەڵ دوو پێشمەرگەرۆیشتم وردەوردەلێیان نزیک بووینەوە،ئەوان لەرووناکی و ئێمەش لەتاریکی،بینیمان سێ خوشکی گەنج نانیان دەکرد.پرسیارم لێکردن ئەم هەموو نانەتان بۆ چیە؟ ئێوەناترسن بەم جۆرەنزیک بوونەتەوەلەسوپای دوژمن؟

لەوەڵامدا : نەخێر ئێمەناترسین و ئەم نانەمان بۆ برا پێشمەرگەکانمانە،خۆ ئێمەلەدوکتور رەفیق زیاتر نین.

ئاو بەچاوەمدا هاتەخوار و شەرم کرد بڵێم من هەوم. لەبەشی سێیەم لەکتێبەکەم ئاژەم پێ داوە. دەقی ئەم رووداوەم بۆ جەنابی مستەفا بەگ باسکردوە. و تم: هەزار جار سوپاسی یەزدانی مەزن و ئێوەی هۆزی جاف و رۆڵەکانی خوالێخۆشبوو کەریم بەگی جاف دەکەم کەبەم جۆرەیارمەتیمان ئەدەن،ئەگەر ئێوەنەبوونایە،ئەم سەرکەوتنەمان نەدەبوو.

لەبرواری 2008/12/14 دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆم کرد ،دەستم کردەوەبەنوسینی ئەم رووداوەگرنگە،بەراوەردی ساڵی 1964م کرد لەگەڵ ئێستای ئیمرۆ.ئایا ئەم سێ خوشکەماوون یان زیندەبەچاڵ کراون.ئەی ئەو دوو پێشمەرگانەماون چییان بەسەر هاتووە.خودا شاهیدەدەستم کرد بەگریانێک ژێر نەدەبوومەوە.هەستا چووم قورئانەکەم خستەسەر سنگم ئینجا سەبوریم هات و گریانەکەم راوەستا. دەستم کرد بەپاڕانەوەلەپەروەردگار داوای سۆز و بەزەیی تایبەتم لێکرد،خوایەبۆ خاتری ئەو قورئانە..درێژەی هەیە...

سەردار بەگی جاف سەرۆکی هۆزی جاف لەساڵی 2005 تەوافی کرد: کەتەوافی کرد،باروذۆخی ئەمنیم ناجۆر بوو،شەش پێشمەرگەی یەکێتی ژیانیان دەپاراستم.دەسەڵاتی هاتوو چۆ لەدەست خۆما نەبوو، بەداخەوەنەمتوانی بەشداری پرسەکەبکەم کەلەکەلار بوو.دوای دوو مانگ ئینجا توانیم بچمەخزمەت خوشکی گەورەو بەرێز دادەمریەم خانی پێشەوا قازی محەمەدی ئەمر،لەبەغداد.پاساوێکی زۆرم بۆ هێنایەوەو داوای لێبووردنم لێکرد و وتم بەگەورەیی خۆتان بمبەخشن.باروذۆخەکەم رەش بینە،نازانم ئایندەم چۆن دەبێت و چیم بەسەر دێت،ئێران خان لەسویدەو ئیقامەی نییەو دوورین لەیەک.

دادەمریەم خان، بەرێزتان باش ئەوەدەزانن،بڕوام وایەئەوەندەی بەئەندەئاگاداری نهێنیەکانم و شارەزاییم هەیە،خەڵکانێکی زۆر کەم ئەو هەموو راستیانە. دەربارەی بیرەوەریەکانی ژیانامەی خوالێخۆش بوو سەردا بەگی جاف دەزانێت سڵاو لەگیانی پاکی ،جێگای بەهەشتی بەرینە. جا ئەو مافەدەدەم بەخۆم مادام جێی باوڕ و متمانەی ئەوکەڵەمێردەبووم،بەڵێن و گفتت پێ دەدەم کتێبێک بنوسم با بەراشکاوی روون و ئاشکرای بکەم بۆ مێژوو و بکەوێتەبەرچاوی جەماوەر.

بەرێزان

بەندەبڕیارم دابوو دوای تەواو کردنی ئەم کتێبەی کەلەبەردەستم دایە، دەست بکەم بەنووسینی بەدوور و درێژی دەر بارەی کەسایەتی ناسراو سەردار بەگی جاف.

بەداخەوەرەخنەو تاوانێکی گەورەو زۆرتان بەناحەق و کوێرانەو دوور لەراستی داوەتەپاڵ شەخسی سەردار بەگی جاف کەهەموویان درۆیەو راستیان تیا نیە.بەندەتان ناچار کرد وەڵامتان بدەمەوە،بەشی زۆری ئەم قسانەم لەکتێبی شەشەم زۆر بەکورتی بڵاو دەکەمەوە.

داود بەگی جاف: خەڵکانێکی لزم خۆیان نزیک حزبی شیوعی کردەوەو ئەوەبوو کۆمونیستەکان دوای شۆڕشی 14 گەلاوێژی ساڵی 1958 ناچاریان کرد روو بکانەئێران. شای ئێران بەشێوەیەکی رەسمی لەکرماشان پێشوازی لەشەخسی داود بەگی جاف ،سەرۆکی هۆزی جاف،کرد،ئەوەبوو بەماڵەوەلەئێران جێگیر بوون.بەهۆی ئەوەی هۆزی جاف لەکوردستانی رۆژهەڵات و کوردستانی باشورن،وەکو هاوڵاتیێکی ئێرانی وەریان گرتن،بەڵکو گەلێک زیاتریش رێزیان لێگیرا لەهەموو بوارێکەوە.خانەوادەی داود بەگی جاف جێگای خۆیان کردەوەلەئێران بەگشتی و بەتایبەت لەناو لێپرسراوانی حکومەت.

دوو کوری داود بەگ،دوو کچی پێشەوا قازی محەمەدیان هێنا.سەردار بەگ و هاوسەرەکەی کورێک و دوو کچیان هەیەبەم ناوانە: داود،سەیران،سۆما .

دارا بەگ و هاوسەرەکەی سوهەیلا خان،سێ کوریان هەیەبەم ناوانە: چیا ، یاسا،ئاسا

سەردار بەگ بەهۆی زیرەکی شەفافی خۆی لەسەر بڕیار و داواکردنی شا، پلەو پایەێکی گەورەی دیپلۆماسی لەمەکتەبی تایبەتی شا وەرگرت.

سەردار و دارا،بەهۆی هەبوونی پلەو پایەو سەروەت و سامانی زۆر و یارمەتی دانی خەڵک و ، هەر وەها بەهۆی ئەوەی کەزاوای پێشەوا قازی موحەمەد بوون ،لای خەڵک سەرنج راکێش بوو، خاوەن رێز و حورمەتی زۆر بوون و رێزی زۆریان لێدەگیرا.

کەشای ئێران رووخا و حوکمیان نەما ،سالار بەگی جافیش گیرا و پاشان لەسێدارەدرا.

خانەوادەی داود بەگی جاف هەر هەموویان خاکی ئێرانیان بەجێ هێشت .سوهەیلا خان لەگەڵ هەرسێک کورەکانی لەساڵی 1979 وەرۆیشتلەهەندەران .

بۆ ئاگاداری

بەندەلەسەرەتای شۆڕشی 14 گەلاوێژی ساڵی 1958 تاکو بەرواری 1976/9/11 لەگەڵ هاوڵاتیانی جاف بەگشتی پێوەندی و هاوکاری و دۆستایەتیم زۆر گەرم و گوڕ و بەتین بوو،بەتایبەتی لەگەڵ بەگزادەی جافی هەڵەبجەو گەرمیان بەگشتی.

لەدەنگ و باسی ئەو بەگزادالەکەلەئێران ژیانیان دەبردەسەر بەتەواوەتی ئاگادار بووم و پێوەندیمان بەیەکەوەهەبوو. بەدوور و درێژی لەکتێبەکانمدا "کورد دوژمنی خۆت بناسە" ئاماژەم پێداوەکەلە1976/9/ بەفەرمانی دیکتاتۆر سەدام حسین گیرام کەبوو بەسەرۆک کۆمار لەساڵی 1979 بەفەرمانی دیکتاتۆر سەدام حسین ئازاد کرام. لە1979/12/ سەفەرم کرد بۆ کویت،لەبەرواری 1980/1/7 گەیشتمەلەندەن،لەساڵی 1989 دیکتاتۆر سەدام حسین بڕیاری ئازاد کردنی هاوڵاتیانی دەرکرد.بۆ ئەوەی کەلەگرتوخانەو بەندیخانەو پەنابەران لەهەندەران.من لەگەڵ هاوسەرەکەم "ئێران" ی حاجی عەبداللشاغای فەیزوللا بەگی،هاتینەوەعێراق.

یەکەم جار لە ماڵی براکەم کەماڵ پشدەری لەشاری سلێمانی جێگیر بووین.دوای دوو مانگ بەهاوسەرەکەم گوت. من 23 ساڵ لەتەمەنم لەبەغداد بردوەتەسەر ،ئەوەندەی پێوەندی خانەوادە و هاورێم هەیە لە بەغداد، ئەوەندەلەکوردستان هاوڕێم نییە،توانیومەیارمەتی و خزمەتێکی زۆری هاوڵاتیانم کردوەلەهەموو چین و توێژەکان. ئەگەر رازی سەردانێکی ئەوێ بکەین.

لەوەڵامدا هاوسەرەکەم وتی: لەسەران سەری عێراق خزمێکم هەیە،ئەویش مریەم خانی قازییە، لام زۆر گرینگەو خۆشحاڵ دەبم بچمەخزمەتی و دیداری بکەم.

سەفەرمان کرد بۆ بەغداد، سەد ئەوەندەی چاوەروانم دەکرد هەر هەموو ئەو خەڵکانەپێشوازی و خزمەتیان کردین.بەتایبەتی بەرێز کاکەفواد عارف و کورەکەی "فەرهاد" و ئاوسەرەکەی خوشکەنواڵ ماجد مستەفا و بەرێز کاک سەرتیپ جاف و هاوسەرەکەی خوشکەتابان داود بەگی جاف.

بەهۆی ئەوەی نێران خان خزمێکی نزیکی دادەمریەم خانی قازییەو لەماڵی سەردار بەگی جاف میوانین،هەر هەموو بەگزادەی جاف میوانداریان کردین.

لەو ماوەزۆرەی کەلەخزمەتیان دا بووین، بەندەو جەنابی سەردار بەگ، گفت و گۆو لێکۆڵینەوەمان دەربارەی بارودۆخی کورد دەکرد

بەرێز سەردار بەگ چەندەها پرسیاری دەربارەی شەخسی خۆم لەئێستا و ڕابردوەدا ئاڕاستەکردم.هۆی چییەگەڕایتەوە عێراق؟پەیوەندیەکانم دەربارەی بنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی؟ نیازی چیت هەیە؟

وتم: خوا شاهید بێت یەک یەک وەڵامەکانت دەدەمەوەو شەرتیشەراستیەکانت پێ بڵێم و هیچ شتێکت لێنەشارمەوە.

یەکەیەکە وەڵامی پرسیارەکانیم دایەوە،بەدووری و درێژی باسی ڕابردووم بۆ کرد.بەرامبەر ئێستام بەهیچ جۆرێک پێوەندی بەحکومەت ناکەم و هەروەها بەبنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی و دژیان نابم.جیاوازیێکی زۆر هەیەلەنێوان پارتی دیکراتی کردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەبەراوەرد لەگەڵ ڕژیم.بەپێی توانا خۆم بتوانم بەنهێنی یارمەتی کاک مەسعود و جەلال دەدەم.بەلام وەکو ڕابردوو جارێکیتر لەپێناو مەسعود و جەلال ناچمەوەبەرپەتی سێدارەو ئەوەدووبارەناکەمەوە،زۆر بەگران ڕزگارم بوو لەدەست سەدام.شارەزییەکی تەواوم هەیەلەسەر بەشی هەرەزۆری سەرکردەکانی کورد،لەسەر داگیرکەرانی کوردستانی گەورە،ڕۆژێک دێت هەموو ئەو ئاگاداری و نهێنیانەی کەدەیزانم ئەگەر مام بەکتێب بڵاوی دەکەمەوە.زۆر ماندووم پێویستم بە پشودان هەیە،لەبەغداد و سلێمانی دانانیشم،ئەچمەشاری هەولێر. بەگم ئەوەنەخشەمە،ئەگەر پرسیارێکی کەت هەیەئامادەم.

بەرێز جەنابی سەردار بەگ کەکۆتاییم بەقسەکان هێنا دەنگی لێوەنەهات،ئەرەش بین لەگەش بین،یان بڵێت بۆچی ئەچیتەهەولێر.هەرچەند باسی ڕۆیشتنەوەمان دەکرد هەر هەموویان ڕازی نەدەبوون،ماوەیەکی زۆر ماینەوە.

نێران خان و بەندەبەسەرهاتی خۆمان گێڕایەوەکەچۆن ڕامان کرد لەئێران و هاتینەرازان و لەوێشەوەرامان کرد و چوینەتورکیەو لەوێشەوەهەڵاتین هاتینەوەبۆ عێراق.

مریەم خان بەسەرهاتی خانەوادەی خۆیانی بۆ باسکردین بەدوور و درێژی، داستانێکەوقسەکانی مێژووی کلتوری کوردە،کەبەداخەوە چەند ساڵی بەسەردا تێپەڕیوەو زۆریم لەیاد نەماوەکەئاماژەی پێبدەم.

وتی کەکۆماری کوردستان ڕووخا ،ئەوەبوو باوکم لەپێناو سەلامەتی هاوڵاتیانی شاری مەهاباد ،خۆی تەسلیم بەسوپای شاە کرد.ئەوکاتە من تەمەنم شەش ساڵان بوو.هەرچەندەچواردەوری ماڵمان گیرابوو،بەڵام هاوڵاتیانی مەهاباد بەدزیەوەکۆمەکیان دەکردین.زۆر جار خۆراکیان لەکوڵانەوەبۆ دەهاوێشتین بەنهێنی ئاگادارمان بوون.کاکەعەلیم تەمەنی 9 ساڵان بوو.بۆ ماوەی 28 ساڵ لەژێر پەروەردەو چاودێری دوژمنانی کورد بوو، ئینجا هێنایانەوەو تەسلیمی دایکمیان کرد.تەمەنی نزیکەی چل ساڵان بوو.

بەندەو نێران ئەوەندەگریاین،بەتایبەتی بۆ ئەمڕۆ کەخالەعەلی بەفەرانی سەدام حسین لەجێگایەکی تایبەتی دەست بەسەرە.

ئینجا ئێمەگەڕاینەوەشاری سلێمانی،دوایی چوینەشاری هەولێر لەگەڕەکی عەینکاوی بەیەکجاری جێگیر بووین و ماوەی 11 ساڵ ماینەوە،خەریکی کار و باری بازرگانی بووم.

لەگەڵ هاوسەرەکەم زوو زوو سەفەری بەغدادمان ئەکرد.یەکسەر ئەچوینەماڵی سەردار بەگ.ئەگەر بەتەنیا سەفەرم بکردایێت، دەچوومەمیوانخانەو لەوێوەتەلەفونم دەکرد بۆ سەردار بەگ و پاشان دەچوومەخزمەتی بۆ ئەوەی دیداری بکەم.

هەر هەموو خانەوادەیان هەتاکو دەهات، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بەرانبەر بەئێمە، دڵسۆزی و لوتفیان زیاتر دەبوو .سەردار بەگ و مریەم خان بەجۆرێک باوڕیان بەبەندەهەبوو کەشەرمەزاریان دەکردین.

لەلایەکی کەوە کەوتبوومەسەرسوڕمان، شک و گومان لام دروست بوو دەر بارەی بارودۆخی ژیانیان . نەمدەزانی پلان و پرۆگرامیان چیەو چیان لەبەردەستدایە .هەرچەندلەگەڵ شەخسی خۆم دەستم کرد بەلێکۆڵینەوە، هیچم لێ حاڵی نەبوو.هۆی چیەسەردار بەگ لەبەندەی دەشارێتەوە؟ ئایا بەندەجێی شک و گومانم کەپێوەندیم هەیە؟

هەڵسەنگاندن و روونکردنەوەیێک:

ئەم خاڵانەی خوارەوەناماژەم پێداوەژیانی رۆژانەی مریەم خان و سەردار جافەکەبەشێوەیەکی ئاشکرا و بەردەوام بەڕێوەیان دەبرد. سەردارجاف لەیەکەم کۆبونەوەی لەگەڵ بارزان تەکریتی،بەڕێوەبەری هەواڵگری گشتی عێراق ، کەبەدوور و درێژی ئەنجامیان داوەبەرەزامەندی و ئاگاداری سەرۆک کۆمار لەسەر ئەو بڕیارانەرێکدەکەون.

بەشی یەکەم سەردار جاف : ئامادەم هەموو توانام بەکار بێنم بۆ ئامادەکردن و رێکخستنی جافەکانی بەشی ئێران کەدژی کۆماری ئیسلامی ئێران شەڕبکەن.

چەک دژی کورد هەڵناگرین و بەکاری ناهێنین رووبەڕووی کورد لەئێران و عێراق.

بەشی دووەم حکومەت: پێویستیەکانی جەنگ چیەلەچەک و ئازوقەو گواستنەوەو بیمارستان و چونەدەرەوە، بەرهەڵستییان لێنەکرێت و ئازاد بن.

هەموو جۆرەیارمەتیەک بدرێت بەشەخسی سەردار جاف ،دەربارەی کار و باری بازرگانیەتی و دەر بارەی هاتووچۆ کردن،سەر بەست و ئازاد بێت.

دەقی ئەم بڕیارەئەنجامدرا تا کو شەڕ لەنێوان کۆماری ئیسلامی ئێران وحکومەتی عێراق راوەستا. هەموو ئەو کوردانەی ئێران کەدژی ئێران چەکیان بەکار هێنابوو، هەر هەموویان گواستنەوەبۆ پارێزگای الىبار رمادی.

سەردار بەگ هەموو توانایەکی بەکار هێنا،بەشێکی هەرەزۆری ئەوانەی رەوانەی هەندەران کرد و نەیهێشت کەسیان پەرەوازەبێت.

بارو دۆخی سەردار بەگ: جێی سەرنج و پرسیاری بەشی زۆری هاوڵاتیان بوو لەهەموو بوارێکەوە.

پاسەوانی بە ئاشکرای هەیە لەماڵەوەو لەدەرەوەو دەستی لەهەر هەموو وەزیرانی کورد زۆرتر دەڕۆیشت. درگا ماڵ و مەکتەبی هەمیشەکراوەبوو بۆ هەموو هاوڵاتیێک .هەموو رۆژێک سەعات هەشتی بەیانی ئەڕۆیشتەمەکتەبەکەی،بەشی زۆری خۆی سەرقاڵ کردبوو بەکار و باری بازرگانییەوە.پاشان ماوەی کاتەکەی دابەش و تەرخان کردبوو بۆ کار و باری جیاواز،بۆ وێنە،دیاری کردبوو کەسەعات 12ی نیوەڕۆ ئەو هاوڵاتیانەی دەدی کەپێویستیان بەیارمەتی هەبوو.هەرچۆنێک بێت کارەکەی ئەنجام دەدا بەبێ بەرانبەر.زۆر جار ئەگەر کەسێ لەوانەدەی گوت ئامادەم خزمەتێک بۆ قەرەبوو بکەم،سەردار بەگ دەیگوت بڕۆ خوات لەگەڵ ،خزمەتی ماڵ و منداڵت بکە.رۆژێکیان سکرتێرەکەی (کورەکەی خوالێخۆشبوو فایەق هوشیار بوو)......... هاوڵاتیێک هاتەژوورێ هەر هەموویان پێویستیان بەئەشتەرگەری بوو.یارمەتی گشتیانی دا.سەردار بەگ فەرمووی: کەس ماوە؟

یەکێک مابوو شەرمی دەکرد باس لەپێویستیەکانی بکات چون منی دەناسی و کەسایەتیێکی ناسراو بوو.کەسلاّی لێکردم و ناوی هێنام.وەڵامم نەداوە،وتم من رەفیق نیم.کەڕۆیشتەدەری ئەوەبوو کاک سەردار رۆیشت دوای کەوت و هێنایەوەو زۆرێک یارمەتی تایبەتی دایەکابرا. هاوڵاتیەکەوتی سەردار بەگ تەمەنم گەورەیەژن ناهێنم.

کورتەباسێک دەربارەی مریەم خانی قازی :

لەسەرەتای حکومەتی پادشایی عێراق کەدامەزراوەئەمەیەکەمەلەمێژووی بەغداد خانمێک لەشێوەی ئەم خانمەبەم جۆرەهەبوو،بێت کەهەموو چین و توێژەکانی کەسایەتیەناسراوەکان لەزانا و سیاسەتمەداران بەم جۆرەرێزی لێبگیرێت و جەماوەری هەبوو بێت،لەنێر و مێ روو بەروو بەمریەم خانیان دەوت یان هاوڵاتیان لەناو خۆیاندا ئەم قسەیان دووبارەدەکردەوە،سەدخۆزگەمریەم خان بەنێری هاتبایەتەجیهان.

رۆژێک لەگەڵ چەند هاوڵاتێک باسی شەخسی مریەم خانمان دەکرد لەپڕدا جەنابی سەردار بەگ هاتەژووری ناو کۆڕەکەو بەشداری کرد. یەکێک لەئامادەبووان ئاگاداریکردەوەکەسەردار بەگ وتی : ئەوەندەخەڵکم دەناسی سەدها ئەوەندەش بەهۆی مریەمەوەهاوڵاتیکی زیاترم ناسی.حەزی بەوەدەکرد کەلەخزمەتی هەژار و لێقەوماواندا بێت و بەبێ ئەوەی کەس بزانێت دەستیان بگرێت و یارمەتیان بدات.نارەزوومەندی ئەوەبوو بەردەوام لەگەڵ خەڵکانێکی شەفاف لەڕۆشنبیر و زانا و

سیاسەتمەدارانی کورد وئەو مامۆستایانەی خزمەتی ئاینی ئیسلام دەکەن چاوپێکەوتن بکات.نەفس بەرزی و خۆڕاگریەکەی بەرانبەر دوژمنی،جێگەی سەرسوڕان بوو.

چەند نمونەیەک بۆ روونکردنەوە:

1. جارێکیان بەبۆنەی پرسەی عەدنان خێراللەطلفاح لەخزمەتیاندا بووم،مریەم چووبوو بۆ پرسەی ژنان کەبەسەرپەرشتی ساجدەخوشکی عدنان و هاوسەری سەدام حسین بەڕێوەدەچو. فەرمووی کەچومەژوری بەپیرمەوەهاتن،منیان بردەجێگایەک بەرامبەری ساجدەکەنێوانمان هەر یەک مەتر بوو.دوای سەرەخۆشی لەئامادەبووان و بەتایبەتی لەساجدە،ساجدەدەستی کرد بەگازندەو گلەیی کەخەڵکانێک بەداخەوەدەنگوباسی تۆم ئاگادار دەکەن.ئایا ئەزانی چەند حەز دەکەم لەنێوانماندا هاتوچۆ و دیدار ببێت.

وتم خوشکەتۆ کەهاوسەری سەرۆک کۆمار بەم شێوەیەبەپیرتەوەهاتوەو رێزی لێگرتویت،بۆ کێسەی خاڵەعەلیت لەگەڵی باس نەکرد.

فەرمووی کاک رەفیق،من چۆن هەنگاوی وا دەنێم کەداوای وای لێبکەم،ئەوخۆی ئاگادارەو دەزانێ کەخالەعەلی بەفەرمانی پیاوەکەی دەسبەسەرەو گیراوە، با بزانێ کەهۆی ئەوەیەمنیش هاتوو چۆی ناکەم.

2. جارێکیان رەخنەو گازندەیەکی زۆرم لەبنەماڵەی بارزانی گرت، کەمیوانەکان رۆیشتن،فەرمووی راستی زۆرم پێناخۆشەکەتۆ بەناحەق بەم جۆرەهێرش دەبەیتەسەر خواڵێخۆشبوو بارزانی،چونکی خزمەتێکی زۆری هەیە.

وتم دەدەمریەم خان .کەبارزانی گەڕایەوەلەساڵی 1958 هاتەوەعێراق، یەکەم جار لەمیوانخانەی خەیام هاتەخوارێ،لەوشەوەوەلەخزمەتیدا بووم.وام دەزانی فریشتەیەلەئاسمان هاتوەتەخوارێ.بەلەدەش لای بارزانی وەکو لوقمانی کوڕی وابووم، متمانەو باوڕی زۆری بە من بوو.

رۆژێک بارزانی وتی: رەفیق ئەوەبۆ هەژار و عبدالرحمان دیار نین،برۆ هەواڵیان بپرسە.

وتم قوربان بەردەوام پێوەندیم لەگەڵیان هەیەو بڕیاریان داوەکەجارێکیتر هاتوچۆت نەکەن.چونکی سوکایەتێکی زۆرت رووبەڕووی ئێمەو خەڵکانێک کەئامادەبوون بەپێشەوا قازی موحەمەد سەرۆک کۆماری کوردستان کردوە.بۆیەمامۆستا هەژار و مامۆستا عەبدولرەحمان زەبێحی وتیان ئێمەجارێکی کە لە خزمەت مەلا مستەفا دانانیشین.ئەو سوکایەتی بەپێشەوا قازی موحەمەدی کرد ئێمەش بەشدار دەبین لەو تاوانەگەورەدا.

بارزانی سیگارەکەی دەرهێنا و پسوێکی زۆری خوارد ،ئینجا روی لەبەندەکرد و وتی هەر ئێستا بچۆ چاوت پێیان بکەوێت و لەزمانی منەوە ئاگاداریان بکەوەکەجارێکی تر بەهیچ جۆرێک ناوی قازی موحەمەد ناهێنم.

وتم دادەمریەم خان داوای لێبوردنت لێدەکەم بۆ بەندەجوان نیەکەسوکایەتیەکەی بارزانی بەنیسبەت قازی موحەمەدەوەدووبارەبکەمەوەبەرامبەر بەرێزتان.

دادەمریەم فەرموی یەکەیەکەقسەکانی بارزانی چی فەرمووەو شتەهای تریش دەزانم.

وتم سەرەڕای هەموو ئەو سوکایەتیانەی کەبارزانی بەخواڵێخۆشبوو سەرۆکی کۆماری کوردستان ،کەباوکتە، کردویەتی،ئینجا بەڕێزتان پارێزگاری لەشەخسی بارزانی دەکەن.هۆیەکەی چیەوبۆ؟

وتی: چونکی من کچی قازی محەمەدم و هاوسەری سەردار بەگی جافم.کاکەرفێق هەرچەندەتێکەڵاویت هەیەلەگەڵ ئێمەبەڵام جارێ زۆری ماوەشارەزای سەردار بەگ بیت .

3. سەعات 10ی شەوی ساڵی 1990،مریەم خان و نێران وسەیران و سۆما و بەندەچوینەژوری کۆگایەکی کەهەرەبایی گەورەو تازەکرابوە.دەستمان کرد بەتەماشا کردن و گەڕان لەناو کوگاکە.

فەرموی کاک رفیق بەئارەزوی خۆت شتێکی کەهەرەبایی هەڵبژێرەبۆ جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەڕس بۆ ئەوەی هەمیشە ئاوی ساردی هەبێت.

سەلاجەیەکی جوان و نایابم هاتەبەرچاو،هەر بەناو سەلاجەبوو. چەند پرسیارێکم لەخاوەنی سەلاجەکەکرد و پرسیم نرخی سەلاجەکەچەندە؟ وتی: ئەمەیەکەم جارسەلاجەیەکی بەم وێنەیەبێتەعێراق،ئەمەبۆ ماڵ نابێت،چونکی جێگا زۆر دەگرێت،ئەمەش نرخەکەیەتی. وتم ئەوەبوو بەماڵی ئێمە.ئەویش وتی ئەوەفرۆشتم بەڵام بەم شەوەدرەنگەپیکاب دەست ناکەوێت، بەیانی وەرەدوای سەعات 10.

وتم خوشکەئەوە بوو بە ماڵی ئێمە بەڵام تۆزێک گرانە. فەرموی بۆ جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مدەڕس هیچ گران نییە،ئەگەر هەمو کوگاکەی بۆ بکڕم.

وتم خوشکەساکەکەت ئەوەی تێدایەبا خاڵی بکەین و تەسلیم بەخاوەن کوگاکەی بکەین.

بەیانی چوم بۆ کوگاکەو ئەو پارەی مابوو تەسلیمم کرد،خاوەن کوگاکەوتی بەناوی کێ بینوسم؟

وتم: بنوسەبەڕێز مریەم قازی محەمەد هاوسەری سەردار بەگ سەرۆک هۆزی جاف.

پارەکەی هەر هەمووی خستەسەر مێزەکەو بانگی شەریکەکەی کرد،وەرەئەمەبخوێنەوە،تۆ گرێوەکەت دۆڕاندوە.

ئەو دوو شەریکەلەنێو خۆیاندا گرەویان کردبوو،یەکێکیان وتبوی ئەم شازادەیەیان هاوسەری پادشایەکە،یان کچی پادشایەکە،یان پەنابەرن و یان بەسەردان هاتونەتەبەغداد.نرخی سەلاجەکەبەچەند کڕدرابوو هەر ئەوەندەی هەڵگرت.وتی ئەچم پیکاب ئەهێنم ،ناونیشانی ماڵەکەتان بۆ بنوسە.

وتم بنوسەمزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی،ئەمەدیارییەبۆ مزگەوت. پارەی پیکابەکەخاوەن کوگاکەدایەشۆفێری پیکابەکە.

سەلاجەکەم برد و چومەخزمەت جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەڕس،ئاگادارم کردەوەو دەقی جەریانەکەم بۆ گێڕایەوە.

هاتەخوارێ تەماشای کرد و فەرموی دۆعای خێریان بۆ دەکەخودا بیانپارێزێت و پایەبەرزیان بکات.رفیق دوعای خێرت بۆ دەکەم.

گەڕامەوەخزمەت خوشکەمریەم خان. ئەوکاتەمیوانی ئافرەتانی هەبوو،پارەکەم تەسلیم بەسەیران کرد.شەو دەقی جەرەیانەکەم بۆ گێڕاوە.

4. لەگەڵ هاوسەرەکەم، بۆ دیداری خزمان بەنهێنی سەفەری کوردستانی رۆژهەڵاتمان کرد.رۆژێکیان لەمەهاباد میوانی خوشکی بەڕێز خانم خاتمی برازای پێشەواقازی محەمەد بوین .گوتم ئەگەر لوتف بفەرمویت یادگارەکانی پێشەوا،ئەوەی کەماوەو ئەکرێت بیبین،حەز بەبینینیان دەکەم.

فەرموی ئەو ژورەی کەئێستاکەدانیشتوی ژوری کۆبوونەوەو دیداری هاوڵاتیان بووە.ئەوەش جل و بەرگی پێشەوایەو بەجبەشەوەلەسێدارەدرا.

یەکسەر فرمێسکم هاتەخوارێ.وتم ئەو جبەیەنرخی نییەو لەکڕین نایەو ئەمەمێژووی کلتوری کوردەو جێگای موزەخانەی کوردستانە.

کەگەڕاینەوەچوینەبەغداد میوانی سەردار بەگ و مریەم خان بوین.بەدوور و درێژی باسی سەفەرەکەمان بۆ کردن کەچۆن خزمەکان هەر هەموویان میوانداریان کردین و هەموویان یەکەیەکەسڵاو و رێزیان هەبوو.هەر هەموویان بەگەرمەوەئەحواڵیان دەپرسین.ئینجا پێشبینی ئەوەم کرد کەلەمزگەوتی قازی ژورێکی تایبەت بکرێتەموزەی یادگارەکانی

حسابێکی بۆ خۆی نەکرد بوو.ئەمریکا دوری خستەوە،ئەوەبوو خومەینی هێنا. منیش هیچ حسابێکم بۆ خۆمان نەکرد بوو،باروودۆخەکەناچاری کردین دوای ئەوەی براکەم لەسێدارەدرا ئەوەبوو ئەوەی رویدا کەرویدا.

سەدام حسین بەدەستی خۆی گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەند.گۆڕان کاری لەعێراق روو بدات بەڵام کەی؟ ئەمریکا ئەوەدەزانێت.

جا رەفیق منیش حسابێکی تایبەتی بۆ خۆم دەکەم،ئەمەمافی خۆمە. وتی کارم بەتۆیە.

وتم : ئەمە لوتفە کە بەندە ئەوەندە جێی باوەڕ و متمانەم لای بەڕێزتان،خۆشحاڵ و ئامادەم.بەڵام بەندەبەرامبەر بەڕێزتان ئەوەندەلاوازم لەچ بوارێکەوە بتوانم خزمەتتان بکەم،هێز و هۆزم نییەو سەروەت و سامان شک نابەم،زانا و سیاسەتمەدار نیم. جەنابی سەردار بەگ لەچ بارێکەوەخزمەتت بکەم؟

وتی: لە جۆری پەیوەندیت بە شۆڕش و بارزانی.

وتم: لەلایەن بەشی شۆڕشەوەمستەفا بارزانی و مەسعود بارزانی ،ئیدریس بارزانی و حەبیب محەمەد کەریم و زەکیەئیسماعیل حەقی ،لەلایەن باڵی مەکتەبی سیاسیشەوە،ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی،لەلایەن خۆمەوە،کەماڵ برایم و شەفیقی برام و دایکم و حەمەی مام وەلی حەمدیکەم و ئەحمەدی مام وەلی و کاکەئەمین خزمی حەمەی مام وەلی.

وتی نابێت هیچ کەس بەم نهێنیەبزانێت،تەنها "من و تۆ".بۆ شەخسی تۆ دەرگای ماڵم و مەکتەبم کراوەتەوەهەموو کات.بەنوسین نابێت هیچ شتێک هەبێت.هەموو کات بۆت هەیەتەلەفونم بۆ بکەیت،هەتاکو کاتی خەوتنم بوو بێت ئاگادارم بکە.

هەر کاتێک پیلانێک و پرۆژەیەکی سیاسی دارێژم کاری لەسەر بکەم،پێش دەستپێکردنی ئاگادارت دەکەمەوەکەنیازم چییە.لەپرۆگرامەکانم ئاگادارت ئەکەم ودوو بەدوو گفتوگۆی لەسەر دەکەین.تۆش هەڵوێست و بۆچونی خۆت بەراشکاوی وەڵام بدەرەوە.من ئەوەم دەوێت لەتۆ،چونکی لەپێشبینی و هەڵسەنگاندندا شارەزاییەکی زۆر باشت هەیەو پاکی و ...

وتم:بۆم هەیە هەموو پرسیارێکت ئاراستەبکەم دەربارەی ئەو پرۆژەیەو پیلان و شتهایکەش؟

ئێستا وا بۆم روون و ئاشکرا بوو کەنیازت هەیەپارتێکی سیاسی دامەزرێنیت،پێش ئەوەی سەدام حسین بڕوخێت.

وتم: سەردار بەگ چەند پرسیارم هەیەبەگوێرەی شارەزایی وپێشبینی و هەڵسەنگاندنی بەڕێزتان دەر بارەی شەخسی هەریەک لەسەدام حسین و بنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی چییە؟ جۆری پێوەندیت لەگەڵیاندا هەتاکو چەند و چ دەرەجەیەک جێی باوەڕتن؟

وتی: سەدام حسین دوای هێرشەکەی ئەمریکا و راپەڕینەکەی کورد لەساڵی 1991وەرۆژ بەرۆژ حکومەتەکەی لاوازتر دەبێت،لەگەڵ ئەوەشدا بایەخ بەکێشەی کورد نادات،چونکی زۆر هۆ لەئارادایە.ئامادەیەئیدارەی سلێمانی و هەولێر و دهۆک بداتەدەس کورد و کورد بەڕێوەی بەرێت،وەکو ئوتونۆمیەکەی ساڵی 1971 کەکارتون بوو هەر بەناو.

باروودۆخی تایبەتی شەخسی خۆم لەگەڵ حکومەتەکەی سەدام حسین بەرەو ساردی دەڕوات.

بنەماڵەی بارزانی: لەهەڵوێست و بیر و بۆچونیاندا، دامەزراندنی حکومەتی کورد هەرگیز نەبووەوبیریان لێنەکردوەتەوە.

کێشەی کورد هەڵواسراو بێت هەتا هەتایەتاکو بازرگانیەتی پێوەبکەن.ئەخشەو پرۆگرامیان ئەوەیەکەم، سەروەت و سامان ودەسەڵات بکەوێتەژێر چنگیان.ئینجا بەهێزی پێشمەرگەبۆ ئەوەی پیلانەکانیان پێ ئەنجام بدەن،ئەوەبوو هێرشیان بردەسەر پەکەکەو هۆزی سورچی و حسین ئاغایان بەزامداری کوشت و 31ی ئابی ساڵی 1996یان ئەنجامدا و بۆشیان چوەسەر.

کەدەستیان رۆیشت ئەوەندەغرور دەبن چاویانهیچ هاوڵاتیێک نابینن.کەلاواز دەبن و دەسەڵاتیان نامێنێت،هانا و پەنا دەبەنەبەر خەڵک و دەپاڕێنەوە.بۆ نمونە: 1. بەفەرمانی شاەئەوەبوو بارزانی لەساڵی 1975 ئاشبەتاڵی بەشۆڕش کرد. دوای چەند مانگێک حکومەتی شاەهیچ کارێکیان پێیان نەماٌ بەچاوێکینزم تەماشایان دەکردن.2 ـ رۆژێک مەسعود و

ئیدریس هاتە لام لە تەهران، دوای تێپەڕ بوونی چەند مانگێک بەسەر ئاشبەتاڵ،گوتیان جەنابی مەلا مستەفا بارزانی دەیەوێت بێتە خزمەتت.وتم دۆستێکی دێرینی باوکم بووە،من چۆن بەومرازی دەبم،خۆم دەچمە خزمەت مەلا مستەفا بارزانی.فەرموی سەردار بەگ کێشەیێکم لێهاتوەتەپێش، هەموو ڕێگایەکم گرتوەتەبەر هیچ چارەیەکم بۆ نەکراوە،پەنام بۆ جەنابتان هێناوەچارەیکم بۆ بکەی.50 خێزانی بارزانی کەلەگەڵ شەخسی خودی خۆما بوون لەروسیا، داوام لەحکومەتی ئێران ئەوەیەکەهەر 50 خانەوادەکەلەیەک شار دابنێت.حکومەت ئەڵێت بڕیارمان داوەهەردوو خێزان لەیەک شار دابەش بکەین.

سەردار بەگ پرسیار دەکات ئێستا کەهەر 50 خانەوادەلەچەند شوێنێکن،خۆیان ئامادەبکەن هەر ئێستاکەئوتومۆبیلیان بۆ ڕەوانەدەکەم. جەناب،بەندەمەزرایەکم هەیەهەر هەموویان لای خۆم بەیەکجاری دادەمەزرێنم.

مەسعود سەردانی کردم وتی جەنابی مەلا مستەفا حەز بەدیدەنت دەکات.کەرۆیشتمە خزمەتی فەرموی سەفەر دەکەم بۆ ئەمریکا، سەردار بەگ، ئەبێت ئاگاداری مەسعود و ئیدریس و شێخ خالد بیت،.دەستی بەلدەی داناو دەستی هەر سێکیانی خستەسەر دەستم.

پێومندیم پیانەوەهەیەبەڵام جێی باوەڕ و متمانەنین.تەنها بەرژەوەندی بنەماڵەی خۆیان دەوێت.هەڵوێستیان ئەوەیەلەهەموو هۆز و سەرۆک هۆزێک ئەترسن.ئەگەر دەسەڵاتیان هەبێت ناهێڵن هیچ سەرۆک هۆزێک سەرۆکایەتی هۆزەکەی بکات و توانای ئەمەی هەبێت بەرامبەریان ڕاوەستێت،چەند ئەوەندەی ئێستا ببنەخاوەن سەروەت و سامان،ئینجا ڕەزیلتر (خەسیس) دەبن.

جەلال تاڵەبانی :

زیرەک، زانا و لێهاتو و کەسایەتێیکی کوردی ناسراو و سیاسەتمەدار،توانیویەتی لەرەوشەنبیر و نیشتمان پەروەران و زانا و سیاسەتمەداران و هاووڵاتیان،حیزبێک دامەزرێنێتو هەموو وتارێکی بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.قسەلەسەر ئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤ و دیالۆگی ئازاد و سەربەستە،دەسەڵات بە تەواوەتی لەدەست خۆیەتی لەناو یەکێتی.لەهەڵوێست و بۆچونی لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی،ئەگەر بێتو بەراوردی بکەی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی هیچ جیاوازێکیان نییە،بەڵام جارێ شاراوەیەو بەشی زۆری کورد شارەزاییان نییە.

ترسناک ئەو کاتەرووەدەدات کەجەلال و مەسعود یەک بگرن،ئەو کاتەکوردستان دوو بەدوو لەنێوان خۆیاندا دابەشی دەکەن و گەورەترین دیکتاتۆر لەناوچەکەلەدوارۆژدا، جەنابی مامەگیان دەبێت.

پێوەندی بارزانی و تاڵەبانی بەئاشکرا و نهێنی بەهێزەلەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران بەتایبەتی لەگەڵ ئیتلاعات.هەر یەکەهەوڵی ئەوەدەدات زۆرتر و زیاتر نزیک بێت.هەروەها لەگەڵ تورکیا و سوریا.

لەچەند کەناڵیکەوەهەموو هەوڵێکی ئەوەیەکەبێتەجێ باوەڕی ئەمریکا.ئەمەشتێکی زۆر باشەبەمەرجێک لەبەرژەوەندی گەلی کورد بێت.

سەردار بەگ فەرموی ماوەیەکی زۆرەکەنەبۆ ئەوەدەکەم حیزبێک دامەزرێنم،پێش ئەوەی جەلال و مەسعود یەک بگرن و سەدام حسین بڕوخێت.چونکی دوای ڕوخانی سەدام حسین،حوکم و دەسەڵات بەتەواوەتی لەکوردستان دەکەوێتەدەست جەلال و مەسعود.

بارودۆخەکەئەوکاتەترسناک دەست پێدەکات،چونکی هیچ حیزبێک نییەبەرامبەریان ڕاوەستێت.

هەروەکو چۆن بارزانی بەتەواوەتی دەسەڵاتی بەسەر شۆڕشی ئەیلولدا گرت،چونکی هیچ حیزبێک نەبوو لەگۆڕەپانەکەبتوانێت ڕوو بەرووی ڕاوەستێت.ئەوەبوو لەساڵی 1975 ئاشبەتاڵی بەشۆڕش کرد.

ئەوکاتەلەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و ڕەزامەندی ئێران و تورکیا.ئەو هەڵەی هاتوەتەئاراوەبۆ گالی کورد بەگشتی لەدەستی دەدەن.

مەرجەحیزبێک ئامادەبکەم کەبتوانم بەشداری بکەم لەرووخاندنی سەدام حوسێن،ئەوکاتەدوای روخاندنی رژێم،توانای ئەوەم دەبێت ئەوەندەو دەسەڵاتم دەبێت مافی نەتەوایەتی کورد بپارێزم.بەرانبەر نەخشەو پیلانی جەلال و مەسعود و ئێران و تورکیا راوەستم.

فەرموی لەساڵی 1991وەبڕیارم داوەکەمن سەرۆکی هۆزی جافم بەناوی عەشیرەتێن جاف هێزێکی چەکداری دامەزرێنم،تەنها لەهاوڵاتیانی جاف لەخزمەت و بەرژەوەندی کوردا بێت.

بۆ ئەم مەبەستەبەردەوام کاری بۆدەکەم.هەموو توانایەکی خۆم بەکار هێناوەو هەموو رێگایەکم گرتوەتەبەر،لەناوەوەو دەرەوە،پێوەندیم لەگەڵئەمریکا هەیە.

لەگەڵ شەخسی جەلال تاڵەبانی پێوەندیمانزۆر بەهێزەو هاوکاری یەکتری دەکەین.ئاگادارم کردوەکەپێوەندیم بەئەمریکاوەهەیە.کەی روخانی سەدام حسین نزیک بوەوە،ئەوکاتەئاگاداری جەلال تاڵەبانی دەکەم.

سەردار بەگ فەرموی کاک رەفیق هەڵویست و بیر و بۆچونی خۆتم پێ بڵێ و بەراشکاوی وەڵامم بدەوە.

وتم: پیرۆز بێت،گەورەترین خزمەتەکەبەگەلی کوردی دەکەی،مێژوو ئەوەتۆمار دەکات.چەن خۆشحاڵ دەبم بەم تەمەنەچەک هەڵگرم یەکێک بم لەریزی ئەو هاوڵاتیانە.

جەنابی سەردار بەگ، فەرموت بەراشکاوی وەڵامم بدەرەوە. وتم تکایەبەگەورەیی خۆت بمبورە. بەندەشک و گومانم هەیەلەوەی جەلال تاڵەبانی رێگات پێ بدات ئەوپیلانەئەنجامبدەیت.لەبەر ئەم هۆیانەخوارەوەکەئاماژەی پێدەدەم.

یەکەم: دامەزراندنی ئەوهێزەلەناوچەی جافیەتی کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان ئیدارەو سەرپەرشتی دەکات،لاوازی دەکات لەبەر ئەوەجەلال تاڵەبانی ئەرێگایەنادات بەبەڕێزتان.

دووەم : سەردار بەگی جاف سەرۆکی هۆزی جافیەتی لەرۆژهەڵات و باشور لەعەشیرەتی جاف هێزێکی چەکداری دامەزرێنێت،ئەمەبۆ کۆماری ئیسلامی ئێران ترسناکێکی گەورەدروست دەکات.ئەم هێزەدوا رۆژ لەگەڵ حیزبەرێکخراوسیاسیەکانی رۆژهەڵات یەک دەگرن.

سیەهەم : جەلال تاڵەبانی ئەو دەسەڵات وتوانایەنییەبەبێ ئاگاداری و فەرمانی کۆماری ئیسلامی ئێران بەتایبەتی دەزگای ئیتلاعات،ئەورێگایەبدات بەبەڕێزتان ئەو کێشەگەورەو ترسناکەبۆ خودی شەخسی خۆی و حیزبەکەی دروست بکات.من لەجێی جەلال تاڵەبانی بم ئەوەناکەم.

سەردار بەگ : ئاشکرایەلەلای هاوڵاتیان بەگشتیچەندەبەهێزەنێوانی مام جەلال و بەڕێزتان،چەندەباوەڕتان بەیەک هەیە،ئێستاکەمام جەلال لاوازە،کەبەیانی بەهێز بوونەخشەکەت ئەنجام نادات.

ئیمڕۆ باشترەلەبەیانی،نازانم هۆی چیەئەوەندەدوای دەخەی،دوو قسەیە،یا رەش بێن دەبێت،یا گەش بێن دەبێت.

مام جەلال هەموو هەوڵێکی ئەوەیەکەسەروەت و سامانەکەت بازرگانیەتی پێ بکەی لەسلێمانی.ئینجا بەیەکجاری جێگیر بیت لەکوردستان. کۆماری ئیسلامی ئەوە پرۆگرامیەتی،بەتایبەت دەزگای ئیتلاعات.

بەهۆی ئەوەی بەندەو سەردار بەگ دوو بەدوو گفتوگۆمان دەکرد،هیچ دیکومێنتێکم لا نییەتاکو ئاماژەی پێ بدەم.حەیفەکەم سەردار بەگ توافی کردوە،ئەگەر لەژیاندا مابایەهەموو ئەو نهێنیانەم ئاماژەپێدەدا.زۆر جار مریەم خان پرسیاری دەکرد کاک رەفیق ئێوەدوو بەدوو ئەوەندەکو دەبنەوەنەرێ باسی چی دەکەن؟گومانم نییەرەنگەبرایانی بەڕێز د.حەسەن بەگ و دارا بەگ و سەرتیپ بەگ،تەنها ئەوان دەزانن کەلەنێوان بەندەو جەنابی سەردار بەگ،هەندێ بابەتی نهێنی هەیەو دوور نییەئاگاداری کردبن.

بەشی هەرەزۆری بەگزادەی جاف باوڕیان وابوو،نێوان بەندەو جەنابی سەرداربەگ کارو باری بازرگانیەتیەو هۆی ئەوەیەئەوەندەرفیق پشدەری سەردانی سەردار بەگ دەکات.

یەکێک لەو بەڕێزانەوتی : هەموو قسەکانی تۆم تۆمار کردوەلەمێشکم،ئومێدەوارین دەقی قسەکانت هەر هەمووی ئامادەت پێدا بێت،چونکی ئەمەی تۆ بۆت باس کردین مێژوی کلتوری کوردە،ئەگەر لەکتێبی شەشەم ئامادەت پێ نەدابێت ئێمەبڵاوی دەکەینەوە.

هەڤاڵانی بەڕێز ئەگەر دەپرسن سەردار جاف کێیە؟

ئازاترین پێشمەرگەکەلەخزمەتیاندا بووم،لەناوچەی زەنگەنەو هورین و شێخان و کەلار(کامل مەلا وەیس،عزیحەمەخان و حەمەی باخەهەسارەناسراو بەفریشتە) وسەدام حسین چۆن لەبەر پەتی قەنارەچەند خۆراگر بوو.

واللە،واللە،واللەسەردار جاف لەهەر هەموویان ئازاتر بوو،سەخیترین کەس لەکوردستان،خوالێخۆشبوو عەلی کەماڵ بوو،واللە،واللە،واللەسەردار جاف لەو سەخیتر بوو.

سیاسەتمەدار و زانا و شەفاف کەلای بەندەوێنەیان نەبێت لەهەموو ڕوویێکەوە.واللەشم،واللەشم واللەلەرێزی ئەوان بوو،خوالێخۆشبوو سەردار جاف لەراپەڕینەمەزنەکەی ساڵی 1991دا فاکتەرێکی گرنگی سەرکەوتن بوو.هاوڵاتیان هیوای زۆریان پێ بوو.چاوەڕوانی ئەوەبوون کەراپەڕینەکەلەبەرژەوەندی کورددا بێت لەسەرانسەری کوردستانی گەورە.

ئەوەبوو یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان سەر پەرشتی راپەڕینەمەزنەکەیان کرد. لەدوای سێ ساڵ تێپەر بوون بەسەر ڕاپەڕینەکەبەهۆی ململانێکەوە،چەندین فاکتەری دیکەبەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی دەستیان بەسەر ڕاپەڕینەکەدا بەتەواوەتی گرت.

ئەوەبوو هەر یەکەبەتەنیا و ئاشکرا و نهێنی لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتیخۆی چەندەها گرێبەستی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا بەست.

هاوڵاتیان لەسەرانسەری کوردستانی گەورەبەتوندی رەخنەیان هەبوو لەو ڕێزدارانە.ئەم فاکتەرەزیانێکی گەورەی هەبوو بۆ هاوڵاتیانی کورد.

ئەوەبوو ئەوەی ڕوویدا کەرویدا،ئەوەندەحەساس و زۆرن تۆمار ناکرێت.ئەو تاوانانەی کەدژی کورد کردیان لەساڵی 1992 تاکو 2003/4/9 تاوانباران بارزانی و تاڵەبانی لەماوەی ئەو 12 ساڵەدا مێژوویەکی رەشیان بۆ شەخسی خۆیان تۆمار کرد کەهەرگیز ناسڕێتەوەو مێژو شەرم لەکەس ناکات.

دوای شەڕی جیهانی دووهەم ئەوەبوو لەساڵی 1920 حکومەتی عێراق دامەزرا.ئەو دوو دەوڵەتەزلهێز و داگیرکەرانە(ئینگلیس و ئەمریکا) دەوری سەرەکییان هەبوو لەچەسپاندنی کوردستانی باشور بەعێراقی عەرەبی.

سنوری کوردستانی باشور:

مێژوو شایەتحاڵی سنوری کوردستانی باشور "جبلالحمرین".ئەو لیژنەیەی پێکهاتبوو بۆ تاوتوێکردنی حاڵی دانیشتوانی هەرێمی موسڵ و سەلماندنی کورد،هەزاران ساڵەلەسەر ئەم خاکەدەژین و ئەوان خاوەن رەوای ئەو خاکەن و سەبارەت بەجوگرافیای کوردستان و سنوری بەراشکاوی لەداشتنامەیەکدا هاتوە،کەنهێنیەو لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لەرۆژی 31ی تشرینی ساڵی 1918دا دەرچوە،تیایدا روونی کردوەتەوەکەسنوری کوردستان لەرۆژهەڵاتەوەلەرووباری دیجلەوەدەست پێدەکات و لەعێراق لەهەر دوو هەرێمی بەغداد و بەسرە بووە.

کلد و ئاشوورییەکان:

مێژو شایەتحاڵەئەوەدەسەلمێنێت کەکوردەکان یەکەم کەس بوون کەنیشتەجێی کوردستان بوون.کلد و ئاشوورییەکان دوای کورد هاتوون،بەڵام بەتێپەر بوونی کات ئەم دوو نەتەوەیەهیچ دووبەرەکییەک لەنێوانیاندا نەبووە.

بەشایەتی هەموان دۆستایەتی و خۆشەویستی و تەبایی لەنێوان ئەو دوو نەتەوەیەدا هەبووە،کورد بەگشتی بایەخێکی زۆریان داوەبەڕێزگرتن لەپرەنسیپ و رەسم و رسوم و رسومی ئەم نەتەوەیە.

تورکمان :

یەکێک لەو باشیانەی خودای مەزن لەگەڵ کوردا کردویەتی ئەوەبووەکەهاوڵاتی کورد ڕێز لەبێگانەدەگرن،میوانداری دەکەن و دڵیان باشە.هەموو ئەوانەی هاتونەتەکوردستان بەمیوانی یا رایانکردوە، هەوڵی ئەوەی داوەشوێنی پێی خۆی تیا بکاتەوەماوەتەوە.

هەر لەدامەزراندنی عوسمانی ژمارەیەک لەتورکەکانیان هێنا لەپێناوی پارێزگاری رێگای نێوان ئستامبول و کوردستان رێگایەکی کاروانی هەبوو کەکاروانەکەدەگەیشتەموسڵ ،ئینجا ئەهاتە"ئاسکی کەلەک،هەولێر ،ئاڵتونکوپتی،کەرکوک،دافوق،توزخورماتو،کفری ، جلولاء ، خانەقەین، مەندەلی ،دەلی عەباس نیشتەجێ کران و دواتر کەمایەتیەکیان ماوەتەوەناویان نان تورکمان.

هەتا ئیستا کورد و تورکمان هیچ باروودۆخێکی ناهەموار لەنێوانیاندا رووی نەداوە،ژیانێکی خۆشی و شادی بەیەکەوەیان بردوەتەسەر.خوێنیان تێکەڵ بەیەک بووەو ژن و ژنخوازیان لەنێواندا بووە.

تورکمانەکان زیاتر لەکوردەکان بەخت یاوەریان نەبووە، بەدرێژای 35 ساڵ لەدەوری حکومەتی دیکتاتور سەدام حسین بەدەست عێراقەوەچەوسێندراونەتەوە.

ئەوەی بەسەر کوردا هات ،بەسەر برای تورکمانیشدا هاتوەو بەعەرەب کردن و بەعس کردن و گرتن ولەسێدارەدان و زەوتکردنی سامانیان.

نمونەیەک: لەنێوان سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا و وەزیری عێراق "طارق عزیز" دەربارەی بونی تورکمان لەعێراق.وەزیری دەرەوەی عێراق دەڵێت : لەعێراق نەتەوەیەک بەناوی تورکمان نییە.

عەرەب:

یەکەمین بوونی عەرەب لەسەر زەوی کوردستان لەموسڵ دا بوو،لەنێوان 10 و 11ی زاننلدا.بەڵام سەبارەت بەناوچەی کەرکوک دواتر چەند خێڵێکی عەرەب وەکو جبور و حش و عەگیدان لەکەناری زێی بچوکدا نیشتەجێ بوون. هەندێ لەهۆزەکانی عوبید لەناوچەی حویجە جێگیر بوون.هەموو ئەو هۆزەعەرەبانەی کەهاتنەکوردستان لەسەرەتای حوکمی پاشایەتی بۆ بەخێو کردنی ئاژەڵ هاتن.ئەوەبوو جێگیر بوون ،پێیان دەڵێن عەرەبی رەسەن.

هەموو ئەو عەرەبانەی دوای شۆڕشی 14/گەلاوێژی ساڵی 1958 بەفەرمانی دیکتاتۆرەکان (عبدالسلام عارف،احمدحسن البكرو سەدام حوسین، هێنایانەکوردستان و بەشداریان کرد لەهەموونەو تاوانەکانی کەلەماوەی 35 ساڵدا دژی کورد ئەنجامدراوە،کەسەروەت و سامانیان داگیر کردوەو سوکایەتیێکی زۆریان بەهاوڵاتیانی کورد کرد.

هەموو ئەو عەرەبانەچ سوننەیان شیعە،مێژوویێکی رەشیان تۆمار کرد دژی گەلی کورد،پێئان دەڵێن داگیر کەر.

هەڵسەنگاندنی کەش و هەوای سیاسی کورد.

بەبیرو بۆچونی خۆم و خەڵکانێکی نیشتمانپەروەروسیاسەتمەداران،باوڕمان وابوو کەبەڕێزان مام جەلال و مەسعود بارزانی پێش ئەوەی هێرش بکرێتە سەر عێراق، پرۆگرامێکی ستراتیژییان ئامادەکردوە ، هەر کەرژیمی سەدلم حسین روخا یەک سەر ئەم پرۆژەیەئەنجامدەدەن.

1. پاککرنەوەی کوردستان لەچنگ داگیرکەران: هەمو ئەو عەرەبانەی کەلەدوای 14ی گەلاوێژ ساڵی 1958دا لەکوردستان جێگیر بوون و هەروەها لەموچەخۆر و پزشک و پارێزەر و مەلای ئایلی و کرێکارەکانی شەریکەی نەوت.
2. گەڕانەوەی ناوچەدابڕاوەکان بۆ هەرێمی کوردستان.
3. سنوری جوگرافیای کوردستانی باشور: وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لەرۆژی 31 تشرینی ساڵی 1918دا سەنەدێکی دەرکردوەکەتیایدا رونی کردوەتەوەکەسنوری کوردستان لەرۆژ هەڵاتەوەلەروباری دیجلەوەدەست پێدەکات و تا پشتی جبل الحمرين کەعەرەب لەکورد جیا دەکاتەوە.

سوپا ـ جیش نظام: دامەزراندنی سوپایەکی مودێرنی تازە: پێشمەرگەی قارەمان و کۆڵنەدەر ماوەی 42 ساڵەبەرامبەر دوژمن راوەستاوەو ئەجەنگی،لەم شاخ بۆ ئەو شاخ،بەچەکی سوک وەک برنۆی ئینگلیزی و کلاشینکۆفی روسی.

چوار دەورەکەت کۆنەپەرست و شۆڤینی فارس و تورک و عەرەبە،باروودۆخەکەگورانی بەسەردا دێت بەچەکی سوک ناتوانیت پارێزگاری کوردستان بکەیت.

لەپێناو خۆ پاراستن روو بەرووی هەموو هەرەشەو هێرشێکی دوژمن راوەستیت،مەرجەهەموو قورسایی و توانایەکت تەرخان بکەیت یەک سەر (سێ فرقە) دامەزرێنیت.هەموو ئەو پێشمەرگانەبەشداری بکەن بەپلەیەکی بەرز.کارمەندان لەزانا و خاوەن مەدرەک و لێهاتو وشارەزا کەکاریان کردبێت لەسوپا.

هەر دوو ئیدارەی هەرێم یەک بخرێنەوە:

گۆرانکاریەکی بەتەواوەتی لەئیدارەی بەرێوەبردنی هەرێمی کوردستاندا بکرێت، لەخەڵکانێکی شەفاف و شارەزا و لێهاتوو لەگەڵئەو باروودۆخەی کەچاوەروانین روو بدات گونجاو بێت،بەتایبەتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بۆ نمونە: مامۆستا جەماڵ عەبدول یان دکتور جەماڵ نەبەز.مامۆستا عەزیز محەمەد.

جبهەیەکی گەورەی کوردستانی دامەزرێت لەهەموو رێکخراوەکانی کوردستانی،لەرۆژهەڵات و باشور و باکور و رۆژئاوا.پرۆگرام و ستراتیژیەتی کوردستانی گەورەئامازەپێ بدەن.هەرێمی کوردستانی باشور ببێتەئەوایەک بۆ گەلی کورد بەگشتی.
دوای راپەرینەکەی ساڵی 1991 باروودۆخێک هاتەئاراوە، ئەوەبوو راستەوخۆ پارتەسیاسیەکانی باشور ناچار بوون پێوەندیان بەکۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا و سوریا هەبوو. دوای ئەو گۆرانکاریەی چاوەروان دەکرێت پێویستیت بەو پێوەندی و هاوکاریەناکات لەگەڵ داگیرکەرانی خاکی کوردستاندا ببێت.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن و جۆرج دەبلیو بوش،سەرۆکی یەکگرتوی ئەمریکا و تۆنی بلێر سەرۆک ئەنجومەنی وەزیرانی ئینگلیز لەپێناو تایبەتی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بریاریاندا حکومەتی دیکتاتۆری سەدام حسێن و حزبەنازیەکەی لەناو بەرن.ئاگاداری تەواوی رێزداران تاڵەبانی و بارزانیان کرد.کەهێرش کرایەسەر حکومەتی عێراق هێزی پێشمەرگەشان بەشانی سوپای ئەمریکی بەشداری دەکات.

ئینگلیز و ئامریکا، ئەم دوو دەوڵەتەزلهێز و سەرمایەدار و داگیرکەرانە،کوردستانی باشوریان چەپاند بەعێراقی عەرەبیەوە،لەساڵی 1921 و لەساڵی 2003 ئەمریکا بەئاگاداری ئینگلیز داوای لەبەرێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی کرد، بۆتان هەیەهێز بەکار بهێنن بۆ ماوەی 72 سەعات کاتتان هەیەلەپێناوی پاککردنەوەی کوردستان لەچنگ داگیرکەران.

هێزی جەماوەر توانیان بەبەشداری یەکێتی و پارتی و زەحمەتکێشان و سوشیالیست و یەکگرتو و پارێزگاران و کۆمەڵەی ئیسلامی و حیزبی شیوعی کوردستان،لەماوەی 48 سەعات بەتەواوەتی ناوچەکەلەچنگ داگیرکەران پاکەنەوەو کوردستانی باشور بەتەواوەتی ئازاد کرا.پێشمەرگەدەستی بەسەر شاری موسڵ دا گرت و ئەمن و ئاسایش و پاراستن و پارێزگاری ژیان و سەروەت و سامانی هاوڵاتیان بەرقەرار بوو.

پێشمەرگەژیانی هاوڵاتیانی لەبەشی زۆرینەیی شاری بەغداد دەپاراست و پاسەوانی خەڵکانێکی زۆری لەکەمایەتی و سیاسەتمەدارانی عەرەب دەکرد بۆ ئەوەی ژیانیان بپارێزێت.

ئەم گۆرانکاریەمەترسیێکی گەورەی پەیدا کرد لەئێران و تورکیا و سوریا.لەئێران 12 ملیون ، لەتورکیا 22 ملیون و لەسوریا 4 ملیون کورد هەیە.

دوای ئەو باروودۆخەدەسەڵات و توانای کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا و سوریا نەما،رۆژێک لەرۆژان بتوانن هێرش ببەنەسەر هەرێمی کوردستان و دەست بخەنەکاروباری ناو هەرێمی کوردستان،بەئاشکرا یان نهێنی.

ئێستاکەحکومەتی ئەمریکا بەرپرسەلەپاراستنی خاک وسنوری عێراق.

### توركیا

ئەو ڕێكەوتنەستراتژیەی ئەمریكا و توركیا كەساڵها ی ساڵەلەنێوانیاندا هەبوو،ئەمریكا بەردەوام لەهەموو بوارێكەوەلایەنگری حكومەتەكانی یەک لەدوای یەكی توركیای كردوە، دژی كورد.

حكومەتی توركیا لەسەر فەرمانی پەرلەمان بڕیاریاندا ڕێگا بەسوپای ئەمریكی نەدەن لەخاكی توركیاوەبچنەناو خاكی عێراقەوە،ئەم هەڵوێستەی توركیا بوو بەهۆی ئەوەی ساردی دروست كرد لەنێوان توركیا و ئەمریكا. خۆشبەختانەلەبارودۆخی ئێستادا توركیا هیچ دەسەڵات و توانایەكی نییەكەكێشەی سیاسی یا عەسكەری، بەئاشكرا یان نهێنی ،بەبیانوی كەمایەتیەبرا توركمانەكانمان لەكەركوک ،ڕووبەڕوی هەرێمی كوردستان بكاتەوە.

لەسەرەتای دەسەڵاتی مستەفا كەماڵ ی ڕەگەزپەرست و كۆنەپەرست و فاشیست،دژایەتی كوردیان كردوەبەئاگاداری ئەمریكا.ئیمرۆ ئەمریكا حسابێكی تازەی بۆ كورد دەكات.

### كۆماری ئیسلامی ئێران و حكومەتی سوریا :

ئاخوندە مێژەر ڕەشەكانی ئێرانی كۆماری ئیسلامی ئێران،بنەماڵەی حافظ ئەسەد توشی مەترسیێكی گەورەهاتوون. دوای ئەو گۆڕانەی ڕویدا لەعێراق،كورد هێزی دووەم دەبێت لەعێراق.كوردستانی باشور بەتەواوەتی لەدەسەڵاتی هەرێمەی كوردستاندایە.ئەمەبووەو دەبێتەسەرچاوەی ئاژاوەبەرپاكردن لەكوردستانی ڕوژهەڵات و ڕوژئاوا. ئاخوندەنژادپەرست و كۆنەپەرستەكان و بەشار ئەسەد توشی دڵەراوكێ و ترسناكێكی گەورەهاتوون. سەركردایەتی كورد بڕیاری دامەزراندنی حكومەت دەدەن.

هاوڵاتیان لەسەرانسەری عێراق بەراشكاوی ئەم قسەیان دەوت كەدوای عێراق،نۆرەی ئێران و سوریا دەبێت.ئایا كامیان یەكەم دەبێ،سوریا یان ئێران.

دوای ڕووخانی دیكتاتۆر سەدام حسین یەكسەر حوكم لەعێراق كەوتەدەست ئەمریكا و كورد و شیعە.بارودۆخەكەسەبارەت بەئەیندەی كورد لەسەرانسەی كوردستانی گەورەبەتایبەتی لەكوردستانی باشور ،بەدەرەجەگۆڕانی بەسەدرا هات.

ئەمەیەكەم جارەلەمێژوی كورد دوای ڕوخانی حكومەتی "ماد"ئەو بارودۆخەهاتبێتەپێشێ بۆ كورد و سەركردەیەكی كورد، هەروەكو ڕیزداران تاڵەبانی و بارزانی هاتوەتەبەردەستیان لەهەموو بارێكەوە"سیاسی و عەسكەری و دارایی و ئیداری" و 95% هێزی جەماوەر ئامادەیەبەسەر و ماڵ لەسەرانسەری كوردستانی گەورەفەرمانەكانتان دەڤی خۆی جێبەجێ بكات لەپێناوی دامەزراندنی حكومەتی كوردستان.

ئەگەر بەراوەردی هێز و توانا و دەسەڵاتی عەرەب بكەیت،لەگەڵ هێز و توانا و دەسەڵاتی كورد،ئێستاكەگەورەترین دەسەڵات لەدەست كوردایە.نێوان هەرێمی كوردستان و حكومەتی ناوەندی،ئەبێنواند كوردو عەرەب لەعێراق بەقەدەر مووەكەی مەعاویەی ماوە.

درێژەی هەیە...

### هێزی هاوپەیمانان :

وشەی داگیركەر ئەگەر وەربگێرێتەزمانەكانی جیهان،هەموو گوزارشت لەوەدەكات كەهێزێكی سەركوتكەرموڵاتێک داگیر دەكات و دواتر جڵەوی دەسەڵات تیایدا دەگرێتەدەست و بەكەیفی خۆی هەڵسوكەوت دەكات.

بەڵام حاڵەتەكەلەكوردستان جیاوازەچونكی وشەیەک نییەلەفەرهەنگدا پڕ بەپێستی ئەو دەربڕینەی كورد بێت.چونكی ئێمەی كورد لەكوردستانی باشور كەپێشوازی و پشتیوانیمان لەداگیركردنەكە كرد.

هەرچەندەوڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و ئیقلیمی ، ئەم پێشوازییەی کە ئێمەلەهێزێکی داگیرکەرمان کرد بەخۆفرۆشی و،ئێمەیان بەتاوانباری گەورەداناوە.

ئەگەر تاوانەکانی دیکتاتۆرەکان،عەبدولسەلام عارف و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و سەدام حسین، کەدژایەتی گەلی کوردیان کردوە، تۆمار کەیت،ئەوەندەزۆر و حەساس و گرنگن تەواو نابێت.هەموو ئەو گۆڕەبەکۆمەڵانەی کورد کەزیندەبەچاڵ کرابوون،دۆزراونەتەوەو تائیستا بەدوایاندا دەگەڕێن کۆتاییان نایەت.

پرسیارێک دێتەپێشی کەجێی رەخنەو لێکۆڵینەوەیە، بۆچی بەشی هەرەزۆری عەرەبی عێراق لەسوننەو شیعەو چین و توێژەکان<لەشێخ و مەلا و مامۆستا ، پارێزە،نوسەر و رۆژنامەنوس،سەرۆک هۆز و هۆز،کەسایەتی،فەلا ،کرێکار،شان بەشانی دیکتاتۆرەکان دژایەتی گەلی کوردیان کرد و بەشداریان لەسەرکوتی کوردا کرد.

تەنها هۆزی شەمەریعەرەبی کەلەدێرزەمانەوەدۆستی کوردن،بەشدارییان لەم سەرکوت و دژایەتیەدا نەکردو فەرمانی پارێزگاری موسڵیان جێبەجێ نەکرد.هەروەها حزبی شیوعی عێراق دژی ئەو جینوسایدەی ئەو دیکتاتۆرانەبوون،بەپێی توانا بەرهەڵستیان کرد بەراستی و خزمەتی کوردیان کرد

ئەگەر بەراوەردی ساڵی 1962 لەگەڵ ئێستای 2003 بکەیت کەجەلاد سەدام حسین و داروودەستەکەی بەند کراون،ئیمڕۆ رۆژی لەدایکبوونی نەتەوەکەمانە.کوردستانی باشور کەلەبەرواری 2003/4/9 ئازاد و سەربەست بوو.

ئێستاکەهەموو دەسەڵات و توانایەک لەکوردستانی باشور لەچنگی گەلی کوردایەو سەربەست و ئازاد لەو دوو رێگایەی کەلەخوارەوەئاماژەم پێداوەو دوابڕیاردان لەدەستی خودی کورد خۆیەتی،کامیان پەسەند دەکات.

دامەزراندنی حکومەتی کوردی

بنیاتنانەوەی حکومەتی ناوەندی.

ئەو بارودۆخەی لەکوردستانی باشور کەلەبەرژەوەندی کورد لەهەموو بوارێکەوەبەرپا بوو،ئەگەر لەو کات و ساتەلەدەست یەکێک لەو بەڕێزانەدا بایە:

دوکتور عەبدولرەحمان قاسملو یان مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد یان عەبدوڵڵەئۆجەلان. بڕیاری دامەزراندنی حکومەتی کوردیان دابوو.یەک سەر لەمانگی 5ی ساڵی 2003 بەبێ ئەوەی پرسیار و رەزامەندی کۆنەپەرست و شۆڤێنی فارس و تورک و عەرەب وەرگرن.ئەمریکا و ئینگلیس ئیسرائیلیش لەمیدیاکانەوەئاگاداری ئەحواڵەکەو روداوەکەدەبوونەوە.

هەرچەندەهێزی جەماوەر دەوری سەرەکی هەبوو لەپاکردنەوەی ناوچەدابڕاوەکان لەچنگی داگیرکەران و ئازادی کوردستانی باشور،بەڵام بەداخەوە جاری یەکەم لەراپەڕینەکەی ساڵی 1991 دوای دوو ساڵ ئەوەبوو بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی دەستیان بەسەر ڕاپەڕینەکەدا گرت.

بەداخەوەبۆ جاری دووەم دەسەڵات دوای 2003/4/9 کەوتەوەدەست بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی.

لەسەرەتای مانگی ساڵی 5ی ساڵی 2003وەسەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەر پەرەستی سەرۆکی پارتی کاک مەسعود بارزانی و مام جەلال سکرتێری یەکێتی کۆبونەوەو لێکۆڵینەوەو وتووێژ لەسەر دامەزراندنی حکومەتی کوردی بابەت بەبابەت گفتوگۆی لەسەر دەکەن.ئینجا لەسەر رێگای دووەم یانی بنیاتنانەوەی حکومەت ناوەندی عێراقی،کەکامیان لەبەرژەوەندی گەلی کوردە،تاکو بڕیاری لەسەر بدەن.

هەرچەندئامادەبووان وتووێژ و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر دەکەن لەبەر ئەوەی بابەتەکەی زۆر حەساس و گرینگەناگەنەئەنجام،دوا بڕیار تەرخان دەکەن بۆ بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی کەجێی باوەڕ و متمانەی هەموو گەلی کوردن لەکوردستانی گەورەو دەسەڵاتی تەواویان لەدەستدایەو هەموو بڕیاردانێکی ئێوەفەرمانە،یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کلوردستان پابەندەبەجێبەجێکردنی.

بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی دوا جار کۆبونەوەیەکی دووقۆڵی داخراو لەسەر دامەزراندنی حکومەتی کوردی دەگرن ،بابەت بەبابەت شی دەکەنەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن.

بەدامەزراندنی حکومەتی کوردی کێشەی گەورەیان بۆ دروست دەبێت لەناوەوەو لەدەرەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان،دەسەڵاتی پارتی و یەکێتی بەسەر هێزی پێشمەرگەو پاراستن و زانیاری و سەروەت و سامان و وەزارەتی دارایی و پەرلەمان و چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامانی پارلەمان و بەگشتی دەسەڵاتیان بەسەر هەموو جەماوەردا کەم دەبێتەوەو ئازادی و دیمکراتیەت و حکومەتی قانون زاڵ دەبێت و چاودێری دادەمەزرێت و لێکۆڵینەوەو پرسیار دەکەن کەئەو سەروەت و سامانەیان چۆن بەرهەم هێناوەو لەکوێیان بووە.

ئینجا دامەزراندنی حکومەتی کوردیان بەراوەرد کرد لەگەڵ بنیات نانەوەی حکومەتی عێراق.

ئەوەبوو ئەوەی رویدا گەرویدا.بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی رێک کەوتن لەسەر دابەشکردنی هەرێمی کوردستان لەنێوان خۆیاندا .ئینجا هەریەکەیەک کاتدا ئەو پیلان و ستراتیژیەی ئامادەیان کردبوو جێبەجێکرا.

بەرێز بارزانی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کۆدەبێتەوەو باروذۆخەکەیان بۆ روون و ئاشکرا و شی دەکاتەوەو ئاگاداریان دەکات کەلەگەڵ مام جەلال رێکەوتین و بڕیرمان دا لەسەر بنیاتنانەوەی حکومەتی عێراقی و چەسپاندنی فیدرال و ئەوەی کەلەدەستوردا مافی کورد دیاری بکرێت،ئەمەلە بەرژەوەندی گەلی کوردە.

بۆ ئاگاداری ئەم بابەتەزۆر حەساس و گرینگە:

دوکتور مەحمودعەلی عوسمان نیشتمانپەروەر و سیاسەتمەداری بەناوبانگی کورد،کەشاهید حاڵی شۆرشی ئەیلولی ساڵی 1961 ە،بۆ مێژووی کلتوری کوردی لەنامیلکەیەکدا لەسەر ئاشبەتاڵی ساڵی1975 بڵاوی کردەوە، بەراشکاوی نهێنیەکانی بنەماڵەی بارزانی ئاشکرا و روونکردوەتەوە،لەکاتێکدا مەلا مستەفا بارزانی لەژیاندا مابوو.

بەندەو خەڵکانێکی زۆر لەهاوڵاتیان چاوەروان بوین هەڤاڵێک لەو 50 ئەندامەی سەرکردایەتی کەشاهید حاڵی ئەو کۆبونەوەی دوای روخانی دیکتاتۆر سەدام حسین بوون ،کەبەسەرکردایەتی بەڕێزان مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بەسترا،نامیلکەیەک بڵاو بکەنەوەو راستیەکانی ئەو کۆبونەوەبدرکێنن و ئەو بریارانەی کەلەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی بنەماڵەیی خۆیان و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی و دەزگاکانی پاراستنی هەردولادا درا و حکومەتی ناوەندی بەغدایان زیندوکردەوە،ئاشکرای بکەن.

بەڵام بەداخەوەچوار ساڵ تێپەر بوو،هەتاکو ئێستا یەکێک لەئامادەبووان نامیلکەیەکی بڵاو نەکردەوە،وەکو لەسەرەوەئاماژەم بەنامیلکەکەی دوکتور مەحمود عەلی عوسمان داوە.

رەخنەلەهەڤاڵانی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان ناگیرێت لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

بەشی زۆریان بەشداریانکردوەلەشۆرشی ئەیلولی ساڵی 1961 و شاهید حاڵی ئاشبەتاڵی ساڵی 1975 بوون.بەتایبەتی بەڕێز شەفیق قەزاز لەکۆبونەوەسێ قۆڵیەکەی "شا "ی ئێران ئامادەبوو.دەمی بەسترا و زمانی برا کە وەڵامی " شا " بداتەوەو هەڵوێست بگرێت بۆ مێژوو.(وەکو جەنابی د.مەحمود عوسمان)

شەفیق قەزاز دورێکی رەشبینی هەبوو لەسەد روداوەرەشەکەی 31ی ئابی ساڵی 1996 ،هەروەها لەدوای روخانی دیکتاتۆر سەدام حسین تاکو ئیمرۆ جێگای فرانسوا حەریری گرتوەتەوە.

31ی ئابی ساڵی 1996 بەپیلان و ستراتیژیەتی شەخسی مەسعود بارزانی و نێچیروان بارزانی بوو.

یەک سەر سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و دەزگاکانی ئەو رووداوەرەشەی کەبنەماڵەی بارزانی لەپێناوی بەرژەندەوەی تایبەتی خودی خۆیان ئەنجامیاندا،بەناچاری پەسەندیان کردوەو بەشداریان کرد. رەخنەو باسکردنی راستیەکانی بنەماڵەی بارزانی چ بەنوسین یان بەقسەکردن لەناو جەماوەر یان بەکۆمەڵ،یانی یاری کردن بەئاگری سور و دوارۆژ زیندەبەچاڵ و نەمان.

هەروەکو کاک مەسعود بەمامۆستای کوردایەتی و زانا و بیروانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان علی عەبدولڵادەڵێت" فایلەکەت بەتاڵەو هیچی تێدا نەماوە"

هەتاکو ئێستا بەردەوامن لەتیرۆر کردنی هاوڵاتیان تەنها لەسەر ڕەخنەگرتن.ئەگەر ڕەخنەگران لەدەزگاکانی پارتیش کار بکەن،تیرۆر کراون،وەکو مەحیەدین ڕەحیم بەفەرمانی مەسعود تیرۆر کرا و خەڵکانێکیان دەربەدەرکردوە.

چەند تێبینییەک :

لێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەیەک بەشێوەیەکی ورد دەخەمەبەرچاوو دەربارەی ئەو بابەتانەی خوارەوەئاماژەی پێدەدەم.

1/ قوباد جەلال تاڵەبانی دوای گەڕانەوەی یەک سەر سەردانی مامی - جەنابی شێخ جەنگی تاڵەبانی دەکات لەشارۆچکەکەی شاعیری بەناوبانگ حاجی قادری کۆیی.

قوباد تاڵەبانی بەدورودرێژی دەقی قسەکەباس دەکات.قوباد دەڵێت: ئەمریکا چەند سەرەک خاڵێکی ئاگاداری باوکم دەکەن پێش هێرشەکەی ئەمریکا بۆ سەر عێراق،یەکێک لەو خاڵەگرینگ و نهێنیانە،ڕاستەوخۆ پێوەندی بەشەخسی کاک مەسعود بارزانییەوەبوو.

کەخودی شەخسی باوکم ڕوو بەڕوو ئەو پەیامەی ئەمریکای ئاگاداری کاک مەسعود بارزانی کرد،" پێش هێرشکردنی ئەمریکا بۆ سەر عێراق هەڵوێستی خۆت ڕوون و ئاشکرا بکەبەسەعات".

ئەمریکاییەکان ئاگاداریەکی تەواویان هەبوو کەهاوکارییێکی تەواو هەبەلەهەمو ڕویەکەوەلەنێوان بنەماڵەی بارزانی و دیکتاتۆر سەدام حسین،پێوەندییەکەتەنها لەنێوان نێچیرڤان و قوسەی سەدام حسین،پێش یەک سەعات هێرشەکەی ئەمریکا بۆ سەر عێراق بەیەکجاری کۆتایی پێ هێنا.هەرچەندبەنهێنی بوو بەڵام ئاشکرا بوو لای هاوڵاتیان.

2/ یەکێتی نیشتمانی کوردستان :

سەرکردایەتی لەنزیکەوەئاگادار بوون یان زۆر زوو گەیشتنەئەو باوەڕەدەربارەی ڕێکەوتنی نێوان بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆیاندا دەستیان بەسەر سەروەت و سامان و ئیدارەی هەرێمی کوردستاندا گرتبەنیوەیی (50 بە) دابەشیان کرد.سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەو گرێبەست و بازرگانی و ئاوەدانکردنەوەو پڕۆژە، لەژێرفەرمانی خودی خۆیاندا بێت بۆ ئەنجامدان.

ڕەخنەو گازندەلەهەڤاڵانی سەرکردایەتی و ڕێبەرایەتی دەزگاکانی دەگیرێت کەچۆن ئەمەبەسەریان تێپەڕ بوو.ئەم پیلان و ستراتیژیەی بنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی و ... و چەند هەڤاڵێکی سەرکردایەتی دەورێکی ڕەش و بەشداری تەواویان لەهەڵەکانی بەڕێز مام جەلال ،بەڵکو زیاتریش لەهەڵەکانی ئەویان بوو. بۆ نمونە" د. بەرهەم ساڵح،مەلا بەختیار،عماد ئەحمەد،ئازاد جندیانی بەڕێوەبەری دەستگای پێوەندیەکان. چەند هەڤاڵێکی سەرکردایەتی دەورێکی گەش بینیان هەبوو بۆ نمونە: کاکەنەوشیروان مستەفا کەسایەتێیکی ناسراوی ڕزگاریخوازی کوردستان کەبەشداری ئەوتاوانەگەورەیەی نەکرد. کەبەڕێز جەلال تاڵەبانی داوا لەکاک نەوشیروان مستەفا دەکات کەپۆستی سەرۆک ئەنجومەنی وەزیری هەرێمی کوردستان وەربگرێت،لەوەڵامدا کاک نەوشیروان دەڵێت ئەم گەندەڵییەبەمن چارەناکرێت.

ئەم هەڵوێستەفیداکاریەجوانمیرانەی،جەماوەر بەگشتی بایەخێکی زۆری پێدا بەتایبەتی لە ناو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان،هەستی نەتەوایەتی کوردی بەرزکردەوەو لەهەمان کاتدا وەفایەک بوو بۆ شەهیدانی کوردستان.

دوای ماوەیەک ئەوەبوو،بەڕێزان نەوشیروان مستەفا و محەمەدتۆفیق ڕەحیم بەهێمنانەبیرو بۆچون و ڕەخنەو چاکسازی دەربارەی ئەو بارودۆخەی کەچاوەڕوان نەدەکرا بڵاویان کردەوەلەژێر ناوی وشە: یەکێتییەکمان دەوێت بەرابەرایەتی بەکۆمەڵ بەڕێوەبچێ.

ڕاستی جلی دەستیان دیارە، جەماوەر بەگشتی شانازیان پێوەدەکات.ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی کەچوار نیشتمان پەروەری کادری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەژێر ناوی" ڕەگ ، هەڵسوڕێنەرانی ڕەوتی گۆڕینی دیموکراسی" بەراشکاوی

دەربارەی ئەو بارودۆخەی کەئێستا لەهەرێمی کوردستان ئەو دوو بەڕێزە،بارزانی و تاڵەبانی دەستیان بەسەرداگرتوە،لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆیان و بەس.

بەڕێزان 1. نەوشیروان مستەفا 2.محەمەد تۆفیق رەحیم 3. هێرش وەستا حاجی 4. مەلا خدر مامەند 5. هەڤاڵ کوێستانی 6. هوشیار عابد،هەڵوێستی ئەو شەش فیداکار و تێکۆشەرانە،کەبەرامبەر ئەو پیلان و ستراتیژیەی کەبارزانی و تاڵەبانی و هۆشیار زێباری و بەرهەم سالح و مەلا بەختیار ،کەویستیان شەقامی کوردی خەفەکەن،ئەوە بوو روو بەڕویان راوەستان،گەندەڵیەکەیان رۆژ بەرۆژ بەراشکاوی و ئاشکرا روندەکەنەوەبۆ گەلی کورد.

ئیمرۆ بەرواری 2009/1/23 کەئەو بابەتەی لەسەرەوە ئاماژەم پێداوە،تەماشای داتام دەکرد،ئەم هەواڵەگرنگەم هاتەبەرچاو،خستمەپاڵ ئەو بابەتەو لەخوارەوەوەکو خۆی ئاماژەم پێداوە.

هۆشیار زێباری (ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانەو خاڵی مەسعود بارزانیە).وەزیری دەرەوەی عێراق لەکونگرەیەکی رۆژنامەگەریدا لەگەڵ عەلی باباجان وەزیری دەرەوەی تورکیا ،پێکهێنانی بنکەیەکی هاوبەشی نێوان تورکیا و عێراق و ئەمریکای ئاشکرا کرد. ئەم بنکەیەلەپێناو رێگەگرتن لەچالاکیەکانی پەکەکەیە.بڕیارەبارەگاکەی لەشاری هەولێر بێت.هەرێم دەخاتەناو شەڕی برا کوژی.

ئەم هەڵوێستەبەفەرمانی هەریەک لەبەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و نێچیرڤان بارزانی و نوری مالکی ئەم پرۆژەیەدەڤی خۆی جێبەجێ کرد.

ماوەی یەک ساڵە"بەڵکو زیاتریش" بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و نێچیرڤان بارزانی لەپێناوی سەروەت و سامان و پلەو رەزامەندی کۆنەپەرست و شوڤینی تورک و موساد و هەواڵگری CIA، خۆیان ئامادەدەکەن سیاسی و عەسکەری بۆ ئەوەی هێرش ببەنەسەر بارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لەسێ سوچکەو قەندیل.

رێزداران لەساڵی 2007 ئاشکرایان کرد کە لە شەڕی برا کوژی ساڵی 1994 دا 3500 پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان گیانیان لەدەست داوە.

ئەگەر لەنێوان ئەو 3500 پێشمەرگەهەردوو کوڕەکەی مام جەلال >باڤڵ و قوباد،وکوڕەکانی مەسعود بارزانی ،مەسرور و مستەفا، و کوڕەکانی نێچیرڤان ،محەمەد و..،کوژرابانایە،ئێستاکەبۆ شەڕی 2009 لەوانەبوو بیرۆکەیەکیان دەکردەوە.بەڵام بۆ هاوڵاتیان کەکوژران ناگرین.

بەندەو هوشیار لەساڵی 1985 لەرازانی تەرگەوەر وەمەرگەوەری کوردستانی رۆژهەڵات یەکترمان ناسی.برایەتیمان بەهێز بوو.هاوڵاتییەکی خراپ نییە،ترسەنۆک و لاواز وبێدەسەڵات،گوچانی دەستی مەسعود بارزانیەو بەفەرمانی ئەو جموجۆڵ ئەکات.

هەر بەناو وەزیری دەرەوەیە،رۆژ بەرۆژ سوکتر و نزمتر دەبێت لەئاستی گەلی کورد بەگشتی.

بۆ نمونە: بزانەچەند بێدەسەڵاتە لە مەکتەبی تایبەتی خۆی، لەساڵی 1997 لەگەڵ کوڕەکەم لەهاوینەهەواری پیرمام سەردانم کرد.هوشیار دەستی کوڕەکەمی گرت بەرەو ژووری سکرتێرەکەی (فەلاح) ،کەئێستاکەوەرگێڕی مەسعودەبردی.هوشیار وتی :فەلاح ئەمە کاکە بازیان، نزیکترین هاوڕێ و خۆشەویستمە،کوڕی مامەرەفیق پشدەرییە،ئەمەوێت بەزووترین کات بەشوێنێ بڕیدامەزرێت لەUN .

ئەوەبوو بازیان ئەو پلەگەورەیەی دەستگیر نەبوو،پرسیارم کرد فەلاح کێیە؟ گوتیان : فەلاح کادرێکی پاراستنەو یەک سەر پێوەندی بەمەسعود بارزانیە.بەناو سکرتێرەبەڵام چاودێری کار و باری هوشیار زێباری دەکات.

بەناوی خودای بەخشەندەی میهرەبان

خوشک و برایانی ئازیزم:

لاپەڕەی پێشو ئامادەم پێدابوو تاکو بروارى 2009/1/23 وا لێرەوەدواى روخانى دیکتاتۆر سەدام حسین لەبروارى 2003/4/9 وەدەستم کردوەبەنوسین.

ئەوەبوو هێزى جەماوەر توانى لەماوەى 48 سەعات بەتەواوەتى ناوچەداپراوەکان لەچنگ داگیرکەران پاک کاتەوەو کوردستانى باشور بەتەواوەتى ئازاد کرد و کەوتەژێر دەسەڵاتى بەڕێزان،جەلال تاڵەبانى و مەسعود بارزانى.توانیان ئەم وشەیەکەدەڵێت "رەورەوەى مێژوو ناگەڕێتەوە" بگۆرن.ئەم بەڕێزانەئەوەندەزانا و بەتوانان ئەم وشەیان گۆرى و ئیسباتیان کرد کە"رەورەوەى مێژوو دەگەڕێتەدواوە".

ئەو رێکەوتنەدووقۆڵییەنهێنییەى داخراوەکەپێش روخانى رژێم لەپێناوى بەرژەوەندى تایبەتى خودى خۆیاندا ئامادەیان کردبوو،بەراشکاوى لە2003/4/4 ئەو پیلان و ستراتیژیەتیەیان دەقى خۆى بەردەوامن لەسەر جێبەجێکردنى تاکو ئێمڕۆ لەو کتێبەئامازەى پێدەدەم.

بەپێى هەرسێ کتابى ئاسمانى پیرۆز،تەورات و ئنجیل و قورئان<دادگا و مافى نەتەوایەتى،هیچ یاسایەک مافى ئەوەى نییەلەسەرانسەرى کوردستانى گەورەبەتایبەتى کوردستانى باشور،رەخنەو گازندەلەبەڕێزان سکرتێرى یەکێتى نیشتمانى کوردستان و مەسعود بارزانى سەرۆکى پارتى دیموکراتى کوردستان.بگرێ .ئیشارەتى سەوزیان بۆ هەڵکرا بوو و جێى باوەڕ و متمانى زۆرینەى گەلى کورد بوون.دواى روخانى رژێم،رۆژانەهەڵوێست و بیر و بۆچون و پرۆگرام وسیاسەتیان دەربارەیناو خۆ و دەرەوەو پێوەندیەکانیان لەگەڵ ولاتانى ئەوروپا و بەتایبەتى کۆمارى ئیسلامى و حکومەتى تورکیا و حکومەتى سوریا، لەهەموو رویەکەوەگەرمە.هەروەها دیدارى رۆژانەیان هەموو ئەوانەبەراشکاوى لەئێستگەو تەلەفزیون و کەناڵەکان بەزمانیکوردى و عەرەبى و فارسى و تورکى پەخشیان دەکرد و لەمیدیاکانیش بڵاویان دەکردەوە.

ئەو بەڕێزانەهیچ شتێکیان لەگەلى کورد نەشاردوەتەوەهەتاکوو ئێستاکەتەنها دەربارەى سەروەت و سامانیان و بازرگانیەتى و ئەکومپانیانەى کەلەتورکیا و ئەوروپا هەیە،مقدارى سەروەت و سامانیان بەژمارەگەیشتەچەند؟ ئەوەش مافى خۆیانەحاکمى کوردستانن.

لەسەرەتاى مانگى 5ى ساڵى 2003 جەماوەر بەگشتى چاوەڕوانى ئەوەى دەکرد کەسەرکردایەتى بڕیارى دامەزراندنى حکومەتى کوردى بدات.

ئەوەبوو لەساڵى 2005 بڕێز جەلال تاڵەبانى بوو بەسەرۆک کۆمارى عێراق و بڕێز هۆشیار زێبارى بوو بەوەزیرى دەرەوەى عێراق.دامەزراندنى حکومەتى کوردى بوو بەخەونى شاعێرانەو هەتاکو ئێستاکەیەکێک ناوێرێت لەسەر ئەو کڕین و فرۆشتنەقسەیەک بکات و راستیەکان بەراشکاوى بڵاو بکاتەوە.

بەندەلەسەر پرۆژەى دامەزراندنى حکومەتى کوردى وا لەخوارەوەئامازەى پێدەدەم ،دواى ئەوەى کەبەڕێز جەلال تاڵەبانى بوو بەسەرۆک کۆمارى عێراق دەستم کرد بەلێکۆڵینەوە، وردەوردەلەسەرەتاى ساڵى 2008 گەیشتمەئەو باوەڕەو ئاگاداریەوا ئاراستەى دەکەم.

لەدواى 31ى ئابى ساڵى 1996 ئەو پێوەندیەى کەبەم شێوەیەى بەرپا ببوو لەنێوان شەخسى مەسعود بارزانى و سەدام حسین.ئەوەندەى باوەڕ و متمانەیان بەیەک هەبوو کەجێى سەرسوڕمان بوو.لەژیانى حوکمى 25ساڵەى سەدام حسیندا و لەدواى راپەڕینەکەى ساڵى 1991 کەمەسعود بارزانى حوکم دەکات.

نەمەیەکەم جارەلەمێژوى ژیانى مەسعود و سەدام بەو شێوەباوڕ و متمانەیان هەبێت.

بۆ نمونە: مەسعود و مەسرورى کوڕى و سەدام و قصەى کوڕى چەند باوەڕ و متمانەو پێوەندیان بەیەکەوەهەبوو .مێژوو شاهید حاڵەبەڵکو لەمەزیاتر نێوان مەسعود بارزانى سەرۆکى پارتى دیموکراتى کوردستان و سەدام حسین سەرۆکى کۆمارى عێراقى بەهێز بوو.خەتى تاڵەفونى تایبەتى لەنێوان شەخسى سەدام و مەسعود هەبوو.

مەسعود بارزانى گەیشتەئەو باوڕەکەسەدام هەتا هەتایەحوکم دەکات و بەهێز و تواناتر دەبێت.ئینجا هەموو قورسایى خۆى خستەسەر رژێم.

لەگەڵ ئەوەشدا بەئاگاداری رژیمی سەدام حسین،بنەماڵەی بارزانی پێوەندی و هاوکاریان بەحکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا و حکومەتی سوریا بەراشکاوی هەبوو.

بنەماڵەی بارزانی رۆژێک لەرۆژان داوای دامەزراندنی حکومەتی کوردییان نەکردوەو داواشی ناکەن و بیریان لێنەکردوەتەوەتاکو ئێستا.

ئەم راستییەتۆمارکراوەلەئەرشیفی هەر چوار حکومەتەکەی،عێراق،ئێران،تورکیا،سوریا و دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا و فەرانسەو ئەڵمانیا و ئیسرائیل ش ئاگاداری تەواویان هەیە.

هەڵوێست بیر و بۆچون و پیلانی بنەماڵەی بارزانی کەدەسەڵاتی حوکمیان کەوتەدەست،یەکەم شت سەروەت و سامان بەگشتی لەگیرفانی خودی خۆیاندا بێت.کەچووەگیرفانیان جارێکی کەنایەتەوەدەری،بیر و بۆچونیان خێڵەکیەو سەرمایەداریەو پلەو پایە. ئینجا دەزگای مافیایان(پاراستن)بەهێز دەکەن.

ئەوەی دەربارەی بنەماڵەی بارزانی ئاماژەم پێداوەشتێکی شاراوەنییە،هەموو رێکخراوەکوردستانیەکان ئاگاداری و شارەزاییان هەیە،بەتایبەتی رێکخراوەکانی کوردستانی باشور و شەخسی بەرێز جەلال تاڵەبانی.

لەسەرەوەئاماژەم کردوەبەپێوەندی و هاوکاری نێوان مەسعود بارزانی و دیکتاتۆر سەدام حسین سەرۆکی کۆماری عێراقی.

دەربارەی هاتوچۆ کردن و هاوکاری یەکترین ،تەنەر و رابەر لەنێوانیاندا نێچیرڤان ئیدریس مستەفا بارزانی و قصەی سەدام حسین،بوو.تاکو یەک سەعات پێش هێرشەکەی ئەمریکا بۆ سەر رژیم.ئەوەبوو ئەوەی رویدا رویدا.

قوسەی سەدام حسین ،چوەدونیای ئاخر،خوا لێخۆشبێت و لاکاتی کوژرانی قوسەی وعودەی و مستەفا ،دیکتاتۆر لەژیاندا مابوو.بەرێز نێچیرڤان ئیدریس بارزانی ،ئەم تاوانبارەبوو بەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان.

مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای ئەوەی کەگەیشتەئەو باوەڕەی ئەمریکا هێرشی دەکاتەسەر شەریکەکەی سەر سورماو و لێشێوابوو،جیهانی لێهاتبوەیەک و تاریک ببوو. ئینجا کۆبوونەوەدەربارەی ئەو بارودۆخەی دوای روخانی سەدام حسین چ روودەدات.

دوو رێگایان لەبەر دەستدا بوو.یەک رووبکەنەهەندەران و ببنەپەنابەر لەیەکێک لەو سێ وڵاتانەی ئێران،تورکیایان سوریا،یان لەکوردستانی باشور بمێننەوە.

ئەم بارودۆخەیان هەڵسەنگاند وا لەخوارەوەئاماژەم پێداوە.

کۆماری ئیسلامی ئێران: لەساڵی 1979 پێوەندیان بەئاخوندەمێزەر رەشەکانەوەهەیەو هاوکاری تەواوەتیان لەگەڵ دەزگای سیخوری ئیتلاعات و پاسداران بەردەوامە.دەورێکی سەرەکیان هەبوو و پیشڕەوەی سوپای ئێران بوون لەشاخەکان و شەڕێکی دژواریان کرد دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران.

بەڵام بارودۆخی ئێران دوای ئەو گۆرانکاریەی کەلەعێراقدا روودەدات،یەکسەر دەسەڵات دەکەوێتەدەست ئەمریکا.ئینجا وردەوردەبارودۆخی ناوەوەی ئێران گۆڕانی بەسەردا دیت و جەماوەر باس لەوەدەکرد دوای روخانی رژیمی سەدام حسین،نورەی ئێران یا سوریاش دێت.

حکومەتی سوریا : سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر ئێران وسوریا بەیەک چاو تەماشای دەکردن.سوریا و ئێران دوا رۆژیان تاریکە.هیچ روناکیێک دیار نییە.

حکومەتی تورکیا:پێوەندی بنەماڵەی شێخانی بارزانی زۆر بەهێز بوو بەتایبەتی لەگەڵ دەزگای میت.بەڵام بەهۆی ئەو هێرشەی کەکردیانەسەربارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لەساڵی 1994 لەشاخەکانی قەندیل و سێ سوچکەکە،رۆیستنیان بۆ تورکیا توسی کێشەی زۆر دەبن لەکوردستانی باکور.

دووەم: مانەوەیان دوای روخانی رژێمی سەدام حسین لەکوردستانی باشور.

ئەمریکا بەتەواوەتی دەست بەسەر عێراقدا دەگرێت.ئایا ئەمریکا هەڵوێستی چۆن دەبێت،بارودۆخەکە دیار نییە.

ئەوکاتەحەتمەن ئازادی و دیموکراسی مافی مرۆڤ بەرقەرار دەبێت و دیالۆگ ئازاد و سەربەست دەبێت.دوای ماوەی چەند مانگێک لەکەش و هەوایەکی ئازاد و دیموکراتی ئەوکاتەهەڵبژاردن دەبێت،ئێمەش دەنگ ئەهێنین.

دوای ئەو کۆبوونەوەیەو چەندها کۆبوونەوەی کەهیچ پیلان و پرۆگرامێکیان نەبوو کەچی بکەن و کام رێگا بگرنەبەر خۆشی سەرسورمان بوون.

پارتی دیموکراتی کوردستان:

مێژووی پارتی،مێژوی کلتوری کوردەکەبەداخەوەشاراوەیە،کێ کردی و کێ خواردی.هۆیەکەی دەگەرێتەوەبۆ بنەماڵەی بارزانی چونکی لەبەرژەوەندیان نییەبڵاو بێتەوە.پارتی رابردوی مێژوویەکی گەشبینی هەیە،حیزب دەریایەو دەریا قەت پیس نابێت.بەڵام دەریاش جار و بار لێڵ دەبێت.پارتی لەسەرکردایەتیەوەتاکو لایەنگرانی خەڵکانێکی نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەدار و شەففافی تێدایە،بەڵام بەداخەوەبنەماڵەی شێخانی بارزانی پیاو کوژن .

هیچ یەکێکیان ناتوانێ روو بەروو بەئاشکرا و نهێنی رەخنەو گلەیی لەبنەماڵەی شێخانی بارزانی بگرن،چونکی ئەمەخەتی سورەدوا رۆژت دەکەوێتەدەست دەزگای مافیا (پاراستن).ئەم بارودۆخەو گۆرانەو دوای کونگرەی شەشی پارتی کەلەشارچکەی قەڵادزێ گیرا لەساڵی 1964،بەفەرمانی مەلا مستەفا و ئاگاداری حکومەتی عەبدولسەلام عارف ئەوەبوو هێرشی کرایەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەناحیەی ماوەت.

دوا بەدوای ئەو پیلان و ستراتیژیەی مەلا مستەفا و عەبدولسەلام، ئەوەبوو بنەماڵەی شێخانی بارزانی بەتەواوی دەسەڵاتیان بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرت.لەهەموو بوارێکەوە،سیاسەتی دەرەوە لەوەوە هەموو گرێبەستێک ،سەروەت و سامان،ئەوەی دارایی و ئیدارەو هێزی پێشمەرگە.ئینجا دەزگای مافیای پاراستن دروست کرا بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی.

دوای کونگرەو پێش ئەوەی هێرش بهێنەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی هەر هەموویان،تەنها شەخسی مەلا مستەفا ئەو جلوبەرگەی لەبەر بوو بەو جلوبەرگەوەمایەوە،یەکسەر ئیدریس و مەسعود و سابیر و هەموو پاسەوان و چەکدارەکانیان جل و بەرگی پێشمەرگەیان لەبەر کرد.بەڵام جامانەسورەکەکەدروشمی خۆیانەوەکو خۆی ماوەتەوە.مەسعود لەو رۆژەوەبۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی کورد ،جلی کوردی لەبەرە.

خوێنەری خۆشەویست

بەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان لەکتێبەکانمدا >کورد دوژمنی خۆت بناسە< دەربارەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی نامۆژەم پێداوەو رێزم هەیەبۆ عەرەب،ئەم بنەماڵەیەبەرەچەڵەک عەرەبن.لەرێگای تایبەتی خۆم چەندەها خەڵکی بەتەمەن و کەسایەتی شارەزا و ناسراو،بەتایبەتی لەهۆزانە(بەرۆژ،مزوری،شێروانی،دولەمەری) دیدارم کردن و پێوەندی تایبەتی خانەوادەی خۆم لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە،1956 لەبەغداد دراوسێ بوین.دروشمی جامانەی سور کەباپیرەگەورەی مەلا مستەفا بارزانی یەکەم جار هاتوەتەناو برا یەزیدیەکانمان ماوەیەک ماوەتەوە لە ناویاندا،جامانەی سوری لەسەر ناوە،نەیتوانیوەجێگای خۆی بکاتەوەو هاتوەتەگوندی "بەرۆژ".

مێژوو کلتوری کوردی باسی شێخانی بارزانی ناکات،لەدوای ساڵی 1934 ناسراون.ئەگەر خەڵکانێکی رەوشەنبیر و سەر بەخۆ دەست بەلێکۆڵینەوەبکەن زۆر بەسانایی بۆی رون و ئاشکرا دەبێت.

بۆ نمونە: 1. زەعیم عەبدولکەریم قاسم خوالێخۆشبو لەبارەگای تایبەتی خۆی لەوەزارەتی بەرگری لە ساڵی 1959 بەمەبەستی ئاشتکردنەوەی مەلا مستەفا بارزانی و ئەحمەدئاغای زێباری گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات،کەئاشتبونەوەتان لەبەرژەوەندی هەموو عێراقدایەو دەبێتەمایەی ئەمن و ئاسایش لەناوچەکەبەرقەرار دەبێت و هەموو ئەو دوویەرەکییەحوکمی پادشایی دروستی کرد .ئێستاکەهەموومان ئازاد و سەربەستین.ئەحمەد ئاغای زێباری دەڵێت: جەنابی

زەعیم ئەگەر مەلا مستەفا بارزانی راست دەکات دەڵێ من خاوەن عەشیرەتێکی دێرینم با پێنج پشتی خۆی بڵێت.جەنابی سەرۆک ئەم عەشیرەتەبێ بنچینەن.من دەتوانم ناوی دوانزەپشتی خۆم بڵێم.

ئەحمەد ئاغای زێباری رووبەڕوی زەعیم عەبدولکەریم قاسم ئەم قسانەبەمەلا مستەفا بارزانی دەڵێت. مەلا مستەفا بارزانی تورەدەبێت،کۆبونەوەکەبەجێ دەهێڵێت.

بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی لەساڵی 1960 لەشاری موسڵ ئەحمەد ئاغای زێباری سەرۆکی هۆزی زێباری تیرۆر دەکرێت.

2 کتێبێک بەناوی تەریقەتی نەقشبەندی لەبڵاوکراوەکانی دەزگای موکریان،700 لاپەڕەیە، لەم کتێبەدا لەلاپەڕەکانی 204 تا 208 دا لەژێر ناونیشانی "زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی و شەجەرەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی"تێدا مەسعود و ئیدریس دەکاتەنەوەی محەمەد و لەوێشەوەشۆڕ دەبێتەوەدەیانکات بەکوڕی " کلیب" ی دواتریش دەگا بەکوڕی نوح.

3. مەلا مستەفا بارزانی تەنها پێنج پشتی خۆی دەزانی،ساڵهای ساڵ هەوڵی دا شەجەرەیەک بۆ بنەماڵەکەی خۆیان ئامادەبکات،بەڵام سەرنەکەوت. ئەم شەجەرەدرۆینەچۆن دروست کرا،تەنها یەک شتی راست کەبەرەچەڵەک عەرەبن ،بەڵام قسەکەی زێباری شاهید حاڵی مێژو و کلتوری کوردیە.

لەساڵی 1974 خوالێخۆشبو شێخ عوسمان کوری شێخ ئەحمەد بارزانی لەبەغداد رووبەڕو لەئاسایشی گشتی وتی بەرەچەڵەک ئێمەعەرەبین.

هەموو ئەو رێزدارانەی کەلەساڵانی 1750 و 1921 هاتونەتەکوردستانی باشور گومان لەوەنییەهەریەکەمێژووی خودی خۆی باش دەزانی،لەرێگای باوک و باپیر و باپیرەگەورەی کەهۆی چی بوو هاتەکوردستانی باشور.

1. تورکمان: ئەو برابەڕێزانەموچەخۆر بوون لەدەوڵەتی عوسمانی پاسەوانی پارێزگاری رێگای نێوان تورکیا و کوردستان بوون. دوای روخانی دەوڵەتی عوسمانی چەند خانەوادەیەک لەکوردستان مانەوەو جێگیر بوون.
2. 2. عەرەب: هەندێک لەهۆزەکانی عوبەید کەهاتنەکوردستانی باشور بۆ بەخێو کردنی ئاژەڵ،ئەوەبوو لەکوردستان مانەوەو لەحویجەجێگیر بوون.

هەر هەموو ئەوانەی کەلە یەکەم رۆژ هاتونەتەکوردستان هەوڵی ئەوەیان داوەشوێنی پێی خۆیان بکەنەوە چونکی کوردستان وڵاتێکی بەپێت و بەرەکەتەو هاوڵاتی کورد بەگشتی رێزێکی تایبەتی لەبێگانەدەگرێت و میوانداری دەکات.

گەلی کورد نژادپەرەست نییە،باوەڕی بەئازادی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ هەیە.کێشەی ئاینی لەنێوان نەتەوەی کورددا نییەو ئاینی ئازاد و سەربەستە.

مێژوو شاهید حاڵەو ساڵانەی کەئەو برا بیانیانەی کەتورکمان و عەرەب هاتونەتەکوردستانی باشور هەتاکو ئێستاکەرۆژگار بەخۆشی و شادی و کامەرانی چوەتەسەر'انشاء اللەئەم بارو دۆخەبەردەوام دەبێت هەتا هەتایە" .

ئەم بارودۆخەلەبەرژەوەندی کۆنەپەرەست و شۆڤینی "فارس و تورک و عەرەب " نییە.

جا داگیر کەرانی کوردستان لەرێگای کەناڵەکانی سیخوری تایبەتی خۆیان هەموو پیلان و رێگایەک با ئاشکرا و نهێنی دەگرنەبەر بۆ ئەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی دروسی بکەن لەنێوان کورد و تورکمان و عەرەب،بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخەگۆڕانی بەسەردا بێت.

یەکێک لەو رێگایانە،لەرێگای سیخورەکانی خۆیان چەند هاوڵاتیێکی عەرەب و تورکمان تیرۆرکەن،ئینجا لەکەناڵەکانی خۆیاندا بڵاوی بکەنەوەو پڕۆپاگەندەی پێوەبکەن کەئەمەهەڵوێستی کوردە.

بەداخەوەخەڵکانێکی نەفس نزم هەن لەناو برا تورکانەکان و عەرەبەکان کەبەنهێنی سیخوری بۆ ئێران وتورکیا و سوریا دەکەن.ئەمەیاری کردنەبەئەگر و دوارۆژی ترسناکە.دژایەتی،شەقامی کوردی لەبەرژەوەندی کورد و عەرەب و تورکاندا نییە،نەکردنی باشترە.

لەپێناو پوچەڵکردنەوەی پیلانەکانی ئێران و تورکیا و سوریا پێویست بەوەدەکات بەعەقڵێکی ژیرانەو سیاسەتمەدارانەوەڵامیان دەینەوە.هەموو مافێکی نەتەوایەتی براکانمان ،عەرەب و تورکمان>دیاری کرابێت لەدەستوری هەرێمی کوردستان بەشدارییان کردبێت و جێبەجێ بکرێت.

لەپێناو دامەزراندنی حکومەتی کوردی هەموو رێگایەک دەگرنەبەر،زۆرینەی گەلی کورد ئەوەناوات و دروشمیەتی کە> کوردستان یان نەمان.

جیهان گۆرانی بەسەردا هات،مەرج نییەسەرۆک کۆمار کورد بێت.بۆ نمونە1. سارکۆزی فەرەنسی نییە،بەڵام لەفەرنسالەدایک بوەو ئێستا سەرۆکی کۆماری فەرەنسەیە.

2/ ئۆباما لەدایک و باوکی ئەمریکی نین، بەڵام لەئەمریکا لەدایک بووەو ئێستا سەرۆکی یەکگرتوی ئەمریکایە.

با سەرۆک کۆماری کوردستان عەرەبێکی دانیشتوی (حەویجە) بێت.با سەرۆک کۆماری کوردستان تورکمانێکی کەرکوک یا داقوق بێت.

مەرجەکان: لەکوردستان لەدایک بووبێت بۆی هەیەخۆی کاندید بکات بۆ ئەوەی ببێتەسەرۆک کۆماری کوردستان،بەپێی یاسا هەموو مەرجەکانی تێدا بێت.

نابێت تاوانبار بێت بەو بابەتانەی خوارەوە"کوشتن،سیخوری،خەزێنەی دەوڵەتی تاڵان کردبێت،بەشدای کردبێت لەگەڵ ئەودیکتاتۆرانەعەبدولسەلام عارف/ئەحمەد حەسەن البەکر/سەدام حسین.

کەسایەتییەکی ناسراو و نیشتمان پەروەر و هاوڵاتییەکی شەفاف بێت،هیچ تاوانێکی دژی گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەئەنجام نەدابێت.

رۆژی هەڵبژاردن ئەوەدەنگدەرانن بڕیار دەدەن،دوای سەرژمێری ئەگەر ژمارەی زۆرتر بوو ئەوکاتەدەبێتەسەرۆک کۆماری کوردستان.هاوڵاتی کورد شانازی پێوەدەکاتکەسەرۆک کۆمار هاوڵاتییەکی کوردستانیەو بەرەچەڵەک عەرەبەیا تورکمانە.ئەگەر ئەم پیلان و ستراتیژییەی کەئامانژەم پێداوەجێبەجێ بکرێت،ئەمەرێگایەکی سەرەکییەکەرووبەرووی کۆنەپەرست و شۆڤێنی و نژادپەرستەکانی فارس و تورک و عەرەب رادەوەستێین و هەموو پیلانەکانی دەزگای میت و ئیتلاعات و هەواڵگری سوریا پوچەڵ بکەینەوە.

پێویستەلەسەر زۆرینەی روناکبیران و کەسایەتی و سیاسەتمەداران و رێکخراوەکانی کوردستانی هاوکار بێت بۆ ئەوەی سیستەمێک دامەزرێنین. بەرەو ئەو ئاستەیەهەنگاو بنێین کەگونجاو بێت . لەگەڵ ئەوبارودۆخەی دوای روخانی دیکتاتۆر سەدام حسین روو دەدات.

شەقامی کوردی گەیشتەئەو باوەڕەلەساڵی داهاتوی 2003،هێرشی ئەمریکا بۆسەر عێراق دەست پێدەکات. چاوەڕوان بوین لەسیاسەتمەداری کوردی بەناو بانگ بەڕێز مامەگیان سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان و جێی باوەر و متمانەی زۆرینەی دانیشتوانی کوردسیتانی گەورەیەکەئەم دوو داواکاریەی گەلی کورد جێبەجێ بکات.

خەڵکانێک لەرۆشنبیر و نیشتمان پەروەر و کەسایەتی و سیاسەتمەداران و هاوڵاتیان چاوەڕوانن لەشەخسی مامەگیان کەکاتی ئەوەهاتوەو ئەو کاتەی ئەمریکا هێرشی هێنایەسەر رژێم، بەئاگاداری ئەمریکایەکێتی نیشتمانی کوردستان و جەماوەر هێرش ببەنەسەر سەرپەرش لەپێناو دەستگیر کردنی مەسعود و نێچیرڤان،وەجیهە،سواد،نهاد،دڵشاد و مستەفا یەکسەر رەوانەی دادگا بکرێن بەو تاوانانەی کەدژی گەلی کورد ئەنجامیان داوەلەساڵی 1959 کەمەلا مستەفا بارزانی گەڕایەوەعێراق تاکو ساڵی 2003 کەدیکتاتۆر روخا.
هەزاران شاهید ئامادەدەبێت رۆژانی دادگایی دەکرێن ، بەندەیەکێک دەبم لەو شاهیدانەرووبەڕوو سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکەم.

یەکەم: بەپیلانی شەخسی مەلا مستەفا بارزانی و دیکتاتور عەبدولسەلام عارف ئەو دوو بەرەکییەدروست بوو لەساڵی 1964،بارزانی بەئاگاداری حکومەتی دیکتاتور عەبدولسەلام عارف ئەوەبوو هێرشی بردەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان.

دووەم: بەفەرمانی مەلا مستەفا هاوسەری کورەگەورەکەی عبیداڵلیان لەگەڵ کورەساواکەی تیروریان کرد و گۆری نییە.

سێهەم : یەکەم پێشمەرگەی (ژن) لەشۆرشی ئەیلول ساڵی 1961 دا خوشکەمارگرێت بوو.

لەسەر داواکردنی حەمایل خان بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی ئەوەبوو مارگرێت تیرور کرا.

چوارەم : لەسەران سەری جیهاندا بەپێی یاسا ژنی بەمێردی خاوەن منداڵ بەشوودانی قەدەغەیە،چەند جار مەلا مستەفا داوا لەژنانی خاوەن منداڵ دەکات کەشوو بەپاسەوانەکەی بکەن.

هیچ یەکێکیان ئەمەپەسەند ناکات،مەلا مستەفا لەحاجی ئومەران لەگەڵ ژنێکی خاوەن منداڵ بەگرژی قسەی لەگەڵدا دەکات کەئەبێت داواکارییەکەم جێبەجێ بکەیت.

ژنەکەروو دەکاتەمەلا مستەفا دەڵێت مادام ئەو پاسەوانەی خۆت ئەوەندەخۆش دەوێت بۆچی ژنەکەی خۆتی پێشکەش ناکەیت.مەلا مستەفا یەکسەر بریاری تیرۆرکردنی دەدات و دەڵێت: برۆن هەر ئێستا کەبیکوژن.

پێنجەم: کەمەلا مستەفا ساڵی1958 گەرایەوەعێراق لەبەغدا لەمیوانخانەی سمیرامیس بوو مقدارێکی زۆری سکەی ئێرانی دامێن کەلەجێگایەک بیگۆرمەوە بە دیناری عێراقی.کەسەرفی سکە ئێرانیەکەیان کرد،گوتیان ئەم سکەیەلەساڵی 1947 بەتاڵکراوەتەوە.پازدەساڵ ئەو پارەیەت بۆ دەست بەسەردا گرتبوو،بنەماڵەی شێخانی بارزانی کەپارەهاتەگیرفانیان،دەرنایەتەوەقەت.

شەشەم: لەساڵی 1964وەبنەماڵەی شێخانی بارزانی دەستیان بەسەسەروەت و سامان و خەزێنەی کوردستان داگیرکردوەتاکو روخانی دیکتاتور سەدام حسین ساڵی 2003.

ئەو سەروەت و سامانەمقداری چەندها ملیارد دولاری ئەمریکیەدابەش کراوەلەبانکەکانی جیهاندا،وەچەندەها کومپانایان هەیەلەتورکیا و بەشداریان کردوەلەکومپانیەکانی ئەمریکی و جیهانی.

هەموو سەروەت و سامانیان دەستی بەسەردا بگیرێت و تەسلیم بەخەزێنەی کوردستان بکرێت.

پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرەتای دامەزراندنیەوەروو بەرووی داگیرکەرانی کوردستان راوەستاوەو مێژوو کلتورێکی گەش بینی هەیە.شایانی باسکردنەلەهەموو رووێکەوەو دەستی نەخستوەتەناودەستی دوژمن،خاڵی رەش بینی لەپارتی دا نییە،مێژوو شاهیدی حاڵە. توشی هیچ کێشەیەکی ناو خۆ نەبووە،هەر گرفتێک هاتبێتەپێش بەدیالوگ جێبەجێ کراوە.

بەداخەوەکەلەساڵی 1964وەکەبنەماڵەی شێخانی بارزانی دەستیان بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستان دا گرت بەتەواوەتی بریار و فەرمان و پیلان و ستراتیژیەتی و سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەو گرێبەستی و سەروەت و سامان و پلە،کەوتەدەست بنەماڵەی شێخانی بارزانی.

هەرچەندەپارتی هەیەبەڵام بەناو سکرتێر و مەکتەبی سیاسی و لێژنەی ناوەندی و هەموو دەزگاکانی هەر هەمووی هەیەبەڵام هیچ دەسەڵاتێکیان لەدەستدا نییە.فەرمانی لەدەست مەسعود و نێچیرڤان و سواد و نهاد و وجیەدایەو دەربارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی ناو خۆی پارتی دیموکراتی کوردستان،دوای کۆتایی دەسەڵاتی بنەماڵەی شێخانی بارزانی و نەمانیان،بەدیالۆگ کونفرانس دەبەستن ، زۆر بەسانایی کێشەی ناوخۆیی حیزب جێبەجێ دەبێت.

2/ گەلی کورد بەگشتی ئاواتی دامەزراندنی حکومەتی کوردستانە،دوای هێرشەکەی ئەمریکا و روخانی دیکتاتوری سەدام حسین.

شقلمی کوردی چاوەڕوانەلەمامەگیان بڕیاری دامەزراندنی حکومەتی کوردی بدات.ئەگەر تەماشای مێژووی رابردو بکەین:

5000 هەزار ساڵ پێش ئێستاکەیەکەم حکومەت لەجیهاندا دامەزرا،2150 ساڵ پێش ئێستاکەیەکەم حکومەتی کوردی دامەزراوەبەناوی حکومەتی " ماد " دوا بەدوای روخانی حکومەتی ماد چەندەها ئیماراتی کوردی لەسەران سەری کوردستان دامەزراوەو دوو حکومەتیش دامەزراوە.

1919 شێخ مەحمودی نەمر حکومەتی کوردی دامەزراند لەکوردستانی باشور ،پایتەختەکەی شاری سلێمانی بوو.

1946 پێشەوا قازی موحەمەد کۆماری کوردی دامەزراند لەکوردستانی رۆژ هەڵات،پایتەختی شاری مەهاباد بوو.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن و بۆ شەخسی جورج بوش سەرۆکی یەکگرتوی ئەمریکا ئێمەی گەلی کوردی ئازاد کرد دوای هەشتاد ساڵ لەچنگی کۆنەپەرست و شۆڤێنی و نژادپەرستی عەرەب.ئەوەبوو کوردستانی باشور بەتەواوەتی ئازاد و سەربەست بوو کەوتەوەژێر دەسەڵاتی خاوەن ماف.

سوپاس بۆ بەرێز جەلال تاڵەبانی سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەئەو پیلان و عەقل و حکمەتەی کەئەنجامیدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان شان بەشانی سوپای ئەمریکی بەشداریان لەجەنگ بۆ رووخانی دیکتاتۆر سەدام حسین کرد.

هەڵسەنگاندنی بارودۆخی مانگی 3ی ساڵی 2003 : ئەوکاتەهیچ سەرۆک کۆمارێک و رێکخراوێکی سیاسی لەرۆژهەڵاتی ناوەراست هێزی جەماوەری بەقەدەر رێژەی شەخسی جەلال تاڵەبانی نەبوو،ئەگەر ئەوکاتەخۆی کاندیت کردبایەبۆ سەرۆک کۆماری کوردستانی گەورەبەمەرجێک هەڵبژارن لەکەش و هەوایەکی ئازاد و دیموکرات کرابایە،لەژێر چاودێری نەتەوەیەکگرتوەکان،لەو 42 ملیۆن کوردەنزیکەی 40 ملیۆن کورد دەنگیان دەدا بەجەلال تاڵەبانی کەببێتەسەرۆک کۆماری کوردستانی گەورە.

هەستی نەتەوایەتی و باوڕ و متمانەئەوەندەبەجۆش بوو ،گەلی کورد ئامادەبوو لە% فەرمانی شەخسی جەلال تاڵەبانی جێبەجێ بکات.

تێبینی : لەرێگای خزمێکی روناکبیر و نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەداری کوردێکی ناسراو دوکتۆر جەمیل عەبدولرەحمان شەرەف، لەشاری کەرکوک لەساڵی 1952 بەندەو جەلال تاڵەبانی یەکترمان ناسی ،جێی باوڕ و متمانەی یەکتری بوین و شارەزایەکی تەواوی یەکترمان هەبوو.لەهەڵوێست و بیر و بۆچونمان چۆنیەتی چارسەرکردنی کێشەی کورد،کوردستان یەک پارچەیەلەنێوان تورک و فارس و عەرەب دابەشکراوە،بۆ لەساڵی 1964 هەردوکمان گەیشتینەئەو باوەڕەهەتاکو بنەماڵەی شێخانی بارزانی لەوجود مابن ناهێڵن حکومەتی کوردی دامەزرێت و کێشەی کورد جێبەجێ ناکرێت و هەمیشەهەڵواسراو دەمێنێت. ماوەی زیاد لە چەندەها ساڵ بەنهێنی و ئاشکرا کار و باری سیاسیمان بەیەکەوەئەنجام دەدا.جار و بار شک و گومانم لێدەکرد کە لە 15% کەبۆ بەرژەوەندی تایبەتی خودی شەخسی بازرگانیەتی بەکوردەوەدەکات.ماوەی 50 ساڵەکوردایەتی دەکات و ماوەی 28 ساڵەهەموو پیلان و ستراتیژێکی دامەزراندنی حکومەتی کوردیە.

راستی رابردوی جێی شانازیە، مێژویەکی گەش بینی هەیەتاکو ساڵی 1993،لەساڵی 1994وەبەهۆی ململانێی لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بارزانی کەبەپیلان و ستراتیژیەتی دەزگای میتی تورکی و ئیتلاعاتی ئێرانی ئامادەکرابوو،ئەوەبوو جەلال تاڵەبانی ناچار کرد لەپێناوی مانەوەی خۆیاندا پەیوەندی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا بەهێز بکات .هاوڵاتی باوڕ و متمانەی جارێ مابوو بەجەلال تاڵەبانی. لەسەرەتای ساڵی 2003 چاوەڕوان بووم لەشەخسی جەلال تاڵەبانی بۆ بەرژەوەندی کورد و کوردستان و بەتایبەتی شەخسی خۆی و حیزبەکەی ئەم سێ خاڵەگرینەلەگەڵ روخانی رژیمی دیکتاتۆر سەدام حسین ئەنجام بدات. " کوردستانی باشور پاک کرێتەوە، پەیوەندی بەدەزگای میت و ئیتلاعات یەکسەر بپسێنێت،وەکش و مەڵێک بەبنەماڵەی شێخانی بارزانی بکات،ئینجا ژێرخانی کوردی و یەکێتی لەناو ریزەکانی کوردستانی یەک خات" . چونکی ئەوەندەخودی شەخسی بەرێز جەلال تاڵەبانی شارەزایی هەیەدەربارەی بنامالەی شێخانی بارزانی،هیچ هاولاتیێکی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەئەوەندەی شارەزایی نییە.

بنماڵەی شێخانی بارزانی و هەڵوێستی جەلال تاڵەبانی بەرامبەریان:

بنماڵەیەکی خێڵەکین، باوەڕیان بەئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤ نییە.هەمیشەکۆسپ بونەبەرامبەر دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی.پیاو کوژن،وڵات تاڵان دەکەن،جگەلەخۆیان کەس نابێت بازرگانی بکات. جگەلەخۆیان،کەس بۆی نییەبریار لەسەر چارەنوسی گەلی کورد بدات. بۆ نمونە: 1. لەکۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان کەلەساڵی 1959 کەلەباغدا بەسترا، کەمەلامستەفا سەرۆکی پارتی بوو ،وتاری پێشکەش ئامادەبووان کرد.دەڵێت : من سەرۆکی گەواد و حیز نابم.

مامۆستا حلمی عەلی شەریف دەڵێت: ئەوەبەو جۆرەسوکایەتی بەمن بکات ،منیش بەگەورەی خۆمی نازانم.هەر هەموو ئامادەبووان بێدەنگ دەبن لەئاستقسەکەی بارزانی بەڵام مام جەلال ئینجا زیاتر خۆی نزیک دەکاتەوەلەمەلا مستەفا.2. مەلا مستەفا بارزانی بەبێ ئەوەی ئاگاداری مەکتەبی سیاسی بکات بەنهێنی پێوەندی بەحەوت سەرۆک هۆزەکانەوەدەکاتبۆ ئەوەی ،هەر یەک ژمارەیەک چەکدار بڵاو کەنەوەلەنێوان شارەکانپرشنگا دابنێن .

سوپا هێرشی بردەسەر چەکدارەکان ،هەر هەموویان رایان کرد.مەلا مستەفا بارزانیش قوچاندی رایکرد چوەسەر سنوری تورکیا لا ناوچەی برواری باڵا.

مەلا مستەفا بارزانی دوو نوسراوەئاراستەی حکومەتی تورکیا و حکومەتی سوریا دەکات و داوایان لێدەکات بەپەنابەر وەری بگرن.بەپەلەمەکتەبی سیاسی لەسەر داواکردنی جەلال تاڵەبانی دوو لەئەندامانی خۆیان گەیاندەلای مەلا مستەفا بارزانی نەیانهێشت سوک و رسوا و دەربەدەر بێت لەهەندەرا،ئەوەبوو گەرایەوە.

3/ لەکاتێکدا حیزب ئامادەگیەکی تێدا نەبوو، جەلال تاڵەبانی حیزبی ناچار کرد بڕیاری شۆڕش بدات.

لەساڵی 1961 شۆڕش هەڵگیرسا ،دوای دوو ساڵ بەپیلانی حکومەت ومەلا مستەفا دوو بەرەکی خستەناو شۆڕش.مەلا مستەفا بەئاگاداری حکومەتی دیکتاتۆر عەبدولسەلام عارف هێرشی کردەسەر بارەگای مەکتەبی سیاسی لەساڵی 1964 ناچار بوون رایان کردەئێران.

4/ لەساڵی 1965 جەلال تاڵەبانی و جەماعەت هاتنەوەلای مەلا مستەفا .

5/ لەساڵی 1966 جەلال تاڵەبانی و عمەر مستەفا و عەلی عەسکەری و حلمی عەلی شەریف، هاتنەوەبەغداد ،دژی مەلا مستەفا لەگەڵ حکەمەتی عەبدولرەحمان عارف رێککەوتن.

6/ کەئازاری ساڵی 1970 رێکەوتن لەنێوان مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حسین دا ،جەلال تاڵەبانی و جەماعەتەکەی بەناچاری خۆیان تەسلیم بەمەلا مستەفا بارزانی کردەوە،هەمو رێگایەک داخرا بەرامبەر باڵی مەکتەبی سیاسی و جەماعەتی جەلال تاڵەبانی..

دوای کۆبونەوەی دووقۆڵی داخراو لەنێوان مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حسین لەناو بەردان،ئەوەبوو دوای گەڕانەوەی سەدام حسین یەکسەر هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرامبەر باڵی مەکتەبی سیاسی " جەماعەتی جەلال تاڵەبانی بەپەلە گۆرانی بەسەردا هات و بەتەنها مانەوە.ئاگاداری جەلال تاڵەبانیم کرد کەسەدام وتی : بەجەلال بڵێ ئێمەلەناو کورد تەنها یەک برادەرمان هەیە وئەویش دەناسین ،بانی مەلا مستەفا بارزانیە،رەفیق پشدەری رێگا کراوەیە.

جەلال تاڵەبانی کەرۆیشتەوەبەر دەستی مەلا مستەفا بارزانیەهەموو توانا و قورسایی خۆی خستەپاڵ شۆڕش،بەڵام لەرێگای بەندەوەپێوەندی هەر مایەوەلەگەڵ حکومەتی دیکتاتۆر سەدام حسین.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری هیچ پێوەندیەکیان بەحکومەتەوەنەمابوو.

دوای تێپەر بوونی دوو ساڵ بەسەر رێکەوتنی 11 ئازار ساڵی 1970 پێوەندی نێوان سەرۆک مەلا مستەفا بارزانی و حکومەتی ئێران و ئیسرائیل رۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبوو.

مەلا مستەفا بارزانی بەهۆی شەخسی شای ئێران دیداری کیسنجەر ،وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ی لەتاران کرد.بەم چاوپێکەوتنەمەلا مستەفا غرور بوو. دوابەدوای ئەو پێوەندیەیەکسەر لەنێوان بنەماڵەی شێخانی بارزانی و دەستگای هەواڵگری ئەمریکی CIA بەست بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ،دوای چوارساڵ تێپەڕ بوون بەسەر بەیانی 11 ئازار بەپیلانی دارێژراوی شا ی ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل ،شەڕ هەڵگیرسایەوەلەنێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشی ئەیلول بەرابەرایەتی سەرۆک مەلا مستەفا بارزانی.

بەپیلانی حکومەتی ئێران و ئیسرائیل و غەروری و نەزانینی سەرکردایەتی حیزبی بەعس،جۆری شەڕەکەزۆر گەورەبوو، لەنێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراق.

سەرۆک مستەفا بارزانی هەموو هێز و توانا و قورسایی شۆڕشی ئەیلولی بەتەواوەتی خستەژێر دەسەڵاتی شەخسی شای ئێران.

ئاگادار کرام جەلال تاڵەبانی لەکات و سەعات چاوەڕوانمانەلوبنان،جەلال تاڵەبانی وتی: ئیبراهیم ئەحمەد لەرگای ئەم کاسێتەپەیامێکی بۆ ناردویت.

دەفەرموێت: رەفیق ،ئێران دەسەڵاتی بەسەر شۆڕشەکەدا بەتەواوەتی گرتوەبارودۆخەکەئێجگار زۆر ترسناکەلەبەرژەوەندی کورددا نییە.هەموو توانای خۆت بخەگەڕ و بەکاری بهێنەلەپێناو ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بێت لەنێوان گەلی کورد و حکومەت،بۆ ئەوەی شۆڕشەکەلەژێر چنگی شا بێتەدەرێ.هەموو هەوڵێکم بەکار هێنا.

لەسەر داواکردنی بەندەلەپێناو بەرژەوەندی گەلی کورد داوام لەکاک مەسعود کردبوو،بۆ ئەوەبوو چەند دیکۆمێنتێکی گرنگی دەربارەی جۆری چەکی تازەکەگەیشتەبارەگای سەرکردایەتی و هەروەها دەربارەی هێز و توانای سەرکردایەتی لەناوەوەو دەرەوەی بۆ ئاراستەکردبووم،نهێنی بوو جارێ بڵاو نەکرابوەوە.

پێشکەش سەرکردایەتی حیزبی بەعسم کرد،گفت و گۆی زۆر لەسەر کرا،گەیشتنەئەو باوەڕەبەجەنگ کۆتایی بەم شەڕەخوێنناییە ناهێنێت و بەردەوامی لەبەرژەوەندی حیزبی بەعس دا نییە.

دوو رێگا بۆ چارەسەرکردنی ئەم جەنگەی بەرپا بووەلەبەردەستی سەرکردایەتی حزبی بەعسدا بوو: 1. کۆبونەوەو رێک کەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی کورد بۆ سنوری جوگرافی و ئوتونۆمی بەم جورەدەبێت، خانەقین،سلێمانی،کەرکوک،دهۆک،شێخان.

2/ حکومەتی ئێران داوای شەتولعەرەب دەکات.

سەرۆک مەلا مستەفا بارزانی بەتەواوەتی هەموو هێز و توانا و قورسایی شۆڕشی ئەیلولی خستەژێر دەسەڵاتی شەخسی شاە.

ئاگاداری کاک مەسعود بارزانیم کرد پێش رێکەوتنەکەی جەزایر کەلەنێوان شەخسی سەدام و شای ئێران بەنهێنی گفوگۆ هەیەو رێکەوتون و تەنیا هەندێک وردەکاری ماوە.رێکەوتنەکەکۆتایی هێنانەبەشۆڕشی کورد بەیەکجاری.راپۆرتەکەم سێجار خوێندوەتەوەبۆ کاک حەمە،لەو شەش هاورێیانەی کەراپۆرتەکانی بەندەی تەسلیم بەکاک مەسعود دەکرد،شاهید حاڵ یەکێک لەژیاندا ماوە،ناوی ئەو بەرێزمحەمەی وەلی حەمەی کەرەمە.کە لەدەربەندیخانە، بەدور و درژی بەقسەئاگاداری کاک مەسعود دەکات.وەڵامەکەی بەرێز کاک مەسعود بارزانی: شۆڕشەکەمان زۆر بەهێزو توانایەلەهەموو بوارێکەوە پێشمەرگە،جۆری چەک،زەخیرە،خۆراک،رێکەوتنی نێوان سەدام و شاهیچ پێوەندیێکی بەشۆڕشەوەنییەوهیچ بایەخێک بەم رێکەوتنەنادەین،بڕیار وفەرمان لەهیچ حکومەتێک وەرناگرین چونکی ئێمەسەربەخۆین.لەناوچەیێکی کوردستانی ئازاد ژیان دەبەینەسەر.سوپاسی ئاگاداریەکەت دەکەین.تکایەهیچ مەترسیێکت لا دروست نەبێت. کۆبونەوەکەی سەدام حسین و شای ئێران لەجەزایر و ریکەوتنەکەیان بەپیلانێکی ستراتیژی دارێژراو بوو، لەلایەن حکومەتەکانی ئەمریکا و ئێران و عێراق و تورکیا و بەئاگاداری ئیسرائیل لەپێناوی هەرەس هێنان بەشۆڕشی ئەیلول.

لەبرواری 1975/2/11 دا شای ئێران بەمەلا مستەفای بارزانی سەرکردەیزوتنەوەی کوردی راگەیاند لەسەر رێکەوتنەکەی جەزایر.

خەڵکی کوردستان بەگشتی چاوەڕوان بوون لەمەلا مستەفای بارزانی لەئاست ئەوبڕیارەی شای ئێران هەڵوێست دەرببڕێت.

لەبرواری 2/12 1975 مەلا مستەفا و د.مەحمود عەلی عوسمان و شەفیق قەزاز لەگەڵ شای ئێران کۆدەبنەوە. لێرەدا هەڵوێستی بارزانی لەئاست مەسەلەی کورد لەو قسەیەدا لەبەردەم شای ئێران دەردەبڕێ کاتێک گوتی:

سەروەرم شای ئێران،ئێمەگەلی تۆین ،مادام تۆ بەرێکەوتننامەی جەزایر رازیت و لەو رێگەوبەرژەوەندیەکانی ئێرانی نیشتمانمان بەدی دێنیت ،ئەوەئێمەدژایەتی ئەو بڕیارەناکەین،بەڵکو دەستەو ئەژەر لەخزمەتتداین،بڵێیت بمرن ئەمرین،ئێمەئەوسا و ئیستاش دڵسۆزی تۆیین.لەداهاتوشدا هەروا دەبین.هیوادارین سۆز و چاودێریتان لەسەر خۆمان و کێشەکەمان هەمیشەبەردەوام بێت.

ئەم سێ نیشتمان پەروەرەو شۆڕشگێڕ و سیاسەتوانانەی کوردی بەناوبانگەکەناماژەم پێدا:

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و عمەر مستەفا ناسراو بەعەمر دەبابەو عەلی عەسکەری لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی کۆدەبنەوەلەدانیشتنێکی داخراودا گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەن لەسەعات 8ی ئێوارەتا کو 4ی بەیانی.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەکۆبونەوەکەدا دەڵێت:

بەرپرسی و سەرکردایەتی شۆڕش لەئەستۆ بگرین و ئێوەدەتوانن مەرجی ئەوەدابنێن کەهەمو شتێک لەژێر ناوی بارزانیدابێت و بەرێزتان دەبینی کەچۆن دوای کەمتر لەدوو ساڵ ئەم شۆڕشەچەکداریەلەشەڕی پارتیزانیەوەلەچیاکان دەکەین بەمەزنترین شۆڕشی چەکداری کەکۆنترۆڵی هەموو ناوچەکەبکات.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەردەوام بۆی شی دەکاتەوەدەربارەی ئایندەی ئەو شۆڕشەی کەباسی دەکات.. دوای ئەوەی چەند خولەکێک بارزانی بێ دەنگ دەبێت،مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دووبارەرێچکەی ئەو بێدەنگیەدەشکێنێت و دەڵێت:

ئەگەر لەسەر بۆچونی خۆتان سورن و قەناعەتتان بەقسەکانی من نییە، راوبۆچونێکی دیکەهەیەئەوەچۆنەبەلاتانەوەئەگەر رێگەی عەلی عەسکەری بدەن (400) پێشمەرگەی جەربەزەو جەنگاوەر بکات بۆ ئەوەی شۆڕش بەردەوام بێتبەشێوەی شەڕی پارتیزانی،بۆ ئەوەی رێگەنەدەین خوێنی شەهیدانی چەند ساڵەمان بەفیڕۆ بچێت.رەنگەبەیانی خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆ بێتەوە.دوایی باسی جەلال تاڵەبانی دەکات کەبەفەرمانی بەرێزتان لەئەوروپابۆ ئەوەی هەندێ ئەرکی شۆڕش لەدەرەوەرابەڕێنێت و کۆبونەوەی ئەو... مام جەلال پەیامێکی ناردوەکەچەندین سەردانی بۆ وڵاتانی دۆست کردوەو تیایدا ئەوەیان دەرخستوەکەئامادەن هەمو یارمەتییەکی مادی و سەربازی و پشتگیری سیاسی پێشکەش بەشۆڕشی کوردستان دەکەن،بەمەرجێک بارزانی بەردەوام بێت لەشۆڕشی چەکداری و ئەو فەرمانەهەڵوەشێنێتەوە.

مامۆستا ئبراهیم ئەحمەد دەڵێت: پێشمەرگەو خەڵکانی سیاسی چاوەڕوانی ئەو کۆبونەوەی ئێمە بوون کەبزانن بڕیاری بارزانی گەشبین دەبێت یان رەشبین.

مەلا مستەفای بارزانی دەڵێت وڵامتان دەدەمەوە.

لەساڵی 1981 کەلە لەندەن بووم، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و کاک عومەر دەبابە، ئەم باسەیان بەدوری ودرێژی بۆ باسکردم کەشتێکی نهێنی نییەو لەزۆر کتێبدا بڵاو کراوەتەوە. بۆ نمونە: کامیل عەتار کەسایەتێکی کوردی ناسراو، دوای ناشبەتاڵی شۆڕش گەڕایەوەعێراق دەربارەی ئەو رووداوە گرینگە قسەی کرد و وتی: زۆرینەی روناکبیران و پێشمەرگەو هاوڵاتیان چاوەڕوانی ئەو کۆبونەوەمێژوییەبوین تا بزانین وەڵامی مەلا مستەفا بارزانی چی دەبێت.

بەیانییەکەی کاتا شەو خەڵکێکی زۆر دەچنەلای مەلا مستەفا و دەربارەی کۆبونەوەکەدەپرسن ،لەوەڵامدا بەهەمویان دەڵێت : ئەو دووبەرەکییەی کەلەناو شۆڕش بەرپا بووەو ئەو بارودۆخەی کەئێستا بەرپا بووەهەر هەموی تاوانەکەی دەگەڕێتەوەبۆ بلەی کورتان درو و نومەر تەنەکەو جەلۆ.

وشەی نارەوا و ناشرین و نزمیان پێدەڵێت،سوکایەتیێکی زۆریان دەخاتەپاڵ.

مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەڕێوەبەرایەتی گشتی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی 1961.ئیدریس مەلا مستەفا بارزانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەڕێوەبەرایەتی پێشمەرگەی کوردستان و مەسعود مەلا مستەفا بارزانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەڕێوەبەرایەتی دەزگای هەواڵگری پاراستنی بارزانی؟

ئەوەبوو بنەماڵەی شێخانی بارزانی ئاشبەتاڵیان بەشۆڕشی ئەیلول کرد،دوای گەڕانەوەی لەتاران،بارزانی بڕیارەمێژوویەرەشەکەی لەچەند خاڵێکدا دەرکرد.

1/ تەسلیم بوون بەئیرادەی دوژمنانی گەلی کورد و کۆتایی هێنان بەشۆڕشی چەکداری کورد و دوایی هێنان بەخەباتی پارتی دیموکراتی کوردستان کەلەساڵی 1946 دامەزرا ،ئەوەبوو 1975 کۆتایی پێ هێنا.

2/ گواستنەوەی ماڵ و سامانی شۆڕش بۆ ئێران.

3/ دەمودەست بروسکەبۆ هەموو بارەگاکانی پێشمەرگەنارەستەدەکات کەهەرچی چەکی قورستان هەیەتا 1975/2/26 تێکوپێکی بدەن، ئینجا بەچەکەسوکەکانتانەوەخۆتان تەسلیم دەسەڵاتی ئێرانی بکەن و هەموو جۆرەچالاکییەک راگرن.

4/مەلا مستەفا بارزانی بەئاشکرا و نهێنی فەرمانی بەئیدریس و مەسعود دا کەهەموو فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن.بەردەوام بن لەدژی خەباتی چەکداری،راوەستانی تەقەلەکوردستاندا مسۆگەر بکات ،لەناوبردنی ئەوکەسانەی کەلەزیندانەکانی شۆڕشن، وەکو محەمەد ئاگای مێرگەسور و کورەکانی کەدەمودەست لەناویان بردن.

لەوکاتەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بڕیاری ئاشبەتاڵیان بەشۆڕش دا،لەوکاتەدا سەروەت و سامان و چەک و خۆراک بەم جۆرەبوو.

هەفتادهەزار(70000) پێشمەرگەهەبوو کەروو بەرووی سوپای بەعس لەجەنگدا راوەستا بوون و چۆکیان بەدوژمن دادابوو.

پێنج هەزار(5000) گوللەهاوەن و 15 ملیون فیشەکی کلانشیکۆف لەجبەخانەی شۆڕشدا بوو.

دووسەد و بیست و پێنج ملیون(225) دولار لەلەخەزێنەی شۆڕشدا بوو،ئەوەبوو بنەماڵەی شێخانی بارزانی دەستیان بەسەردا گرت.

خۆراک لەئارد و برنج و رۆن ،شەکر و چا و زەخیرەی پێنج هەتاکو شەش مانگ بەزیادەوەهەبوو.

دوای ئاشبەتاڵ خەڵک بوون بەسێ بەشەوە:

1/ بەشێکیان لەئێران مانەوەبەتایبەتی کادر و ئەندامانی دەزگای پاراستن،ئەویش لەبەر ئەوەی کەبنەماڵەی شێخانی بارزانی لەئێران مانەوە.بنەماڵەی بارزانیش لەبەر ئەوەی کەئازار و ئەشکەنجەی خەڵکانێک لەهاوڵاتیانیان دابوو.

2/ ژمارەیەکی زۆر رووی لەئەوروپا و سوریا کرد.

3/ ژمارەیەکی زۆریان گەڕانەوەبۆ عێراق،لەکاتێکدا زۆربەی ئەوخێزانانەکەدەگەڕانەوەپارەی ژیانی یەک رۆژیان لەگیرفاندا نەبوو.

کورتەیەک دەربارەی ئەو خەڵکانەی کەلەئێران مانەوە:

ئیدریس و مەسعود دەستیان کرد بەرێکخستنەوەی ریزەکانی پارتی و سەرپەرشتی پێشمەرگەکان بەبێ ئەوەی لەدەستەڵاتدارانی ئێرانی بترسن،پێوەندی لەنێوانیاندا دروست بکەن.

دەزگای ساواک هەموو ئەو ئەندامانەی گرت کەسەرقاڵی رێکخستنەوەی پێشمەرگەو رێکخراوی پارتی بوون.ئیدریس و مەسعود خۆیان بێدەنگ کرد.

دەستەڵاتدارانی ئێران کەوتنەلێکتر دوورخستنیان و بەزۆر لەشار و شارۆچکەو گوندی دووردا نیشتەجێیان کردن بێ ئەوەی ئیدریس و مەسعود هیچیان بۆ بکرێت.دەزگای ساواک بەزۆری، کادیرانی پارتی ڕەوانەی ناوچەفارس و تورک نشینەکان دەکرد.پاشان حکومەتی ئێران کەوتەسوکایەتی کردن بەکورد کەتەنانەت خودی بنەماڵەی بارزانیشی بەرکەوت.ئاماژەم پێداوەکەسەرداریەگی جاف قسەی بۆ کردوم.بەڵام سەبارەت ئەوانەی گەڕانەوەبۆ عێراق بەژیانی سەرشۆری لەسایەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی و ساواکی ئێران ڕازی نەبوون.هەروەها سەریان بۆ ڕێبەرایەتی ناسیۆنی عێراق نەوی نەکرد.هەزار سڵاو و ستایش بۆ خۆڕاگرییان،بۆ ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەی هاتەرێگایان.

دامەزراندن و ڕێکخستنی ئاگری شۆڕشی نوێ دوای ئاشبەتاڵ بەماوەیەکی کەم هەڵگیرسایەوە.لەو قۆناغەدا لەلایەن چەند کوردێکی روناکبیر و نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەدار،بەسەرکردایەتی بەرێز مام جەلال لەو رۆژگارسەختەدا بەرەنگاری کردنێک بوو دژی ئیرادەی شەخسی شای ئێران و دیکتاتۆر سەدام حسین.جێگری سەرۆک کۆماری عێراق و حکومەتی تورکیا .

بنەماڵەی شێخانی بارزان یەک سەر کەوتنەجموجۆڵکردن و بایەخێکی زۆریان پێدا کەجەلال تاڵەبانی هێزێکی سیاسی دامەزراندوە.گەیشتنەئەوباوەڕەبۆ جارێکی کەگەڕانەوەسەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستان.ئەم سێ تاوانبارەکەئاشبەتاڵیان بەشۆڕشی ئەیلول کرد( مەلا مستەفا و ئیدریس و مەسعود) کۆدەبنەوەو پیلانێکی ستراتیژی دادەڕێژن لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆیان.بڕیار دەدەن کەبەم جۆرەهەڵوێست بەرامبەر ئەو بارودۆخەکەڕونمکردوەتەوەلەو هەشت خاڵانەی خوارەوەدابگرن.

1/ یەکەم هەنگاو بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان خۆشحاڵی خۆیان ئاشکرا دەکەن و گەشبین دەبن .دەستەدەکەن بەپروپاگەندەیەکی ئێجگار زۆر دوور لەراستی بەئاشکرا و نهێنی ،بەراشکاوی لەبەرژەوەندی شەخسی جەلال تاڵەبانی کەلەگەڵ خەڵکانێکی روناکبیر و شۆڕشگێڕ و سیاسەتمەدارانی کوردی بەناوبانگ لەناوەوەو دەرەوەی کوردستان حیزبێکی سیاسی دامەزراندوەبەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

بەهۆی ئەوەی مەلا مستەفای بارزانی لەسەر فەرمانی شای ئێران هەرسی بەشۆڕش هێنا،گۆڕەپانەکەبەتاڵە لەو بارودۆخە زۆرینەی کادرانی پارتی و ئەندامان و پێشمەرگەکانی دەچنەپاڵ یەکێتی.هەروەها هاوڵاتیانی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەلەهەموو بوارێکەوەکۆمەک و یارمەتی پیشکەش بەجەلال دەکەن.

بنەماڵەی بارزانی سەرەتا بەبڕیار و ئاگاداری ئەوان،خەڵکانێکی زۆر پێوەندی بەیەکێتی نیشتمانی کوردستان کرد. حیزبەکەی جەلال تاڵەبانی گەلێک بەهێز و توانا دەبێت و گەورەترین شۆڕش دەبێت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست ،لەشۆڕشەکەی بارزانی لەزۆر بارەوەبەهێز و توانا و ئازاد و سەربەخۆ تر دەبێت.

2/ئەوەی کەلەسەرەوەئاماژەم پێداوە،بنەماڵەی شێخانی بارزانی سەد ئەوەندەلەو جۆرەپروپاگەندەیان لەرێگای چەند کەناڵێکەوەلەناو دەستگای ساواک و ناو سوپای ئێران بڵاو کردەوەلەپێناو ئەوەی حکومەتی شا بەیەخ بداتەجەلال تاڵەبانی کەخەتەرێکی گەورەدروست دەکات لەسەر حکومەتی ئێران و هەروەها عێراق و تورکیاش.

لەکاتێکدا ئەو پرۆپاگەندەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بڵاویان کردەوەبەشی هەرەزۆری لەراستی دوور بوو.تەنها ئەوەیان راست کرد کەشەخسی جەلال تاڵەبانی باوەڕی وابوو کەگەش بینی و پشتگیری دەکەن و دژایەتی ناکەن.

3/ خۆش باوەڕیەکەی مام جەلال بەبنەماڵەی بارزانی،ئەوەبوو دەزگای ساواک داوای لەبنەماڵەی شێخانی بارزانی کرد کەلەسەر فەرمانی شای ئێران حیزبی پارتی دامەزرێننەوە.پرسیار ئایا چۆن ئەوەبەسەر مام جەلال تێپەڕ بوو؟

4/ بنەماڵەی شێخانی بارزانی کەبڕیاریان دا ئاشبەتاڵ بەشۆڕش بکەن،تەنها مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و نوەر نستەفا و عەلی عەسکەری بۆ ئەم مەبەستەلەگەڵ مەلا مستەفا وتووێژ دەکەن.ئەوەبوو بارزانی ئامۆژگاریکانی پەسەند نەکرد.

ئیدریس مەلامستەفای بارزانی بەیانیەکەی ئەو شەکرەی شکاند وتی:

ئەگەر ئێمەشۆڕشمان پێنەکرێت،هەر شۆڕشێک بەرپا بێت بەبێ ئاگاداری ئێمە،توانای ئەوەمان دەبێت لەناوی بەرین.ئەمەپەیامێک بوو بۆ عەلی عەسکەری و حومەر مستەفا و ئیبراهیم ئەحمەد،کەرۆژێک لە رۆژان ئەو هەڵەیەبکەن بەبێ ئاگاداری ئێمەشۆڕش بەرپا بکەن دەی روخێنین.

5/ ئەخشەیەکی گونجاویان ئامادەکردبوو لەپێناو چارسەرکردنی رابردو و سڕینەوەی تاوانەکانیان کەدژی گەلی کوردیان ئەنجام دابوو.

پرۆگرام و هەڵوێست و بیر و بۆچونیان لەگەڵ ئەو بارودۆخەی ئێستاکەیەک بگرێتەوەلەبەرژەوەندی گەلی کوردا دەبێت.

گرینگ ئەوەیەهەموو ئەوخەڵکانەی کۆبونەوەیان لەگەڵدا دەکەین،چ بەتەنها یان بەکۆمەڵ باوەڕیان بەقسەکانمان بێت و بگەڕێنەوەریزی حیزبەکەیان.یەکەم جار لەئێرانەوەدەست بەچاوپێکەوتن و کۆبوونەوەدەکەن.

ئێمەدان بەوەدا دەنێین و رەخنەو گلەیی لەخودی خۆمان دەکەین ئەوەی رویدا رویدا،هەرهەموو تاوانەکانی دەگەڕێتەوەسەر ئێمە.هەروەکو ئاگادارن شۆڕشکەمان خستەژێردەسەڵاتی خۆمان.

لەپێنج هەزار پێشمەرگەژمارەمان گەیشتەهەفتاد هەزار پێشمەرگە. پێنسەد هەزار هاوڵاتی لەژێر چاودێری شۆڕش بەئازادی و سەربەستی ژیانیان دەبردەسەر.ژمارەی هاوڵاتیان گەیشتەیەک ملیون لەژێر چاوەدێری شۆڕش بەئازادی و سەربەستی دەژیان.لەشەڕی پارتیزانیەوەشۆڕشەکەمان توشی جەنگی جبهەو رووبەڕو بوینەوەلەگەڵ حکومەتی عێراق،ئێوەئاگادارن جەنگەکەئەوەندەگەورەبوو ئێمەی ناچار کرد پەنا بۆ شای ئێران بەرین،لەپێناو پارێزگاری خۆمان و تاکو بتوانین بەرامبەر هێز و توانای حکومەت راوەستین.

کۆبونەوەکەی شای ئێران و سەدام حسین و رێکەوتنامەکەیان لەجەزایر،کەشای ئێران ئاگاداری کردین دەربارەی رێکەوتنەکەی لەگەڵ سەدام حسین،هەڵوێستی بەپلەی 180 دەرەجەگۆڕابو بەرامبەر بەشۆڕش.کتوپڕ ئەو هەواڵەناڕەوایەرووبەڕوی ئێمەبوەوەلەکاتێکدا خۆمان ئامادەنەکردبوو بۆ شتی وا و لەئەجەندەی خۆمان حیسابمان بۆ نەکردبوو.ئینجا دانمان بەتاوانی خۆماندا نا کەهەموو قورسایی شۆڕش و چۆنیەتی چارسەرکردنی ئەو بارودۆخەخەتەرناکەشمان بەتەنها خستبوەسەر شانی خۆمان .

کۆبونەوەمان لەسەرئەوبارودۆخەکرد ،دوو رێگامان لەبەر بوو:

یەکەم: شۆڕش بەردەوام بێت رووبەڕوی دوژمن راوەستین.سەرەتا سوپای عێراق و ئێران لەئاسمان و زەوی هێرشمان دەکەنەسەر،دوای ماوەیەکی کورت سوپای تورکیاش بەشداری ئەوجەنگەدەکات.هاوڵاتیان توشی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبن .ژمارەی کوژراوان دەگاتەهەزاران،پێشمەرگەبەرامبەر ئەوجەنگەرادەوەستێت،بەڵام کێشەکەمان ئەک ملێۆن هاوڵاتی لەسنوری شۆڕشدا ژیان دەباتەسەر.

دووهەم: لەپێناو سلامەتی هاوڵاتیان ئەوەبوو ئەو بڕیارەمان دا کەهەرەسمان بەشۆڕش هێنا.

6/ ئێمەبەجەنگ شۆڕشمان نەدۆڕاند،بارودۆخێکی سیاسی ناچاری کردین کەئەو رێگایەمان گرتەبەر لەپێناو بەرژەوەندی و سلامەتی ژیانی هاوڵاتیان و هەر هەمووەمان .دوای ئەو روداوەبەشێکی ئێوەن کەلەئێران دەژین و خەڵکانێک روویان کردەعێراق،خەڵکانێکیش روویان کردەئەوروپا . ئێوەکەلێرەدەژین دەتوانن رۆڵێکی گەورەببینن لەپێناوی خوێنی شەهیدان.

7/ بارودۆخەکەلەبەرژەوەندی گەلی کوردەئێستا،کتوپڕ ئێران هەڵوێستی گۆڕا لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان،جێی سەر سوڕمانەحکومەتی ئێران داوای لێکردین کەحیزبی پارتی دامەزرێننەوە.

8/ بەهیمەتی ئێوەی روناکبیر و شۆڕشگێڕ و ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان،ئەتوانن حزبەکەتان لەسەر عەقل و حیکمەت و یاسا و بەهاکانی دیموکراتی و ئازادی دامەزرێننەوە.لەبەرەیەکی سپی هەڵدەنەوەگونجاو بێت لەگەڵ ئەو بارودۆخەئێمەهەمو توانا و شارەزایی خۆمان دەخەینەخزمەتی ئێوەو هیچ پلەو پەیەییک وەرناگرین،ئەوەبڕیاری ئێمەیەلەئێستاوەئاگادارتان دەکەین پێش ئەوە، و تەندروستی روو لە خراپییەو خانەنشین دەبێت لەدورەوەئامۆژگاریتان

دەكات.ئێمەش (ئیدریس و مەسعود) ئەندامێكی پارتی دەبین و هیچ پلەیەک وەرناگرین،لەخزمەت ئێوەدا دەبین لەپێناو حیزبی پارتی.

لەكاتی كۆنفرانسەكەكەهەڵبژاردن دەستی پێكرد ،سەرۆک و سكرتێر و ئەندامانی مەكتەبی سیاسی و لیژنەی ناوەندی دیاری دەكرێت.

یەكەم مەرج ئەوەیەكەلەهەموو چاوپێكەوتنێكی سەرۆک،ئەبێت سكرتێر بەشداری بكات.هەمو كۆبونەوەیەک لەگەڵ ڕێكخراوێكی سیاسی لەكاتی گفتوگۆ كردن مەرجەئەبێت سەرۆک و سكرتێر و ئەندامانی مەكتەبی سیاسی و لیژنەی ناوەندی ئامادەبێت و بڕیاردان لەسەر بنیاتی دیموكراتی و ئازادی دەنگ و زۆرینەی دەنگ بێت.

دارایی ماڵییەی حیزب لەژێر چاودێری گشت ئەندامانی سەركردایەتی دەبێت.

پەیوەندی لەگەڵ هەموو ڕێكخراوەكانی سیاسی كوردستانی گەورەدەبەستین و هەروەها حیزبی شیوعی عێراقی،هەڵوێستیان گەشبین دەبێت بەگشتی.

پەیوەندی تایبەتیمان لەگەڵ شەخسی جەلال تاڵەبانی هەیەو بەهێزی دەكەین لەگەڵ حیزبەسیاسیەكەی یەكێتی نیشتمانی كوردستان و هیچ كێشەیەكمان نییەو نابێت.پارتی و یەكێتی شەڕی پارتیزانی دەكەین دژی حكومەتی عێراق،پاسەوانی حكومەتی ئێران نابین.بەڵام بەهۆی ئەوەی پارتی لەئێران دامەزراوەتەوە،ئەندامانی پارتی و پێشمەرگەبەخانەوادەوە،لێرەژیان دەبەنەسەر و هەڵوێستیان گەشبین دەبێت بەرامبەر حكومەتی ئێران.سەرەتا لەگەڵ حكومەتی توركیاش رەشبین نابین تاكو ماوەیەک كەخۆمان بەهێز دەكەین.

بەنهێنی بنەماڵەی شێخانی بارزانی ئامۆژگاری چەند كادرێكی پارتی و دەستگای پاراستنیان كرد لەكۆبونەوەكەداوای مەسعود بارزانی بكەن كەبۆ سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان هەڵبژێردرێت.

قیادەی موەقەتە:

بەئاگاداری دەزگای ساواک و لەسەر فەرمانی شای ئێران،لەژێر چاودێری بنەماڵەی شێخانی بارزانی بەشێوەی هەڵوێست و پیلانەكەی كەئامادەیان كردبوو،كۆبونەوەكەبەسترا لەكادرانی پارتی دیموكراتی كوردستان و كادرانی دەستگای پاراستن.یەكێک لەبڕیارەكانیان بەشێوەیەكی كاتی بەناوی (قیادەی موەقەتە) دەست بەكار و باری سیاسی بكەنو دیاریان كرد مەسعود سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان بەزۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرا و ،مامۆستا عەلی عەبدوڵلاسكرتێری پارتی دیموكراتی كوردستان بەزۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرا.ئیدریس هەڵبژێردرا بۆ ئەندامی مەكتەبی سیاسی.

مەسعود بارزانی لەسەر داواكردنی ئامادەبووان،سەفەری كرد بۆ ئەوروپا وڵات بەوڵات سەردانی كادرانی پارتی بكات گفتوگۆیان لەگەڵدا بكات،بۆ گەڕانەوەیان بۆ ئێران و بەشداریان لەحزبەكەی خۆیان.هەروەها پەیوەندی بەكادرانی پارتی، لەوانەی گەڕانەوەعێراق بكرێت.

چەند نمونەیەک :

1/ تسلسلی بنەماڵەی شێخانی بارزانی نەگۆڕا لەناو خۆیاندا،وەكو پێشو مایەوە،مەلا مستەفا،ئیدریس مەلا مستەفا،مەسعود مەلا مستەفا.بەبڕیار و فەرمانی مەلا مستەفای بارزانی كۆتایی ژیانی ئەو دوو شۆڕشگێرە،عەلی عەسكەری و د. خالید حەمەسەعید ، هات.ئینجا ئیدریس و مەسعود بڕیارەكەیان بەدەستی سامی عەبدولرەحمان و د. كەماڵ كەركوكی جێبەجێ كرد.چەكیR-B-G یان بەكار هێنا بۆ ئەوەی گۆڕیان نەبێت.

2/ لەسەعات 2:15 دوای نیوەڕۆی رۆژی پێنج شەممەی مانگی 5ی ساڵی 1985 گەیشتمەگوندی "راژان" تەرگەوەر لەكوردستانی رۆژهەڵات.

لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کۆبومەوە.دوای سێ رۆژ هەر هەمویان بڕیاریان دا بۆ چارسەر کردنی ئەو بارودۆخەلەپێناو کۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆ و بەرقەراری ئاشتی لەرێگای دیالۆگ و گفتوگۆ ، کۆبونەوە بکەین لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

کاک مەسعود بارزانی خودی خۆی سەرپەرشتی سەفەرەکەی "بازیان"ی کورمی کرد بۆ ئەوەی بەزووترین کات ئەم هەواڵەگرنگەبگاتەدەست مام جەلال.بەندەش سێ نوسراوەم ئاڕاستەی ئەو برا بەڕێزانە،نەوشیروان مستەفا،عمەر عەبدوڵلاو مام جەلال کرد،دەربارەی هەڵوێستی سەرکردایەتی پارتی کەهەرهەمویان گەشبین بوون.

بازیانی کوڕم گەڕایەوەو وەڵامی نوسراوەکەی پارتی کەئاراستەی یەکێتی کرا بوو هێنایەوەکەئاراستەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کرابوو.ناوەڕۆکەکەی خۆشحاڵ و گەشبین بوو بەهەڵوێستی جوامێرانەی پارتی دیموکراتی کوردستان.دوای دوو مانگ بەنهێنی پرسیارم کرد لەکادرێکی خێرخوازی پارتی ،یەکەم جار سەرۆک زۆر گەرم بوو ئایا هۆی چییەکاک مەسعود بەو شێوەیەگۆڕا و وا سارد بۆوەتەوە؟ئایا شتێک روویداوە؟

وتی: کاک مەسعود زۆر رێزی هەیەبۆ تۆ بەڵام ناتوانێ وەڵامت بداتەوە.چاوەڕوانی کاک ئیدریسەبگەڕێتەوە،چونکی دوا بڕیار لەدەست کاک "ئیدریس"دایە.کاک ئیدریس بارزانی دوای چوارمانگ گەڕایەوە،ئاگاداریان کردم چەند جار کەبۆچی ناچیتەخزمەتی.بەندەبایەخم پێنەدا،چونکی نوێنەری گەورەترین رێکخراوی حیزبێکی کوردستانی باشورم،ئەبێت ئەو داوام بکات.

رۆژێک بەیانیەکەی تەشریفی فراسوا حەریری هاتەلام وتی< رەفیق پشدەری راستی تۆ پیاوی ،ماوەیەکەکاک ئیدریس چاوەڕوانی ئەوەیەکەتۆ داوای دیداری بکەیت،ناچار منی نارد فەرمو با بچینەخزمەتی.

ئیدریس وتی: مام جەلال شەڕو ئاشتی خستوەتەدەست خۆی،رەفیق پشدەری بوەتەنوێنەری جەلال تاڵەبانی،چونکی باش ئاگادارەرەفیق رێزێکی تایبەتی هەیەلای ئێمە.

2/ پرسیارم لەکادرێکی پارتی کرد (....) کاک مەسعود و ئیدریس گفتیان دابوو لەخزمەتی پارتی دادەبین،خەزێنەی شۆڕش مقداری 225 ملیون دولاری تێدا بوو،ئایا تەسلیم بەسەرکردایەتی پارتی کرایەوە؟ لەوەڵامدا وتی : لەبانکەکانی دەرەوەدانراوەبۆ رۆژی رەش.

3/ لەسەرەتای دامەزراندنی پارتییەوەدوای ئاشبەتاڵ،کاک مەسعود هەموو دیدار و کۆبونەوەیەکی مەرج بوو کەبەئاگاداری مامۆستا عەلی عەبدوڵلابێت. جارێکیان بەندەو عەلی عەبدوڵلاو مەسعود و ئیدریس لەساڵی 1985 لەسەرکردایەتی کۆبونەوەمان کرد.

کاک ئیدریس وتی : مامۆستا عەلی کارێکی تایبەتیمان هەیە بەکاک رەفیق بەگوێری بارزانی سیاسی نییەشەخسیە.دوورکەوتینەوە. چەند پرسیارێکیان لێکردم،تەنیا وەڵامی دوو پرسیارم دایەوەکەلە% ئاگادار بووم،جوان نییەباسی بکەم.

لەساڵی 1995 مامۆستا عەلی عەبدوڵلاسکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان ،پەیوەندی بەسکرتێرەکەی سەرۆک مەسعود بارزانی کرد کەکاتی بۆ دیاری بکرێت ئینجا دیداری بکات. چون لەهیچ کۆبونەوەیەک بەشداری و ئاگادار نەدەکرد.

4/بەپێی شارەزایی خۆم هەموو ئامۆژگارییەک ئاراستەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بکەیت،بەمەرجێک لەبەرژەوەندی تایبەتی خودی شەخسی خۆیاندا بێت>سلامەتی و بازرگانیەتی ، یاکسەر بەقسەت دەکەن.

-لەساڵی 1960 بەپەلەچومەلای مەلا مستەفای بارزانی،خەریکی رۆیشتن بوو .لەبەردەمی ئوتومۆبیلەکەراوەستام.ئاگادارم کرد شەقامی رەشید زۆر ئاڵۆزەپەسەندی دەکەم بەئوتومۆبیلی کرێ کارەکەت ئەنجام بدەیت.ئەوەبوو یەکسەر بەقسەی کردم.

+مەلا مستەفا لەگوندی گوخلان بوو،گوندەکەناوی زۆر کەم بوو.دانیشتوانی گوندەکەتەواو نارەحەت بیون و هەروەها هەموو ئەوانەی لەدەورو پشتی بارزانی لەپێشمەرگەو هاولاتی،بەندەبەجەنابی مەحمود بەگی گوخلێم گوت: هەر چەندەمەلا مستەفا لەمن عاجزە،بەڵام شەو کەچوینەخزمەتی تەنیا ئەمەبڵێ کەرەفیق پشدەری ئیمڕۆ وتی سەرۆکی شۆڕش 12 رۆژلەو گوندەیە،ئەمەچەند خەتەرناکەئایا حکومەتی عێراق ئەمەنازانێت،رەنگەچاوەڕوانی شتی گەورەبکات دژی بارزانی.

بەیانییەکەی گوندەکەی بەجێهێشت.

+ مام جەلال بەندەی نارد لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان گفتوگۆ بکەم لەسەر بڕیاری مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەساڵی 1985 لەمەریوانەوەتاکو گەیشتەمەبارەگای سەرکردایەتی پارتی ،خۆم ئامادەدەکرد سەرکەوتن بەدەست بێنم وقسەکانم پەسەند بکەن ،تاکو ژیانی پێشمەرگەو هاولاتیان لەکوشتن رزگار بکەم.

یەکسەر داوای تەسجیلم کرد ،ئەمەوێت قسەکانم تومار بکەم،بۆ مێژوو.مام جەلال وتی : کاک رەفیق ئەتەوێت کوردستان رزگار بێت،ئایا ئەتەوێت خەڵکان پەلەجەت بۆ راکێشن بڵێن ئەمەکوردستانی رزگار کرد.ئێمەیەکێتی دوای شەڕی دابان لەو بارودۆخەی ئیستا کەتەنها ئاسمان ماوەتەقەی لێ بکەین.کوڕانی مەلا مستەفا تۆیان زۆر خۆش دەوێت،ئاشتی لەنێوانمان بەرپا بێت،ئەوەکوردستان رزگار بوو. من کاغەزی سپیت بۆ ئیمزا دەکەم،ئەبێت بەتەنها بچیت کەس نەزانێت،ئەگەر سەرکەوتی ئەوەمن تۆم ناردوە، خۆ ئەگەر شکستت هێنا ئەڵێم ئەمەرەفیق پشدەری ئێوەشارەزاییتان نییەوەکو من سەدها کاری وای ئەنجامداوەبەبێ ئاگاداری من.

وتم: مام جەلال ئەمەقسەی دڵتەیان پیلانێکی دارێژراوە؟ چۆن باوڕت پێبکەم؟ چونکی لەو جیهانەدا بەتاتنهام،تەنها بنەماڵەی شێخانی بارزانیم ماوەکەدۆستایەتیم دەکەن...

مام جەلال وتی: ئەمەبڕیارێکەبەگشتی داوامانەشک و گومانت نەبێت. ئەوەندەبەڵگەی بۆ هێنامەوەباوڕی پێ هێنام.

وتم: دەڵێیت نابێ کەس ئاگاداری هەبێت،باشە، بەڵام با تەنها بۆ من خۆش نییە.ڕێگام پێبدەبا بازیانی کوڕم کەپێشمەرگەیەلەمەکتەبی عەسکەری لەگەڵ خۆمی ببەم.ئەوەبوو وەڵامی دامەوەوتی باشە.

بەرێزان:

بەندەشک و گومانم هەیەلەمام جەلالباوڕم بە قسەکانی نییەو کەفیلی ناکەم. ئەوە پەیوەندی بەخۆتانەوە هەیە بڕیار لەدەست خۆتانە.بەڵام بەندە بە دڵێکی پاکەوە هاتووم با قسەبکەم. رێوی بەپیرتانەوە هاتوە، سودبەخش لێوە دەبن و زەرەرمەند یەکێتی دەبێت لەو ڕێکەوتنە بەو شێوەی ئێستاکە بەردەوامن، کەخۆتان دوور خستوەتەوە لە کوردستان، لە دوارۆژدا لە گوڕەپانەکەی کوردستان بەتەنها دەمێنن و جەماوەرتان لەگەڵ نامێنێت. ئەگەر مەفرەزەیەکی پارتی بنێرنە سەر ربایەکی حکومەتی، سێ رۆژ ئینجا دەگەنە سلێمانی. کتوپڕ پێشمەرگەکانی پارتی روو بەڕووی پێشمەرگەکانی یەکێتی توشی شەڕی براکوژی دەبن. بەڵام ڕێکەوتن ئاشتی بەرقەرار دەبێ، بارودۆخەکە هەر هەمووی دەگۆڕدرێت و لەبەرژەوەندی ئێوەدەبێت. بەقسەکانی منیان کرد چونکی پرۆژەکە لە بەرژەوەندی بنەماڵەی بارزانیدا بوو.

مام جەلال کە ئەو نوسراوەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی دەگاتە دەست، توشی سەرسوڕمان دەبێت. سێ رۆژ خۆی نەخۆش دەکات، کەس نابینێ، دەڵێت ئەوە رەفیق پشدەری و مەسعود بارزانی مۆئامەرەم لێدەکەن. ئاوا بەپەلە و زوو کوڕانی مەلا مستەفا رازی بوون و بڕیاریان دا.

بەدوور و درێژی لەکتێبەکانم "کورد دوژمنی خۆت بناسە" ئاماژەم بەو پرۆژەیە داوە.

بنەماڵەی شێخانی بارزان

بەندە کورتە باسێک ئاماژە پێ دەدەم کە مێژوو شاهێد حاڵە و هەزارەها هاوولاتی لە ژیاندا ماون و ئەو شاهەدییە دەدەن بەرانبەر دادگا کە گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستانی گەورە دەستی یارمەتی بۆ نزێژ کردوون و خزمەتگوزاری کردوون و بە سەر و ماڵ فیداکار بوون.

کوردستانی رۆژهەڵات:

لە ساڵی 1944 بنەماڵەی شێخانی بارزانی بە خانەوادەوە لە گەڵ هەموو بارزانییەکان رایانکرد لە عێراق، چوونەتە کوردستانی رۆژهەڵات.

یەکەم جار لە بارودۆخێکی دژوار ژیانیان بردۆتە سەر، بە هۆی ئەوەی شک و گومانیان لێکردوون کە بە پیلانی ئینگلیزیەکانەوە نێردراون، ماوەیەک بەم شێوەیە ناهەموارە ژیان دەبەنە سەر.

ئەم دەنگ و باسە لە ناو رووناکبیرو نیشتمانپەروەران بڵاو دەبێتەوە کە بارزانییەکان لە بار و دۆخێکی دژوار ژیان دەبەنە سەر.

یەکسەر ئەو کەسایەتییە ناسراو و بەڕێزانە(کاک زیاد ئاغای حەمە ئاغای کۆیە و شێخ لەتیف کوڕی مەلیک مەحموود و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عەبدوڵلا).

نووسراوێک بە ئیمزای 2000 هاووڵاتی و رووناکبیر و نیشتمانپەروەر ئاراستەی پێشەوا قازی موحەمەدی دەکەن دەربارەی هەموو ئەو هاووڵاتییە بەڕێزانەی کە هاتایان هێناوە بۆ کۆماری کوردستان هەر هەموویان جێی باوەڕ و متمانەن و لە خزمەتی کورددا فیداکارن و ئەفسەرەکان دەبنە ئەوایەک بۆ بەهێزکردنی سپای کوماری کوردستان و هەر وەها بارزاننییەکان بە گشتی.

پێشەوا قازی موحەمەد فەرمان دەر دەکات بە پەلە هەموو جۆرە یارمەتییەکی خزمەتگوزارییان پێشکەش بکەن و پێویستییەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن، ئینجا کار و باریان بە پێی شارەزایی جێگایان بۆ دیاری بکەن، مەلا موستەفای بارزانی پلەی ژنراڵی پێشکەش دەکەن و ئەفسەرەکان(بەکر ئاغای هەوێزی و عیزەت عەزیز و موستەفا خۆشناو و میر حاج ئاکرەیی و موحەمەد قودسی و نووری ئەحمەد تەها، خێروڵلا عوبدولکەریم و جەلال ئەمین بەگ) بارو دۆخی هەر هەموویان لە هەموو ڕوویەکەوە گۆڕانی بە سەردا دێت بە پلەی 180 دەرەجە لە بەرژەوەندی شەخسی خۆیان و کوماری کوردستان دەبێت، ئەم هەواڵە خۆشە لە کوردستانی باشوور بڵاو کرایەوە.

2

کە بڵێسەی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی 1961 هەڵگیرسا لە کوردستانی باشوور لە سەرەتاوە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە نهێنی و ئاشکرا لە هەموو بوارێکەوە پشتگیری و یارمەتی پێویستیەکانی شۆڕشیان لە سەدا حەفتا(70%) دابین کرد چە ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی هاووڵاتیان بە ئاگاداری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران .

3

کۆڕەوەکەی ساڵی 1991 ئەوە بوو زۆرینەی دانیشتوانی کوردستانی باشوور بە گیرفانی بەتاڵ و سکی برسی روویان کردە کوردستانی رۆژهەڵات.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کوتوپڕ پەیامێکی ئاراستەی دانیشتوانی کوردستانی رۆژهەڵات کرد.

یەکسەر هاووڵاتییان لە سەرانسەری کوردستانی رۆژهەڵات دەقی پەیامەکەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان جێبەجێ کرد و بە گەرمەوە پێشوازییان لە میوانە ئازیزەکانیان کرد، دەرگای ماڵیان خستە سەر پشت بۆ برا کوردەکانیان کە نزیکەی سێ(3) میلیۆن دەبوون.

نزیکەی 50000 هاووڵاتی لە سەنگەسەر و بۆڵێ و دۆڵی شەهیدانەوە چوونەتە کوردستانی رۆژهەڵات، ئەو کاتە دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بارەگاکەی لە بۆڵێ بوو، هەموو کەم و کوڕی و پێویستەکانی ئەو 50000 هاووڵاتییانەیان بۆ ئەنجامدان، ژمارەی 17000 پێڵاویان بە سەر ئەو کوردانەی کە لە ترسی شاڵاوی بەعس ڕایان کردووە و بە پێخواسی بە سەر ئەو ڕێگا شاخاویەدا دەڕۆن.

4

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ساڵانی هەشتاکان کە بارودۆخی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان پێویستی بە خۆراک بوو ئەوە بوو بە نهێنی و ئاشکرا، ڕۆن و برنج و ئارد و چاییان پێشکەش کردن.

5

دوای ڕاپەڕینی ساڵی 1991 لە ماوەی 2 ساڵ کە شەڕی ناوخۆ لە نێوان بنەماڵەی شێخانی بارزانی و شەخسی جەلال تاڵەبانی بەرپا بوو لە سەر سەروەت و سامان و پلە. بەڵام لە میدیاکانەوە بە ناوی پارتی دیمووکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان بڵاو کرایەوە.شەڕێک بوو بە پیلان و ستراتیژیەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، حکوومەتی تورکییە و سەدام حوسێن، حکوومەتی بەشار ئەسەدی سووریەش ئاگادار بوو

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە ڕاستی هەڵوێستێکی جوامێرانە و سیاسەتێکی ژیرانەی بێلایەنیان بە کار هێنا، بە هیچ جۆرێک بەشدارییان لەو شەڕی دژوارە نەکرد کە لە لایەن داگیرگەرانی کوردستانەوە کە لە لایەن مەسعوود و جەلالەوە فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد.

حیزب بە هیچ جۆرێک بەشداری هیچ لایەنێکی نەکرد لە کاتێکدا کە ئەو شەڕە دژوارە بەرپا بوو، ئەوە بوو کە هەموو توانایەکی مرۆڤانەی بە کارهێنا لە پێناوی ڕزگارکردنی زامداران و ئەو پێشمەرگانەی توانای شەڕیان نەماوە و باوەڕیان بە شەڕی براکوژی نەبوو، بە بێ جیاوازی ئەوە چەکداری بنەماڵەی بارزانییە یان چەکداری جەلال تاڵەبانییە هەموویان گواستۆتەوە بۆ نەخۆشخانەی حیزب و بە یەک چاو خزمەتگوزارییان پێشکەش کردن، سەیر ئەوەیە زامداری مەسعوود و جەلال لە ژێر چاوەدێری پزیشکەکان تەداوی دەکران، ئینجا حیزب بە سەلامەتی هەر یەک لەو زامدارانەی تەسلیم بە ئاغاکەی دەکاتەوە(جەلال و مەسعوود) .

خەڵکانێکی زۆر لەو زامدارانەی کە ڕزگاریان بوو ئێستاکە لە دەزگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیستمانی کوردستان پلە و پایەی بەرزیان هەیە.

کوردستانی باکوور:

زۆرینەی هاووڵاتیان بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی 1961 یان کرد، سەدەها هاووڵاتی هاتنە ریزی پێشمەرگە و ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستان و چەندەها شەهید و زامدار بوون و خەڵکانێک دەربەدەر بوون لە هەندەران، و هاووڵاتیانێکی زۆر بە دەستی دەزگای سیخوڕی میتی تورکی نژاد پەرست تووشی ئازار و ئەشکەنجە و گرتووخانە و لە سێدارەدان بوون. بە تایبەتی ڕێکخراوە سیاسەیەکانی کوردستان دەورێکی گەورەیان هەبوو لە سەر سەپاندنی ژێرخانی شۆڕش بە جورێک باوەڕ و متمانەیان بە بنەماڵەی شێخانی بارزانی دا هەبوو، فەرمانەکانییان دەقی خۆی جێبەجێیان کرد، بە داخەوە بەشێک لەو ڕێکخراوە سیاسیە کوردستانیانە بنەماڵەی شێخانی بارزانییان بە فریشتە دەزانی و بەردەوام ئەو هەڵوێستەیان هەر بە جوش بوو بە مەرجێک دوای ئەوەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی ئاشبەتاڵیان بە شوڕش کرد ( ئەوە بوو قیادەی مووەقەتیان دامەزراند) ئەو پێوەندییە هەر بەردەوام بوو، هۆی ئەوە بوو بنەماڵەی شێخانی بارزانی لە شەڕی هەککاری سەرکەوتنیان بە سەر یەکیەتی نیشتمانی کوردستان هێنا.

نموونەیەک: خوالێخۆشبوو مامۆستا هەژاری موکریانی نیشتمانپەروەر و شاعیری گەورەی لێهاتووی بەناوبانگ لە سەرانسەری کوردستانی گەورە گوتی: کە شۆڕش بەرپا بوو بە سەرۆکایەتی مەلا موستەفای بارزانی، ئەوە بوو حکوومەت هێرشێکی درندانەی هێنایە سەر کوردستان، هەموو جۆرە چەکێکیان بەکار هێنا، شورش ناچار بوو لە شارەکان بکشێتەوە لە سەر لووتکەی شاخەکانی سەرسنووری ڕۆژهەڵات و شاخەکانی سەر سنووری کوردستانی باکوور خۆیان بگرنەوە.

بارزانی و هێزەکەی کشایەوە و لە گوندی شیروانی مەزن لە سەر لووتکەی شاخەکانی سنووری کوردستانی باکوور جێگیر بوون دوور لە گوندەکانی کوردستانی باکوور بە 2000 مەتر. لە سەرەتاوە لە بارووددۆخێکی دژوار ژیانمان بردە سەر هەتاکوو دوو ڕۆژ، هاووڵاتییان بە ئاشکراو نهێنی دەستی یارمەتییان بۆ درێژ کردین، باروددۆخی ژیانمان لە هەموو ڕوویەکەوە گۆڕانی بە سەردا هات، کێشەی ئابووریمان نەما. ئەو خزمەتگوزارریيەی پێشکەش بە شوڕشیان کرد لەو کاتە ناهەموارەدابوو بە هۆی ئەوەی کەم و کوریەکانی شوڕش چارسەر بکەین و ڕیزەکانی پێشمەرگە ڕێ بخەینەوە.

مامۆستا هەژار چەن جار بە مەلا موستەفای بارزانی دەڵێت حەتمەن رۆژێک دێت ئێمە رزگارمان بێت، ئەو کاتەش ئێمەش بەم شێوەیە حەتمەن گومان لەوەدا نییە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکەین، کۆمەکی کوردی تورکیای ئەدەین لە هەموو بوارێکەوە.

ئەمە یەکێکە لە هەزارەهای بەم جورە هاوولاتییانی کوردستانی باکوور دەستی یارمەتییان بۆ بنەماڵەی شێخانی بارزانی درێژ کردووە، ئایا لەو 250 چەکدارەی کە لە گەڵ مەلا موستەفای بارزانیدا بوون لەو کاتە کە لە شیروانی مەزن بوون یەکێکیان خواڵێخۆشبوو هەژاری موکریانی بوو. حەتمەن سەد لەو چەکدارانە لە ژیاندا ماون، خۆزگە ئەو هاوولاتییە بەڕیزانەی ئەم داستانەیان ئاماژە پێ دەدا بەڵکوو بنەماڵەی شیخانی بارزانی حیسابێکیان بۆ خۆیان کردبا.

سێهەم کوردستانی رۆژئاوا:

خەڵکانێکی رووناکبیر و نیشتمانپەروەر و کەسایەتییە سیاسییەکان سەردانی مەلا موستەفایان کرد بە بۆنەی گەڕانەوەی بۆ عێراق لە ساڵی 1958، بارزانی بە گەرمەوە پێشوازی لێکردن بە تایبەتی لە مامۆستا قەدریجان، ئەوە بوو لە سەر داواکردنی بارزانی ماموستا قەدریجان لە میوانخانەی سەمیرامیس مایەوە.

بەندە ئاگاداری لێپرسراوی ئیدارەی میوانخانەکەم کرد کە حیسابی قەدریجان لە لیستی حیسابی بارزانی دا دابنێن.

قەدریجان کە قسەی دەکرد نوێنەر و پەیامێکی هەڵگرتووە دەربارەی هاوولاتییانی کورد لە کوردستانی رۆژئاوا ئاراستەی شەخسی مەلا موستەفای بارزانی کردووە، بارزانی رەشبین دەبێ لە وەڵامدانەوەی کە دەڵێت من سەرۆکی کورد و کوردوستان نیم، من موستەفام سەربازێکی زەعیم عابد الکریم قاسم.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن مامۆستای بەرێز ئاگاداری ئەوە نەبووم کە مەلا موستەفای بارزانی لە میواندارییەکەی برا فەیلیەکان کە 3000 نێر و مێ هاواری کرد مەلا موستەفای بارزانی سەرۆکی کورد و کوردستانە.

بارزانی لە وەڵامدا دەنگی 3000 نێر و مێی خەفە کرد کە گوتی: من قەیتانی قوندەرەی زەعیم عەبدالکریم قاسمم.

وەڵامەکەی بارزانی ماموستا قەدیرجانی ناچار کردبوو بەردەوام لە هەموو دانیشتنێکی دەربارەی بارو دۆخی کورد لە سووریا چۆن ژیان دەباتە سەر بە دوور و درێژی ئاگاداری بارزانی کردووە، هەمیشە دووبارە و دەبارەی دەکاتەوە بە راشکاوی.

بە کورتی ئاماژە بە قسەکانی مامۆستا قەدری جان دەدەم.

ووتی: هەتاکوو سوریە لە ژێر چاودێری و ئیدارەی (فەرانسیەکاندا بوو) ئازادی و دیموکراتی یاساو مافی مروڤ بەرقەرار بو، هاووڵاتی کورد هەستی بە چەوسانەوەی نەتەوایەتی بە هیچ جورێک لەلایەن کونەپەرست و نەژاد پەرستەکانی عەرەب نەدەکرد.

بەڵام دوای ئەوی کە لە سووریا حوکم بەتەواوەتی کەوتە دەست عەرەب، ئەوە بوو یەکسەر بارودۆخی کورد گورانی بە سەر دا هات لە هەموو بوارێکەوە.

عەرەبی کونەپەرست و شوفینی رەگەزپەرست شەری نەتەوایەتیان لەگەڵ دا دەکردن، بەرەو ئەشکنجەو گرتووخانە و بەندیخانە و دەربەدەری هەندەرانیان دەبەردن. رۆژگارێکی دژوارمان لە رێگایە ئەگەر چارە نەکرێت، بەڵام ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە رووبەرووی کورد بووتەوە هەستی نەتەوایەتی هاوولاتیانی کوردی بە جورێک بەرزکردوتەوە ئیمرو زۆرینەی کورد ئامادەیە بە سەر و ماڵ گیانی خۆی بەخت بکات لە پێناوی ئازادی و دیموکراتی و سەربەخۆی کوردستان.

تێبینی:

1. خزمەتێکی گەورەری شۆرشی ئەیلولی ساڵی 1961 یان کرد لە هەموو بوارێکەوە بەسەر و ماڵ بەشداریان کرد و چەندەها شەهید و زامداریان هەبوو.
2. لە ساڵی 1956 ڤوتابیانی کورد لە ئەوروپا دامەزرا:

راستی شایەنی باسکردنن هەموو ئەو رووناکبیر و نیشتیمانپەروەرو سیاسەتمدارانە خزمەتێکی گەورەی کوردستانیان کرد، ئەوە بوو گەلی کوردیان بە جیهان ناساند.

راستی جێی شانازیە هاوولاتیانی کوردستانی رۆژئاوا دەورێکی سەرەکیان هەبوو لە گەشەپێدان و سەرکەوتنی ڤوتابیانی کورد لە ئەوروپا.

کوردستانی باشوور:

هۆزو تیرەکانی دەورو پێشتی زاب بە گشتی سەرۆک هۆز و ئاغا و مەلا و کوێخا و جوتیار هەرهەموو دانیشتوانی ناوچەکە بە تێکرایی لە (گوندی بەرۆژی سەرێ و خواری، دۆلە مەرێ، شێروانەیی، زێباری، برادۆستی، هەرکی و سورچی) هەرهەمووی لە خزمەتی(شێخ محمدی کوری شێخ عەبدول سەلام کوری عبداللە)دا بوون بە سەر و ماڵ، باپیرە گەورەی مەلا مستەفا لە عبداڵلاوە کوتایی دێت.

مێژووی بنەماڵەی شێخانی بارزانی لە محمد کورری عبداسلامی یەکەم دەست پێدەکات.

شێخ محمد کێیە:

پیاوێکی کارامە و لێزان دونیا دیدە بووە و توانیوەتی بە ناوی پێرەوکردنی رێبازی نەقشبەندیەوە خەڵکێکی یەکجار زۆر لە خۆ کۆبکاتەوە و بەم هۆیەوە دەسەلاتی خۆ بە سەر ناوچەکەدا سەپاند، ئەوە بوو هەموو هۆز و تیرەکانی دەورو پشتی مل کەچی خۆی کرد لە ژێر فەرمانیدا بوون هەموو کێشە و روداوێک لە ناو هۆزەکان خۆش و ناخۆشی چارسەری لە رێگای شێخ محمد وە چارسەر دەکردن.

بە پیاوێکی ئایینی گەورە سەیر ئەکرا و نازناوی جێنشینی(شێخ رەزای ئەهری)لێیان نابوو.

تەریقەتی نەقشبەندی بڵاودەکردەوە و بەهۆی ئەوەی زمانی عەرەبی زانیوە کە زمانی قورئانە و لە ئایین و شەرع شارەزا بووە توانیویەتی خودی شەخسی خۆی بە سەر ناوچەی زاب بە تەواوتی دابگرێت لە سەرۆک هۆز و ئاغا وکوێخاو جوتیار بە گشتی .

لە هەمان کات ناو بانگی بڵاو بووتەوە و دەسەڵاتی لە ناو خانەوادەکان هەبووە بە سەر (نێر و مێ) بۆ مارەکردن و جیابوونەوە.

دەرگای خێریان لێ کراوە دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان لە زەوی و زار و موڵک و ئاژەل بۆ ئەوی داهاتووی خۆیان لە دوارۆژدا دابین بکەن، بەهۆی ئەو سەروەت و سامانەش دەسەڵاتیان یەکجار زۆر فراوان بوو.

شێخ محمد: لەو ماوەی کە بەم جۆرە دەسەڵاتی بە سەر ناوچەی زاب بە تەواوەتی داگرتووە بە یەکسانی تماشای دانیشتووانی ناوچەکەی کردوە رێگای نەداوە ئاژاوە و دووبەرەکی لە ناو هۆزەکان و خانەوادەکان دروست بێت، تەنها هەتاکوو توانیوەتی سەروەت و سامانێکی زۆر بۆ نەوەکانی کۆبکاتەوە و هانی بنەماڵەی خۆ داوە لە رێگای نێر و مێ خزمایەتی لەگەل هەموو هۆزەکان پتەوبکەن و هەریەک چوار ژن بهێنێ.

پاش مردنی شێخ محمد، شێخ عبدالسلامی بارزانی یەکەم، ئەوە بوو شێخ عبدالسلام بارزانی دووهەم بوو بە جێگری هەلوێستو بوچوونی ئەو سەروەت و سامانەی کە لە باوکیەوە بۆی بە جێمابو بۆ بەکارهێنانی دەسەلات لە رێگای خستنەوەی دووبەرەکی و ناکۆکی لە نێوان هۆزەکانی دەوروبەریدا، توانی دەسەڵاتی خۆ بەسپێلی بە سەر هەر چوار عەشیرەتی دراوسێدا بە تەواوەتی(بە روژ، میزووری ژووروە دۆلە مەری، شێروانی مەزن) بە بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو کارانەی کە شێخ محمد ئەنجامی دا.

تەنها دەسەڵاتیان بەسەر عەشیرەتی(زێباریەکان)دا نەگرت.

لە پێناو دەسەڵات بەرفەراوان کردنی ناوچەی نیشتەجێی بارزانیەکان ئەوە بوو(جامانەی سوور) کە بە زۆر سەپێندرا بە سەر هەموو هاوولاتیانی ئەو چوار هۆزە کە لە سەرەوە و ئاماژەم پێداوە،( پێشتر تەنها برا ئێزیدیەکان جامانەی سووریان دەبەست).

ئەوە بوو جامانەی سوور بوو بە دروشمی بنەماڵەی شێخانی بارزانی لە سەر فرمانی عبدالسلام بارزانی.

عبدالسلام بارزانی: بە فرمانی عوسمانییەکان بوو بە لێپرسراوی گومرگی پردی نێوان (بارزانی و زێباری)، داهاتی پردەکە پارەیەکی زۆری کۆکردەوە بەڵام تەسلیم بە(والی برادۆست)ی نەکرد، هەرهەمووی ئەو پارەیەی هەڵگرت بۆخودی شەخسی خۆی و رایکرد چوو بۆ ئێران لە ترسان.

ئێرانیش عبدالسلام بارزانی تەسلیم بە عوسمانییەکان کرد هەروەها تاوانبار بوو بە ئەوی لە کەمینێک لە قافڵەیەکی برادۆستی داوە خەڵکانێکی زۆری کوشتووە بریندار کردوە.

ئەوە بوو عوسمانییەکان لە ساڵی 1914 شیخ عبدالسلام بارزانیی لە سێدارە دا، پاش دامەزراندنی حکوومەتی عەرەبی عیراق لێبووردنی گشتی دەرچوو.

عبدالسلام بارزانی پێنج کوری هەبوو بەو ناوانە (ئەحمەد، بابۆ، جورج ، مستەفا و محمد سدیق).

پاش لە سێدارە درانی عبدالسلام بارزانی، مەلا عبدولرحمان کە کورەزای بوو،جڵەوی شێخانی بارزانی گرتە دەست. ئەمەش بوو بە هۆی پەیدا بوونی رق و کینە لای کورەکانی شێخ عبدالسلامی بارزانی دووەم، چوونکی ئەوان خۆیان بە زانا و سیاسیتر لە پلاندانان بۆ ئەوەی سەروەت و سامان و دەسەڵات لە دەڤەرەکە بگرنە دەست، دەزانی.

ئەوە بوو مەلا مستەفای بارزانی و محمد سەدیقی برای لە مانگی ئەیلولی ساڵی 1927دا لە نزیک هاوینەهەواری چیای شیرین، مەلا عبدولرحمانیان کوشت.

پاش ئەو رووداوە دەسەڵاتی ئایینی کەوتە دەست شیخ ئەحمەد. لە سالانی 1931 و 1932دا باری گوزەرانی ناوچەی بارزان زۆر خراپ بوو بە شێوەیەک خەڵکی توانا و هێز خۆیان دەخستە گەڕ بۆ دابینکردنی گوزەرانی رۆژانەی خۆیان، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە خەڵکانێک رۆژانە لە برسان دەمردن.

مەلامستەفای بارزانی ئەم بارودۆخەی کە لە ئارادا بوو، بە هەلێکی باشی دەزانی بو سەپاندنی دەسەڵاتی خودی خۆی و ناوبانگ دەرکردن، هەربۆیە هەڵمەکەی گواستەوە و لەو ماوەیەدا بەرنگاری حکوومەتی عیراق بوویەوە.

پاش ئەوەی کە حیزبی هیوا دامەزرا بە هەزاران هاوولاتی لە روشنبیر و نیشتیمانپەروەران چوونە ناوئەو حیزبەوە. لێپرسراوانی حیزبی هیوا بریاریاندا خۆیان لە مەلا مستەفای بارزانی نزیک بەکەنەوە و بزوتنەوەکەی وەک وەرقەیەکی زەخت بۆ سەر حکوومەتی عەرەبی عیراق بە کار بهێنن، ئەوش لە مانگی تەموزی ساڵی 1943دا و لە مانگی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا مەلا مستەفا توانی دەست بگرێ بە سەر ناوچەی بارزاندا، هەموو هێزەکانی حکوومەت لەو ناوچانە پاک بکاتەوە و بە دەرینێ.

ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی ژمارەیەک لە ئەفسەرە کوردەکانی ناو سوپای عیراق کە سەر بە حیزبی هیوا بوون پەیوەندی بە مەلا مستەفاوە بکەن. لە دواجار دا ئەمە بوو بە هۆی ناودەرکردنی بارزانی.

خوشک و برای ئازیزم!

وا لە خوارەوە ئاماژەم پێداوە دەربارەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی کە بە دەستی خۆیان مێژو و کەلتووریکی رەشیان تومار کردوە، بە فرمانی سەروەرەکانیان لە کونەپەرست و شۆڤینی و نژادپەرست لە داگیرکەران(فارس، تورک و عەرەب)دا هەمیشە بنەماڵە رێگر بوون لە ئازادی و دیموکراتی و یاسا وهەر وەها مافی مروڤیان پێشێل کردوە و خەڵکانێکیان زیندە بە چاڵ کردوە،

هەزاران هاووڵاتی ئامادەن لەبەرانبەر دادگاە ئەو شاهییە بدەن کە دژی گەلی کورد ئەنجامیانداوە لە هەر چوارپارچەکەی کوردستانی گەورە.

1.کوردستانی رۆژهەلات:

ئەم بنەماڵە خیانەتکارە کە کێشە روبەرویان دەبێتەوە، پەنا و سکالا دەبەن و دەپارێنەوە و داوای یارمەتی ئەکەن بەڵام کە کاریان جیبەجیکرا و پشویاندا کە دەستیان رۆییشت وەک دوپشک پێتەوە دەدن.

لەم کتێبەی لە بەر دەستدایە ئاماژەم پێداوە بە دور ودرێژی کە حکومەتی پادشایی عیراق هێرشی برد سەر ناوچەی بارزان، ئەوە بوو ناچار کران بەگشتی کشانەوە و هانایان برد بۆ کوردستانی ئێران.

کوماری کوردستان شک و گومانی لێکردن، پیشوازی لێنەکردن هیچکاریکیان پیی نەسپردەرا.

پێشەوا قازی محمد لە سەر نووسراوەکەی(کاک زیادی حەمە ئاغای کۆیە، شیخ لەتیف کوری مەلیک محمود، ماموستا هەمزە عبدواللە و برایم ئەحمد) بریار و فەرمانیدا یەکسەر لە پیشوازی هەرهەموویان کاریان بسپێرن.

ژنراڵ بارزانی پێش رووخانی کوماری کوردستان بە یەک مانگ بە نهێنی پەیوەندی بە سەرۆک کوماری ئازەربایجانی غەربی دەکات و دەڵێ: ئیمە هەرهەموومان هاووڵاتیانی کوردی عیراق کە بشداریمان کردوە لە کوماری کوردستان، ئامادەین خانە بگوزینەوە لە خزمەتی کوماری ئازەربایجانی غەرەب دا بین.

پێشەوا قازی محەمەد ئاگادار دەکرێت کە مەلا مستەفای بارزانی کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆک کوماری ئازەربایجان کردوە لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی شەخسی خۆی و لاوازکردنی کوماری کوردستان و خانە بگوازێتەوە.

پێشەوا قازی محەمەد لەگەل نوێنەری روسیەکان کۆدەبێتەوە و ئەم باسە بە دوور و درێژی دەکا و شاهید حاڵ (ئەفسەر عبدلکریم)ە کە لەگەڵ مەلا مستەفا بووە لەو کوبوونەوەیەدا، سەرۆک کوماری ئازەربایجانی غەربی ئامادەگیری تیدا بووە چوارجار بەرامبەر ئەو یارمەتییەی کە پێشەوا پێشکەش بە ئێوەی دەکا، ئیمە لە خزمەتیاندا دەبین و بە هاتنتان خوشحاڵ دەبین.

ئەفسەر عبدلکەریم دەڵی ئەو وتووێژەی کە لە نیوان مەلا مستەفا و سەرۆک کوماری ئازەربایجانی غەربی دا بووە، دووپاەری دەکاتەوە رووبەرووی نوێنەری روسەکان لە بەرامبەر پێشەوا.

نوێنەری روسەکان دژی ئەو هەڵوێست و پیلانەی بارزانی و سەرۆک کوماری ئازەربایجان، رادەوستن و گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆک کوماری ئازەرنایجان دەکەن.

ئەوە بوو پیلانەکی بارزانی پووچەڵ کرایەوە و سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

خوالیخۆشبوو نیشتیمانپەروەر و شۆرشگێر (سەعید خانی هومایونی) سکرتێر و خوارزای پێشەوا( خالی هاوسەرەکەم، ئێران فەیزولابەگی) ئەم داستانەی بۆ باسکردم لە ساڵی 2001 کە لە خزمەتیدا بووم لە مهاباد.

سەعیدخان ووتی: دوابەدوای ئەم روداوە گرینگە، ئەوە بوو کێشەیەک لە ناوچەی مەنگورایەتی هاتە ئاراوە، پێشەوا فەرمووی نامەیێت ئاگاداری بارزانی بکەن کە بەشداری لە چارسەر کردنی ئەو کێشەیە بکات، هەرچەندە لەو ناوچەیەی کە ئاژاوەی لێی رووداوە، بارزانی بەرپرسیارە. کە بارزانی ئەمە ئەزانێت بە پەلە دەگاتە ناوچەکە و رەخنە لە جەنابی سەعید خان دەگرێت کە هۆی چییە ئاگادارتان نەکردووم.

دلشاد رەسوڵی:

دڵشاد ڕەسووڵی بەفەرمانی تایبەتی خودی شەخسی بارزانی دەستگیرکرا و کوتوپڕ بە تاوانی ئەوەی کە بە نهێنی پەیوەندی بە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی هەبووە و خەتەرناکە بو سەر شۆڕش، تیرۆر کرا. ئەم ڕووداوەش لای دانیشتوانی شارۆچکەی قەڵادزێ جێگای سەر سووڕمان بوو چوونکە ناوبراو جێگای متمانەی خەڵکی ئەو دەڤەرە بوو.

پاش چوار ساڵ دوای تیرۆری ناوبراو، بۆ خەڵک ڕوون دەبێتەوە کە دڵشاد ڕەسووڵی کارمەندێکی کوردستانی ڕۆژهەڵات بووە و دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان هاتۆتە باشووری و لە گۆڤارێکی لوبنانی ڕاپورتێک بڵاو دەکاتەوە دەرباری چوونیەتی دامەزراندنی کوماری کوردستانی ڕۆژهەڵات و لەو ڕاپۆرتەدا ئاماژە بە شەخسی بارزانی دەکات کە پەیوەندی گرتووە بە پیشەوا قازی موحەمەدەوە، سەرەتا لای قازی موحەمەد، بارزانی جێگای شەک و گومان دەبێت. دڵشاد ڕەسووڵی هەر وەها سەبارەت بە بارزانی دەڵێ: بارزانی هاووڵاتییەکی شۆڕشگێر نییە، ماهیەتی خیلەکیی هەیە و خەتەرناک و تیکدەرە و دوارۆژی ئەم شۆڕشە بەرو ڕووخان دەبات. کاتێک هەواڵی ئەم ڕاپۆرتە دەگاتە دەستی بارزانی، یەکسەر داوای گرتنی دڵشاد ڕەسووڵی دەکاو بڕیاری لا ناوبردنی دەدات چوونکو ناوبراو ماهییەتی بارزانی دەرخستووە!!

مەلا ئاوارە و فایق: دوو کادری شۆڕشگێری چالاکی (حدکا) بوون کە بە فەرمانی مەلا مستەفای بارزانی لە سەر داواکردنی دەزگای سیخوری ساواک، تیرۆر کران.

ساواکی ئێران:

کاتێک مەلا مستەفای بارزانی بە تەواوەتی تەسلیم بە ئیرادەی حکوومەتی شای ئێران دەبێت، بنەماڵەی شێخانی بارزانی ڕاستەوخۆ گرێ دەدرێن بە دەزگای سیخوڕی وڵاتی ئێران(ساواک) ەوە، یەکێک لە مەرجەکانی ساواک ئەوە دەبێ کە بارزانی دەبێ بە تەواوەتی ئاگاداری هەموو کردەوەیەکی(حدکا) بێت، بە تایبەت شەخسی سکرتێری ئەو حیزبە. ئەم پەیوەندیە دووقۆڵییە لە نێوان ساڵەکانی 1963 و 1964 دەس پێدەکا کە بە شێوەی نهێنی دەبێ.

بەندە ڕەفیق پشدەری،بۆ ماوەیەکی زۆر پەیوەندیم بە شەخسی بارزانییەوە زۆر نزیک بوو، بۆ نموونە بە لۆقمانی کوڕی خۆی بانگی دەکردم، منیش بارزانیم بە فریشتەیەک دەزانی کە خوای گەورە بۆ ئێمەی ڕەوانە کردووە کە گەلی کورد ڕزگار بکات.

ئەو کاتەی دووبەرەکییەکانی حیزبی دیموکرات بەو ئاراستەیەدا تێپەڕیبوو کە هەموو کەس دەیزانی و بە ئاشکرا باسی دەکرد،بە تایبەت کێشەی نێوان ئەحمەد توفیق و سولیمان موعینی. بەندە لە گەڵ ئەو دوو بەڕێزەدا پێوەندی و دۆستایەتیم هەبوو هەر وەها لە نزیکەوە شارەزای هەڵوێست و بیرو بۆچوونەکانیان بووم، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە بە شەخسی بارزانییەوە نزیک بووم، زورتر ئەحمەد توفیقم دەبینی و بە دوور و درێژی گفتوگۆمان دەکرد و ناوبراویش هەمانەکەی خۆی بۆ بەتاڵ دەکردم و بۆ من دەرکەوت کە شەخسی ئەحمەد توفیق بە تەواوەتی لە ژێر کاریگەری و کونترۆڵی شەخسی بارزانیدایە تا ئەو ئاستەی کە لە خۆدی بارزانی، خۆی توندتر نیشان دەدا و ئامۆژگاری منی دەکرد و دەیگوت: کاک ڕەفیق! پشتگیری لە جەماعەتی برایم ئەحمەد دەکەی و لە ناو هەموو کوڕ و کۆمەڵێک بە ڕاشکاری پروپاگەندەیان بۆ دەکەی، هۆی چییە جێگای خۆت لەق دەکەی لای بارزانی!؟

منیش لە وەڵامی کاک ئەحمەد دا گوتم: دوورخستنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی(جەماعەتی برایم ئەحمەد) زیانێکی گەورە بە کورد و کوردستان دەگەیەنێ، بە تایبەت زیان بە شەخسی مەلا موستەفای بارزانی. ئەمڕۆ زۆرینەی هاووڵاتیانی کورد لە سەرانسەری کوردستانی گەورە، بارزانی بە سەرۆک دادەنێن و ئامادەن لە پێناوی فەرمانی بارزانیدا بە سەر و ماڵ گیانی خۆیان بەخت بکەن. بەڵام ئەگەر لە پارچەیەک لە پارچەکانی کوردستانی گەورە دووبەرەکی ڕوو بدات و بارزانی لایەنگری لە لایەنێک بکات، ئەو کاتە باڵەکەی دیکە حیسابی ئەوە بۆ مەلا موستەفا ناکات کە سەرۆکی هەموو کوردستانە چوونکو ئاستی کەسایەتی خۆی دادەبەزێنێ و هەر وەها لە بەرژەوەندی جەماوەریشدا نییە. حکوومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەمیشە ئەو پیلان و ستراتیژیەتیانە بەکار هێناوە و لەو ڕێگایانەوە ئامانجەکانی خۆیان هێناوەتە دی.

ئەحمەد توفیق:

ئەحمەد توفیق گوچانی دەستی مەلا موستەفای بارزانی بوو، پێی وابوو کە شەڕ و ئاشتی و چۆنیەتی چارسەرکردنی کێشەی کورد لە سەرانسەری کوردستانی گەورە دا لە ژێر ڕکێفی بارزانیدایە. ئەو هەمیشە دەیگوت" ئێستاکە لە گۆڕەپانی سیاسی دا، جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد، دەبێ خانەنشین بن و پێوەندییان بە پارتی و شۆڕشەوە نەمێنێ. من(ئەحمەد تۆفیق) جێگای باوەڕ و متمانەی شەخسی سەرۆک بارزانیم، هەر بۆیە فەرمانی داوە کە دەبێ ئەم ئەرکە خەتەرناکە و ئەم بەرپرسایەتییە(سکرتێری حدکا) بە ئەستۆبگرم". ناوبراو باوەڕی بە هەڵبژاردنی حیزبی و کونفرانسی حیزبی نەبوو چوونکە مەلا موستەفا فەرمانی داوە کە ئەحمەد توفیق سکرتێر بێت!!.

سەعید کوێستانی لە کتێبی ( ئاورێک لە بەسەرهاتی خۆم و ڕووداوەکانی ناو حدکا ) دا کە لە ساڵی 1996 بە ناوی خوازراوی سەعید کاوە بڵاوی کراوەتەوە ، ئاماژە بە ڕووداوێک دەکا کە قسەکانی من لە بارەی ئەحمەد توفیق پشتراست دەکاتەوە  کە من لێرەدا بە کورتی ئاماژە بەو ڕووداوە دەکەم.

ڕۆژی هەینی سەعات 11ی بەیانی لە شارۆچکەی سەنگەسەر، چەن کادری حدکا کە بریتی بوون لە موحەمەد چکۆل، سەعید حەمە حەسەن، قادری قازی، ڕەسووڵی پێشنماز، حوسێن مەدەنی، حەسەن ڕەستگارو من(سەعید کاوە) بە مەبەستی گرتنی کونفرانسێک، سەردانی مەلا موستەفامان کرد. ئێمە پێشتر لە سەر ئەوە ڕێکەوتبووین کە بە ڕاشکاوی بە مەلا موستەفا بڵێین کە پشتگیری لە ئەحمەد توفیق نەکات و تەنانەت جگە لە ئەحمەد تۆفیق هەر کەسێک کە ئەو دیاری بکات هاوکاری لە گەڵ دەکەین. هەر بۆیە کاتێ چووینە خزمەتی مەلا موستەفا و داوای گرتنی کونفرانسێکمان کرد ومەبەستەکەی خۆمان ڕاگەیاند،کەچی نە تەنیا مەلا موستەفا ئەو پێشنیارەی قەبووڵ نەکرد بەڵکوو بە من(سەعید کاوە)ی گوت چوونکە لە ناو قسەکانتا 3 جار بە من(مەلا موستەفا) ت گوتووە مامۆستا!! دەبێ 3 هەوتوو لە بەندیخانەی بێتواتە و گەلاڵە زیندات بکەم.

سولێمان موعینی:

سولێمان موعینی باوەڕی بە ئازادی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ و یاسا هەبو، پێی وابوو چارسەرکردنی کێشەی ناوخۆیی حیزب، لە ڕێگای کونفرانسەوە چارە دەکرێت و دەیگوت: "پلان و بەرنامەیەکی  تایبەتم بۆ چارسەرکردنی کێشەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت کێشەی حیزب، داڕشتووە کە ئامانج و داهاتووی ئەو حیزبەی بەرەو سەربەخۆیی دەبا."

تێبینی:

1_ سولێمان موعینی دەیگوت: ئەو بەڵێنانەی کە مەلاموستەفای بارزانی بە حەحمەد توفێقی دابوون، بە شێوەیەک ئەو بەڵێنانەی لای منیش دووپات دەکردەوە بەڵام من ئامادە نەبووم جێبەجێیان بکەم و ببمە سکرتێری حیزب لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە بڕۆمە ژێر ڕکێفی ساواکی ئێرانەوە.

2_ سولێمان موعینی بە هاوکاری مەلا مستەفا و لە سەر داواکاری ساواک، دەزگیر دەکرێت و تەحوێلی ئێران دەدرێتەوە. ناوبراو سەرەڕای ئەوەی حکوومەتی ئێران سەرەتا بۆ ئەوەی نهێنیەکانی حیزب بدرکێنێ زۆر بەڵێنی باشی پێ دەدەن بەڵام چوونکو تەسلیمی خواستەکانی ساواک نابێت لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی لە دەس دەدات. لە لایەکی دیکەوە چوونکوو ساواک بە خواستەکانی خۆی ناگەیشتبوو، هەر وەها بۆ بەدناوکردنی بارزانی، تەرمەکەی لە ناو شارەکانی کوردستان دەگێڕا و دەیانگوت کە بارزانی تەرمی سولێمان موعینیی تەحوێلی ساواکی ئێران داوەتەوە.

هەڵسەنگاندن:

کورتە باسێک لەو خیانەتانەی کە بنەماڵەی شێخانی بارزانی بە ڕاشکاوی و بێشەرمانە بە دژی هاووڵاتیانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، کردوویانە و ئەو خۆش خزمەتیانەی کە بە شای ئێران کردوویانە، باس بکەم.

نزیکایەتی و خۆش خزمەتی مەلا موستەفا بە شای ئێران تا ئەو ئاستە بوو کە مقۆ مقۆ لە نێوان جیلی ڕووناکبیر و نیشتمان پەروەر و تەنانەت خەڵکی ئاسایی ، بەر پا بوو. کاتێکیش ڕووبەڕووی پرسیاری هاووڵاتیانی ڕۆژهەڵات لەو بوارەدا دەبوونەوە پاساوی سەیر و سەمەریان دەهێنایەوە بۆ نموونە مەسعوود بارزانی بەرپرسی دەزگای پاراستنی پارتی دەیگوت: "ئێمە ناچارین و هیچ ڕێگایەکمان نییە کە پێوەندی بە دەرەوە بکەین و بۆ پارێزگاری لە شۆڕشەکە مەجبوورین لە گەل شای ئێران دۆستایەتیمان هەبێ، بەڵام لە بڕیاردا سەربەخۆین" . بەڵام ئەمە لە کاتێکدایە کە لەساڵی 1975 بنەماڵەی شێخانی بارزانی لە سەر بڕیار و فەرمانی شای ئێران ئاشبەتاڵیان بە شۆڕش کرد.

دوای ئاشبەتاڵی شۆڕش و دوای ئەوەی کە شای ئێران بە تەواوەتی شۆڕشی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ ئەوەی کوردەکانی باشوور لەوە زیاتر زەرەرمەند نەبن، هەموو ڕێگایەکیان گرتە بەر بۆ ئەوەی بگرێنەوە سەر ژیانی خۆیان. هەر بۆیە بوون بە سێ بەشەوە. بەشێکیان لە ئێران مانەوە، بەشێکی دیکەیان بەرەو هەندەران ڕۆیستن و بەشی سێیەمیش گەرانەوە بۆ باشووری کوردستان.

دوای ماوەیەکی کورت، هەڵوێستی شای ئێران و دەزگای ساواک بەرانبەر بە بنەماڵەی بارزانی گۆڕا و هیچ حیسابێکیان بۆ نەکردن و بە چاوێکی سووکەوە سەیریان دەکردن. بە نەخشەی داڕێژراوی ساواک هەموو ئەو خەڵکانەی کە بە گشتی لە ئێران مابوونەوە، کەوتنە ژێر زەحمەت و فشار و ئازار و ئەشکەنجە و تەنانەت گرتووخانە لە شارو شارۆچکە فارس نشینەکاندا بێ ئەوەی بارزانی  ئاگادار بکەنەوە. بنەماڵەی شێخانی بارزانی ئەوندە بێدەسەڵات بوون کە نە تەنیا نەیانتوانی لەو بوارەدا کارێک بکەن بەڵکوو خۆیشیان لە هەلو مەرجێکی دژواردا دەژیان.

ئەوە بوو خەڵکانێکی ڕووناکبیر و نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەداری کورد، حیزبێکی سیاسیان بە ناوی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان دامەزراند و جەلال تاڵەبانیشیان کردە کسرتێری ئەو حیزبە.

دوای دامەزراندنی یەکیەتی، ساواکی ئێران و میتی تورکیە و موخابراتی بەعس لەو بوارەدا کۆبوونەوەیەکیان پێک هێنا و ئاکامی ئو کۆبوونەوەش ئەوە بوو کە تاکە ڕێگایەک کە لە بەرانبەری ئەو بزووتنەوە نوێیەدا ڕاوەستن، تەنیا بنەماڵەی شێخانی بارزانییە.

دەزگای سیخوڕیی ساواک لە سەر بڕیار و فەرمانی شا، داوای لە بنەماڵەی شێخانی بارزانی کرد کە حیزبێک دامەزرێنن، بە پەلە ئەو بنەماڵەیە حیزبێکیان بە ناوی قیادەی مووەقەت دامەزراند. بارزانییەکان هەندێ خەڵکیان ناردەوە بۆعەراق وەهەندێک بە ئاشکرا و هەندێکی دیکە بە نهێنی دژایەتییان لە گەل یەکیەتی نیشتمانی دەکرد، تەنانەت هەندێکیشیان ئەوندە لە ناو دەزگای بەعسدا پلە و پایەی باشیان بە دەس هێنا بۆ نموونە قادر فەرەج و تەحسین شاوەیس، ئەو کەسانەش بە دەیان کەسیان ترور کرد. لە ڕاستیدا قیادە مووەقەت بوو بە دارەدەست و پاسەوانی ساواکی ئێران. کە ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئێران هەڵگیرسا، قیادە مووەقەت شان بە شانی ساواک دژی ڕاپەڕینەکە ڕاوەستان.

ئەو کاتەی شا، ئێرانی بە جێ هێشت و حکوومەتەکەی لە ساڵی 1979 ڕووخا، حیزبە سیاسیەکانی ئێران هەر هەموویان بە هۆی ئەو هەڵوێستە نامرۆڤانەی بنەماڵەی بارزا نی کە دژی ڕاپەڕینەکەی گەلی ئێران راوەستا بوون، داوایان لێکردن کە ئێران جێ بهێڵن. ئەوە بوو دوکتور قاسملوو سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ئەو داواکارییەی بە فەرمی بە بنەماڵەی شێخانی بارزانی ڕاگەیاند.

بنەماڵەی شێخانی بارزان جێگایان پێ لەق ببو لە سەرانسەری ئێران، ئەو خەڵکەی کە لە گەل بنەماڵەی بارزانیدا بوون، دوای ئەو گۆڕانکارییە کە لە ئیران ڕوویدا گەڕانەوە عەراق، لە نێوانیاندا چەن کادرێکی بەرپرسی پارتییان تێدا بوو و چوونە پاڵ حکوومەتی بەعس، ڕێزێکی زۆریان لێگرتن و دەستی پارمەتییان بۆ درێژ کردن. یەکێ لەو کادرانەی کە جێگای باوەڕی مەلا موستەفا بوو، عەبدولوەهاب ئەترووشیی ناو بوو کە بوو بە وەزیری بەعس. بنەماڵەی بارزانی هەوڵ و تەقالای زۆر دەکەن کە چاوپێکەوتن لە گەل حیزبەکانی ئێران بکەن، هیچ حیزبێک ئامادە نابێ. پاشان پەنا دەبەنە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. دوکتور ڕۆژ نوری شاوەیس ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بنەماڵەی بارزانی، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی بارەگای دەفتەری سیاسی دەکا  لە مەهاباد و داوای دیداری دوکتور قاسملو دەکات. بەڵام دوکتور قاسملو پێی ڕاگەیاندبوو کە وەک شەخسی تاکی خۆی بە هۆی ئەوەی کە کوڕی شاوەیسە دەتوانێ چاوپێکەوتن بکات بەڵام وەک حیزب نا.

دوای رووخانی رژیمی شای ئێران لە ساڵی 1979 کوردستانی رۆژهەڵات بە گشتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی گەلی کورد و لە بواری ئابووری و سیاسییەوە بە ژیرانە و رێک و پێک بەرێوە دەچوو و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیان لە رێگای دیالۆگ و وتووێژ و کۆبوونەوە لە گەڵ حکوومەتی ناوەندی ئێران دەدا. هەر چەندە سەرکردایەتی حدکا و کۆمەڵە و هێزەکانی دیکەی کوردستانی رۆژهەڵات، هەموو هەوڵ و توانای خۆیان وەگەڕ خست بۆ ئەوەی مەلاکانی ئێران دان بە مافی نەتەوایەتی کورددا بنێن و کێشەی کورد بە ئاشتی جێبەجێ بکەن و رێگای جەنگ نەگرنە بەر. بەڵام بە ناکام ناگەیشتن چوونکو مەلاکان باوەڕو متمانەیان بە ئازادی و دیموکراسی، یاسا و مافی مرۆڤ نەبوو. ئەوە بوو کە گەلی کورد تەسلیمی ئیرادەی مەلاکان نەبوون هەر بۆیە شەڕێکی دژوار و درێژخایەن لە نێوان بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی ئێران و حوکومەتی ناوەندی ئێران هاتە ئاراوە. لەو شەڕەدا حوکوومەت هەموو توانای خۆی خستە گەڕ بە دژی گەلی کورد کەچی نەیتوانی بزووتنەوەی کورد خامۆش بکات.

سەرۆکی سوپای ئێران چاوپێکەوتنی لەگەڵ خومەینی دەکات و بە راشکاوی جەنگەکەی بۆ روون دەکاتەوە کە کوردەکان بەرەورووی سوپاکەمان راوەستاون، هەرچەندە هەموو توانایەکمان بەکار هێناوە بەڵام بە تەواوەتی سەرکەوتنمان بەدەست نەهێناوە، ئەوە بوو لەسەر داوا کردنی سوپای ئێران خومێنی ئەو بەیانەی بڵاو کردەوە، بەیاننامەی سەرکردەی شۆرشی ئیسلامی رایگەیاند کە من وەکوو فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان داوا لە هێزی زەمینی و ئاسمانی و دەریایی دەکەم هەرچی زووتر هەیە بە توندی لە دوژمنانی شۆڕش بدەن و بچنە کوردستان و ئاگری ئاژاوەی کوردستان بکوژێننەوە و کۆتایی پێ بهێنن.

بەیاننامەکەی خومەینییان فرۆشت لە بازاری قەپاڵکەندی، ئەوە بوو یەک کیلۆ پەرلەماسی پێنەهات! هەستی نەتەوایەتی بە هێز و توانا بوو لە لایەن هاووڵاتیانی کوردستانەوە لە رۆژهەڵات، شان بە شانی برا پێشمەرگە جەنگاوەرەکان و رۆڵەکانی پێشەوا قازی محەممەد بەشدارییان کرد، جەنگێک کە تا دەهات گەورەتر دەبوو. دوای بەیانەکەی خومەینی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا بەتایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکان، ئەم جەنگە بەردەوامی لە بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی نییە، وە لە ئەجندەیا نییە بڕیار لەسەر مافی نەتەوایەتی نەتەوەکانی ئێران بدەن بە تایبەتی نەتەوەی کورد، دوای گفت و گۆ و کۆبوونەوە و لێکۆڵینەوە بۆ چارەسەر کردنی دەگەنە ئەو بڕیارە کە تاکە رێگا کۆتایی هێنان بەم جەنگەیە. بۆیە با ئەم ئەرکە بخەینە سەرشانی بنەماڵەی بارزانی. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ خەڵکانێکی شارەزا و لێهاتوو و کارمەندانی رژێمی کۆن کۆدەبنەوە، ئینجا تەماشای ئەو دیکۆمێنتانەی کە لەبەر دەستدایە دەکەن و چۆنیەتی پێوەندی شەخسی بارزانی و حکومەتی شای ئێران و خاڵە لاوازەکانیان دەکەن. بۆیە هەموو شتێکیان بە راشکاوی بۆ روون دەبێتەوە کە ئارەزوو و ماهییەتی ئەو بنەماڵە چییە. بۆ ئەوەی پێوەندییان لەگەڵ حکومەت بەهێز بێت لە رێگەی سەروەت و سامان و دەسەڵات. یەکەمین چاوپێکەوتنی نوێنەرانی خومەینی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی داوای لێبووردنیان لێدەکەن کە ئێوە میوان نین و ئێران نیشتمانی خۆتانە، هەموومان ئایینمان ئیسلامە و هیچ جیاوازییەک لە نێوان کورد و فارس نییە. هەوڵێکی زۆرمان دا لەگەڵ برا کوردەکانمان بە ئاشتی چارەسەری کێشەی کورد بکرێت ئەوە کە دیموکرات بە فەرمانی سەدام حسین جەنگیان بەرپا کرد. ئەو ساردییە لە سەرەتاوە درووست بوو لە نێوان ئێمە و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، خومەینی ئاگاداری ئێمەی کردۆتەوە و حەز بە دیدارتان دەکات، دەیەوێ خزمەت بە ئیدریس و مەسعود بکات. چاویان بە خومەینی دەکەوێ، دەستیان لەسەر دادەنێ و دەڵێ ئێوە بوون بە کوڕی من، دۆعای خێرتان بۆ ئەکەم. بۆیە بڕیار درا کۆماری ئیسلامی لە هەموو بوارێکەوە یارمەتییان بدا. خەڵکێکیان دەستنیشان کرد بە فەرمانی خومەینی بۆ ئەوەی سەرپەرشتی و چاودێری لەو پرۆژەیە بکەن. ئینجا بنەماڵەی شێخانی بارزانی لەگەڵ ئەو لێپرسراوانەی کە دیاری کرابوون لەسەر پێویستییەکانیان گفت و گۆیان کرد و هەریەک دەوری خۆی دیاری دەکات.

بنەماڵەی شێخانی بارزانی وەکوو بەڵێندەر لەو پرۆژەیە مەسئوولن لە پاککردنەوەی کوردستانی رۆژهەڵات لە هەرچی چەکدار هەیە بە تایبەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. کۆماری ئیسلامی و دەزگاکانی حکومەت بە تایبەتی وەزارەتی بەرگری و ئیتلاعات و پاسداران بە هەموو توانایەکیانەوە لە خزمەت بنەماڵەی شێخانی بارزانیدا دەبن کە پێویستییەکانیان بۆ ئەنجام بدەن. مووچەی سەرکردایەتی مانگی 1000 دیناری عیراقی و مووچەی چەکدارەکانیان هەروەها دیاری کرا.

دەربارەی پرۆژەکە ئەوە بوو کە لەسەر کاغەز و قسە هەموو شتێک ئامادە کرابوو، بەڵام تاکە کۆسپی کە ناتوانن دەست بەکار بن ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بار و دۆخەی زۆرینەی هاووڵاتی کوردی باشوور تەمەننای سەرکەوتنی

هاوولاتییانی رۆژهەلاتیان دەکرد، زۆرینەی ئەو هاوولاتییانەی کوردی باشوور کە لە ئێران ماون و لە ریزی پارتین بە دڵ و بە گیان، پشگیری هاوولاتی رۆژهەلاتیان دەکرد، ئەگەر بنەماڵە رێگایان پێ دابان زۆرینەیان پەیوەندییان بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە دەکرد، جا مەرجە پلانێک داڕێژین ئەو بار و دۆخە گۆڕانی بەسەردا بێت، ئینجا بتوانین دەست بە کار بین. ئەوە بوو هەواڵێکی دڵتەزێن لە سەرانسەری کوردستانی گەورە بڵاو کرایەو ە کە تەرمی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا بارزانی لە گۆڕەکەی هێناویانەتە دەرێ و ئەم کارە نارەوایەش تاوانبارانی دژی گەلی کورد ئەنجامیان داوە. ئەوە بوو کە بنەماڵەی شێخانی بارزانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان تاوانبار کرد. ئەم رووداوە بوو بە هۆی ئەوەی بارو دۆخەکە گۆڕانی بەسەردا هات بە پلەی سەد و هەشتا دەرەجە، لە نێوان حدکا و پدک دا.

ئەو هاوولاتیانەی کوردی عێراق کە لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بارزانی لە ئێران مابوونەوە قین و کینیان پەیدا کرد دژی حدکا، گرژی و وردە شەڕ دەستی پێکرد، لەسەرەتاوە ئەم پلانە نهێنی بوو لە نێوان بنەماڵەی شێخانی بارزانی و سەرکردایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران کە لە سەرەوە ئاماژەم پێداوە، ئینجا بنەماڵەی شێخانی بارزانی هاتنا بۆ کۆماری ئیسلامی دەبەن کە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن و بتوانن زاڵ بن بەسەر حدکا دا. سیناریۆکە لێرە تەواو دەبێ لە کۆتاتی ئیدریس و موسعود و خومەینی و بە ئاشکرا شان بە شانی سوپای ئێران دژی حدکا و کوردستانی ئێران جەنگیان کرد. ئەوە بوو کە بنەماڵەی شێخانی بارزانی شاخ بە شاخ دژی حدکا راوەستان.

تێبینی:

1. سەرەتا زۆرینەی گەلی کورد باوەڕیان هێنا کە حدکا ئەم تاوانە گەورە و نارەوایان ئەنجام داوە.

2. حدکا ئەم کارەیان نەکردبوو و ئاگادار نەبوون بۆیە قامکیان بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران راکێشا وەک تاوانبار.

3. بەندە لە ساڵی 1985 نزیکەی پێنج مانگ لە بارەگای سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ڕاژان سەر بە رۆژهەلاتی کوردستان دا بووم. ئەو کاتە جێگای باوەڕ و متمانەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بووم و رێزێکی تایبەتییان دەگرتم. هۆی ئەو رێزگرتنەش ئەوە بوو کە جەلال تاڵەبانی منی وەک نوێنەری تایبەتی خۆی دیاری کردبوو بۆ وتو وێژ لەگەل بنەماڵەی بارزانی( لە کتێبەکانمدا بە دوور و درێژی ئاماژەم بەو مەسەلەیە کردووە).

بەندە ئەو نهێنیانەی کە ئاماژەم پێدا و دواتر ئاماژەی پێ دەدەم، هەمووی لەو خەڵکە نیشتمانپەروەرەم بیستووە کە لە ناو خودی دەزگای پارتیدا کار دەکەن. چوونکە مێژووی بەشێک لە خەڵکی کوردە، هەر بۆیە مەجبوورم باسی بکەم.

4. ئەو تاوانبارە خیانەتکارانەی کە تەرمی مەلا موستەفای بارزانییان لە گۆڕەکەی دەرهێنا، لە ڕاستیدا لە پێناو بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامیدا ئەو کارەیانە ئەنجام داوە، کە بریتین لە مەسعوود و ئیدریس و شەخسێک کە دواتر بوو بە وەزیری حکوومەتەکەی نێچیرڤان بارزانی.

5. کاتێک لە تاران بووم، چەن کەس بە نوێنەرایەتی میرحوسێن مووسەوی، سەرۆک وەزیری کۆماری ئیسلامی، سەردانیان کردم و داوایان لێکردم کە قوەتێکی 10000(دەهەزار) کەسی پێک بێنم بۆ ئەوەی بەرەنگاری حکوومەتی بەعس ببمەوە. منیش لە وەڵامدا گوتم : تەنیا 6 کەس شک دەبەم و ئەگەریش هەموو توانای خۆم بخەمە گەڕ 10 کەس زیاترم بۆ کۆ نابێتەوە، بەڵام ئەوان لە وەڵامدا گوتیان کارێک دەکەین نیوەی جەماعەتی جەلالی و بارزانی لە لات کۆ دەکەینەوە. منیش لە ئاکامدا وەڵامم دانەوە کە: دەربارەی ئەو پڕۆژەیە لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆم دەکەم و وەڵامتان دەدەمەوە. دوای چەند رۆژێک نوێنەری میرحوسێن کە خۆی بە ئەبو عەلی ناساند دووبارە سەردانی کردم و گوتی: پێت خۆشە دیداری ئایەتوڵڵا خومەینی بکەی؟ منیش گوتم شانازی بەو چاوپێکەوتنە دەکەم. ئینجا گوتی دەبێ نامەیەک بە فەرمی بۆ خومەینی بنووسیت و داوای دیداری لێبکەی و لە دەقی داواکاری دیدارەکەدا دەبێ ئەم ڕستانە بەکاربهێنی: چەن چرکەیەک دەمەوێ بێمە خزمەتت بۆ پا بووس و دەستە پیرۆزەکانت ماچ بکەم و.... بەڵام من نە تەنیا ئەو داواکاریە رەبوونانەم نەنووسی بەڵکوو بە پەلە ڕامکردە شاری سەقز و سەردانی حاجی عەبدوڵڵا ئاغای فەیزوڵڵا بەگیم کرد و مەسەکەم بە دوور و درێژی بۆی گێڕایەوە. حاجی عەبدوڵڵا ئاغایش لە وەڵامدا گوتی: "کە کۆماری کوردستان ڕووخا، 12 شەهیدمان دا کە یەکیان برای خۆم بوو، کۆماری ئیسلامی و شای ئێران هیچ جیاوازییەکیان نییە. کۆماری ئیسلامیش هەر وەک شا، بە چاوی دوژمنەوە سەیری کورد دەکات". کە زانیمان کۆماری ئیسلامی بە ئاسانی لە کۆڵم نابێتەوە، ئەوە بوو کە حاجی عەبدوڵڵا ئاغا(کە باوکی خێزانەکەمە) فەرمووی" کوڕم! ئەگەر هەر ئێستا لە گەل خێزان و کوڕەکانت ڕا

بکەن، دەرەنگە! " . هەر بۆیە، ئەو ئێوارەیە، 6 کەسی( خێزانەکەم، براکەم، دوو کوڕەکانم و ژنی کوڕە گەورەکەم)، لە مانگی 11ی 1987 لە شاری سەقز هاتینە دەرێ و بە سەلامەتی گەیشتینە گوندی سیلوانا لە ناوچەی ڕاژان لە بەر دەرکی ماڵی مەسعود بارزانی ڕاوەستاین،کتوپڕ ئەوە بوو. نێچیرڤان و دڵشاد بارزانی بە پیرمانەوە هاتن. هەموو بەسەرهاتەکەم گێڕایەوە. داوام لێکردن یارمەتیمان بدەن بە زووترین کات ئێران جێبهێڵین. هەر وەها گوتم تکایە دەقی قسەکانی من و دەقی بە سەرهاتەکە بۆ کاک مەسعود بگێڕنەوە. ئەوانیش گوتیان سەرۆک لە ڕەزاییەیە و بۆ کار و بارێکی سیاسی سەفەری کردووە، هەر کات هاتەوە، ئاگاداری دەکەینەوە. لە بارەگای تایبەتی مەسعود بارزانی نیشتەجێیان کردین و خزمەتێکی باشیان کردین بەڵام پاش 4 مانگ، کاک ڕەنجبەر برازای سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، لە سەعات 7 ی شەو هاتە لامان. گوتی ئەم شوێنە بارەگای هاوینی کاک مەسعودە و هات و چۆی سەیارە نییە، هەر بۆیە من(ڕەنجبەر) بە 3 کاتژمێر هاتوومەتە ئێرا لە کاتێکدا بە سەیارە ڕێگای 15 دەقیقەیە، کاک مەسعود پەیامی ناردووە کە بڕۆینە خزمەتی و ڕایشیگەیاند کە حاجی موستەفەوی بەرپرسی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا لە کن کاک مەسعودە و گوتوویەتی بۆچی ڕەفیق پشدەری لێمان عاجزە؟ ئێمە (کۆماری ئیسلامی)حازرین هەموو خزمەتێکی کاک ڕەفیق بکەین. هەر بۆیە کاک ڕەنجبەر پێی گوتم کە دەبێ بڕۆینە خزمەتی کاک مەسعود و حاجی موستەفەوی. منیش لە وەڵامدا گوتم: کاک ڕەنجبەر! کاک مەسعود باش دەزانێ کە من لە دەس کوماری ئیسلامی ڕامکردووە. ئێستا بەرنامەکانی ئێوە، ئەوە پیشان دەدەن کە من بگەڕێمەوە باوەشی کوماری ئیسلامی و کار بۆ سیستەمی کۆماری ئیسلامی بکەم، لە ڕاستیدا جاسووسیان بۆ بکەم!؟. ڕەنجبەریش لە وەڵامدا گوتی خۆ ئێمەیش (پارتی) لە گەڵ کوماری ئیسلامیدا کار دەکەین. منیش لە ئاکامدا بە تووڕەییەوە گوتم: حازرم بمرم بەڵام حازر نیم کار بۆ دوژمنی کورد بکەم. دوای ڕۆیشتنی کاک ڕەنجبەر و دوای ئەوەی 6 کەسی ڕاوێژمان کرد، خۆشبەختانە ئەوانیش وەک من بیریان دەکردەوە. هەر بۆیە بڕیارمان دا لەو شوێنە ڕابکەین و هەموو سەختی و دژواری ڕێگا تەنانەت مەرگیش قەبوڵ بکەین بەڵام حازر نابین لەوێ بمێنینەوە. ڕێگای دژواری تورکیەمان گرتە بەر و بە هەزار زەحمەت و چەرمەسەری گەیشتینە تورکیە. من نامهەوێ باسی ئەو ڕێگا دژوارە بکەم بەڵام دەمەوێ لەم کتێبەدا کە بۆ وەفایش بووە، سپاسی ئەو کەسانە بکەم کە یارمەتییان دام. یەکەم کەس، شوفێرێکی سەقزی بوو کە بە داخەوە بە هۆی باری ئەمنییەوە ناتوانم ناوی بهێنم. هەر وەها سپاسی پێشمەرگەیەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە ناوی خالید بکەم کە زۆر یارمەتی داین(وابزانم ئێستا کاک خالید لە ئەورووپا دەژی، هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازم و هیوادارم ڕۆژێک بە دیداری شاد ببمەوە)، هەر وەها پێویستە سپاسی خەڵکی گوندی ڕاژان بکەم کە نیشانیان دا بە ڕاستی زۆر کورد پەروەرن.

کوردستانی تورکیە:

سەرەتای سەرهەڵدانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، هیوا و ئومێدێکی زۆری خستە ناو دڵی جەماوەری کوردستانەوە کە ڕزگاریان بکات لە دەست سیستەمی فاشیستی ئاتاتورکەوە. لە سەرەتای درووست بوونی ئەو حیزبەوە، مەلا موستەفای بارزانی دەیهەویست بە هەموو شێوەیەکی مومکین خۆی نزیکی سەرکردایەتی ئەو حیزبە بکاتەوە بۆ ئەوەی بیکێشێتە ژێر کونترۆڵ و ڕکێفی خۆیەوە تا هەمان سیناریۆی کوردستانی ڕۆژهەڵات دووپات بکاتەوە، تا لە ئاکامدا شۆڕشی کوردستانی باکووریش تووشی قەیران و پووچەڵ بوونەوە بکات. بۆ ئەو مەبەستەش، مەلا موستەفا دەیزانی کە لە ناو سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، جیاوازی بیر و ڕا هەیە، هەر بۆیە لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و دوکتور شڤانی نزیکی خۆی خستەوە و دەیهەویست دوکتور شڤان کە گوێڕایەڵی مەلا موستەفا بوو، بە هەر قیمەتێک بووە، بکاتە سەرۆکی ئەو حیزبە لە جێگای سەعید ئاڵچی. چوونکە سەعید ئاڵچی کە سکرتێکی ئەو حیزبە بوو، مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر بوو، هەر وەها نە دەرۆیشتە ژێر ڕکێفی بارزانییەوە. هەر بۆیە لە ڕێگای دوکتور شڤانەوە(کە بارەگای لە زاخۆ دەبێت و عیسا سواری بارزانیش بەرپرسی ئەو ناوچە دەبێت)، بانگهێشتنی سەعید ئاڵچی دەکەن بۆ زاخۆ، لە ڕواڵەتدا بۆ ئاشت کردنەوە و یەک خستنی ریزەکانی ئەو پارتە بەڵام لە ناوەرۆکدا بۆ لە نێو بردنی سەعید ئاڵتاش. ئەوە بوو کە دوکتور شڤان بە پێی پیلانێکی دارێژراو لە لایەن بنەماڵەی شێخانی بارزانییەوە، سەعید ئاڵچی و هاوڕێکەی بە ناوی موحەمەد بەیگی لە نێو دەبەن. کاتێک دوای بزر بوونی سەعید ئاڵچی و هاوڕێکەی، لە لایەن هاوحیزبیەکانی و هەر وەها خەڵکی باکووری کوردستانەوە، سۆراخ و پرسیاری سەعید ئاڵچی دەهاتە ئاراوە، ئەو مقۆ مقۆیە لە ناو خەڵکدا دروست بوو کە نەبا لە نێویان برنبێت. دوای ماوەیەکی کورت، دەرکەوت کە خەڵکانێک ئاگاداری ئەو پیلانە بوون، سەرەتا عیسا سوار کە بەرپرسی ئەو ناوچەیە بوو، ڕایگەیاند کە سەعید ئاڵچی سەردانی ئەو دەڤەرەی نەکردووە. بەڵام کاتێک خەڵکی دەڤەرەکەو ڕۆژنامەوانان و هەر وەها کەسێک لە زینداندا شەهادەتی دابوو کە

سەعید ئاڵچیی لە ناوچەی زاخۆ دیوە، هەر بۆیە بنەماڵەی بارزانی بۆ ئەوەی خەڵک بەو خیانەتە نەزانێت، ناچار بوون دوکتور شڤان و دوو کەس لە بەڕێوەبەرانی ئەو پیلانە بە ناوەکانی چەکۆ و برووسک دەسبەسەر بکەن و لە مەحکەمەدا بە تاوانی قەتڵی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا(سەعید ئاڵچی و هاوڕێکەی) لە سێدارە دران.

خوێنەری هێژا!

بۆ ئەوەی لە وردەکاریەکانی ئەو خیانەتەی بنەماڵەی بارزانی باشتر ئاگادار بن، کتێبی( اضواء على الحركه الكرديه فی سوریا)، لە نووسینی مامۆستا عبدالاحمید درویش بخوێننەوە. هەر وەها ڕاگەیەندراوی کومیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا لە 17ی ئابی ساڵی 1971 بخوێننەوە.

کوردستانی باشور و "دەر بارەی بنەماڵەی بارزانی"

خوشک و برایانی ئازیزم چەند ڕاستیەک هەیەمرۆڤ ناتوانێت چاوپۆشیان لێبکات،چونکی بنەماڵەی بارزانی تۆمارێکی دوور و درێژیان هەیەلەخەبات و ئەو هەوڵانەی لەو بارەیەوەباسدەکرێ یان ڕۆژنامەکان باسیدەکەن و کتێبەکان دەیخەنەروو.لەراستیدا بەبەراورد لەگەڵ خەبات و قوربانیدانەکانیان مافی خۆیان نەداوەتێ،چونکەلەشەڕەکانی 1942 و 1945 دا بەشداریان کردوەو لەکۆماری کوردستان (مەهاباد) دا ڕۆڵی گەورەیان بینیوەو سنوری وڵاتی ئێران و عێراق و تورکیایان بەرەو یەکێتی وسۆڤیەت بڕی،کەلەوێ لەیەکتر جیا کرانەوە.

جا دەتوانم بڵێم هەروەکو دەزگاکانی ڕاگەیاندن باسیان دەکرد، هەتاکو کۆتایی ساڵی 1959 مێژیەکی شکۆداریان هەبوو .بەڵام دوای ساڵی 1964؟

بەڵام وەکو پێغەمبەر گوتویەتی "انهاالامور خوتهما" ، واتەکار و بار لەکۆتاییەکەیدادیارە.

دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان ( مەهاباد) مەلا مستەفا سەفەری تاران دەکات و بەرپرایەتی هەموو ئەو هاوڵاتیانەی کوردی باشور کەئەوکاتەلەئێران نیشتەجێ بوون و ژیانیان دەبردەسەر، لەگەڵ حکومەتی شای ئێران کۆدەبێتەوەو گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات.ئینجا مەلامستەفا دەگەڕێتەوەبۆ لای شێخ ئەحمەدی بارزانی،سەرۆکی عەشیرەتی بارزان، و ئەفسەرەکان و هاوڵاتیان و ئاگاداریان دەکات ،بەدوور و درێژی دەربارەی ڕا و هەڵوێستیان،باس لەمەرجەکانی حکومەتی شای ئێران دەکات بۆ ئەگەری مانەوەو نیشتەجێ بونیان لەئێران.

هەر هەموویان بڕیار دەدەن بگەڕێنەوەعێراق،ئەگەر هەموویان لەسێدارەبدەن باشترەلەوەی لەئێران بمێننەوەلەژێر دەسەڵاتی شای ئێراندا بن.بەگشتی هەر هەموویان ئێرانیان بەجێ هێشت و هاتنەوەکوردستانی باشور، لەسەر سنور ماوەیەک مانەوە.

دوای وتووێژ کردن، حکومەتی پاشای عێراقی عەرەبی یەک مەرجی بۆ دیاری کردن،ئەویش ئەوەبوو کەخۆتان تەسلیم کەن بەپێی یاسا لەگەڵتان دەجولێنەوە.

دوای ئەوەی شێخ ئەحمەد و مەلامستەفا و ئەفسەرەکان دەربارەی ئەو باروذۆخەکۆبوونەوەو لێکۆڵینەوەدەکەن،دوو بۆ چونی جیاواز لەنێوانیاندا دێتەئاراوە.دوو ڕێگا دەگرنەبەر،لەپێناو بەرژەوەندی و ڕزگارکردنی خۆیان لەسێدارەبەم جۆرەرێک دەکەون و پیلان دادەڕێژن بۆ جێبەجێکردنی.

شێخ ئەحمەد و عەشیرەتی بارزانی بەگشتی هەر هەموویان خۆیان تەسلیم بەحکومەت بکەن. مەلا مستەفا لەگەڵ ژمارەیەک روو بکاتەیەکێتی سۆڤیەت.گەیشتنی مەلا مستەفا و هاورێکانی بەسلامەتی ئەبێتەمایەی سلامەتی هەموو ئەوانەی خۆیان تەسلیم بەحکومەت کردوە.مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد و میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی ، داوا لەئەفسەرەکان دەکەن خۆیان تەسلیم بەحکومەت نەکەنەوەچون گیانیان دەکەوێتەمەترسی،وەرن ئەم رێگای ئێمەبگرنەبەر.

یەکەم: شێخ ئەحمەد بارزانی لەگەڵ عەشیرەتەکەی خۆیان تەسلیم بەحکومەت کرد.

دووەم : مەلا ستەفا لەگەڵ 550 جەنگاوەر و میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی و برایەکی مەلاستەفا بەرەو یەکێتی سۆڤیاترۆیشتن.

چەند تێبینییەک: ئەفسەرەکانی کوردی باشور کەبەشداریانکرد لەکۆماری کوردستانی رۆژهەڵات،بەکر عبدالکریم حویزی،مستەفا خۆشناو،عزت عەزیز،محەمەد قودسی،نوری ئەحمەد تاها،جەلال ئەمین بەگ،میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی،خێر اللهعەبدولکەریم.

1. بەکر عەبدولکەریم حویزی و جەلال ئەمین بەگ و نوری ئەحمەد تاها،خۆیان تەسلیم حکومەت نەکرد.

دوای ماوەیەکی زۆر مەلیک مەحمود داوای لەپادشای عێراق کەئەو کات جێنشین (وەسی)بووکرد.لەسەر داواکردنی شێخ مەحمود ئەوەبوو بڕیاری گشتی لەجێگری خاوەن شکۆ دەرچوو و بەکر ئاغا ئازاد و سەر بەست بوو.

جەلال ئەمین بەگ: دوای ماوەیەک خۆی تەسلیم کرد.یەکەم کات خرایەژوری لەسێدارەدان،لەسەرداوای ماجد مستەفا کەسایەتی کوردی ناسراو، بڕیاری گشتی لەجێگری خاوەن شکۆوەدەرچوو،جەلال ئەمین بەگ ئازاد و سەربەست بوو.

نوری ئەحمەد تاها: رزگار بوو.

2. عزت عەزیز،مستەفا خۆشناو،محەمەد قدسی،خەیر اللهعەبدولکەریم خۆیان تەسلیم بەحکومەت کرد.

بەرێز ئەیوب بارزانی برازا و زاوای مەلا مستەفای بارزانی لەکتێبەکەیدا "بەرهەڵستکاری کوردی بۆ داگیرکردن لەنێوان ساڵانی 1914/1918 لەلاپەرەکانی 228 و 247 و 317 " دەڵێت: حکومەتی عێراقی کورتبینی خۆی کاتێک دەرخست کە

حوکمی لەسێدارەدانی دەرحەق بەچوار ئەفسەرەکوردەکەدەرکرد.ئەوچوارەش دوای ئەوەی بڕیاری لەسێدارەدانەکەیان پێ راگەیاندرا دوا وەسیەتنامەی خۆیان بۆ گەلی کورد نوسی کەتێکرا لەدوو بەش پێکهاتوە:

1. بانگەشەی گەلی کورد بۆ یەکبوون و بەردەوام بوون لەخەبات لەپێناوی رزگاریدا.
2. گەلی کورد دوای نەخوێندەواری نەکەوێ و بەهەموو هێزێکیەوەدژی نەخوێندەواری بجەنگێ.لەوەسیەتنامەکەیاندا دەردەکەوێ کەئەو چوار ئەفسەرەگەلی کوردیان لەوابەستەبوون بەسەرکردایەتییەکی نەخوێندەوارەوەئاگادار کردوەتەوە.سەرکردەکانی پارتی دیموکراتیش هەڵنەستان بەئەرکی خۆیان لەگەیاندنی ئەم وەسیەتەبەگەلی کورد بەپێی پێداویستیەکانی سەرراستی.خۆشیان گرنگی پێویستیان پێنەداوە.چونکەلەگەڵ وریاکردنەوەی گەلی کورد لەوابەستەنەبوون بەسەرکردایەتییکی ناشایستەوە،هۆکاری ئەزمونەکەی خۆیان دەردەکەوێت.ئەم چوارکەسەناوی ئەو سەرکردەیان نەبردوەتا دڵی حکومەتی عێراقی کەحوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپاندبون، خۆش نەکەن. لەرۆژی 1947/6/18 یشا لەبەعشا لەسێدارەدران.

سەرنج : بۆ زانیاری خوێنەر دەبێت بڵێم کەئەو چوار کەسەمەبەستیان لەسەرکردەی ناشایست و نەخوێندەوار ،شەخسی مەلا مستەفا بوو.

3. مەلا مستەفا لەگەڵ یەکێک لەبراکانی و یرحاج ئەحمەد ئاکرینی و 500 هاوڵاتی روویان کردەیەکێتی سۆڤیەت.

وا باو بوو کەبارزانی سەرکردە، پلەی ژنراڵی لەیەکێتی سۆڤیەت بەدەست هێنابێت.ئەوەش هەمووی قسەی پروپوچەو راستی مەسەلەکەبەم چەشنەبوو.مامەڵەی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت لەگەڵ مەلامستەفا و یاریدەرەکانی،مامەڵەیێکی خراپ بوو.هەر هەموویان دابەشکرابوون بەسەر شار و دێهاتەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا و باری گوزەرانیان پشت گوێ

خرابووەبۆیەناچار بوون زۆر کار بکەن کە شیاوی ئەوان نەبووە،بۆ وێنەمەلامستەفا کاری قەسابی و کاری لەم چەشنەی کردوە.

بەکر عەبدولکەریم کەکەسایەتیێکی شۆڕشگێڕ ونیشتمانپەروەر و ناسراوەوتی: کەمەلا مستەفا سەفەری تارانی کرد،بەندەلەسەر بڕیاری شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا بەڕێوەبەرایەتی هەموو بارزانیەکان و هاوڵاتیانی کوردی باشور بووم.کەمەلامستەفا لەتاران دەبێت بۆ بەرژەوەندی گشتی سەردانی باڵوێزخانەی ئەمرێکی دەکات. ئەو چاوپێکەوتنە کە لە بەرژەوەندی کورد بوو لە لایەن KGB وەبە خراپ وەرگیرا ،بۆیە هەموو چەشنە خراپەیەکیان لەگەڵ مەلا مستەفا و هاورێکانی کرد .

5/ نوری سەعید سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق لەساڵی 1956 لەکۆبنەوەیێکی رۆژنامەگەرییدا نەخشەی عێراق و ئێران و رەسیا هەڵدەواسێت،دەڵێت مەلامستەفای بارزانی لەگەڵ سی هەزار چەکدار لەسەر سنوری نێوان سۆڤیەت و ئێران ەباروتۆخێکی ترسناکی دروست کردوەبۆ سەرخاکی عێراق.لەبەر ئەوەمن ناچارم پەیوەندیم لەگەڵ حکومەتی بەریتانیا و ئەمریکا، لەپێناو بەرژەوەندی عێراق بەهێز بکەم. ئەم رۆژنامەگەرییەی نوری سەعید بەخێر دەگەڕێت بۆ مەلا مستەفا.

6 / لەساڵی 1956 مەلامستەفای بارزانی دەگوازنەوەبۆ مسکۆ،کتوپڕ باروتۆخی گوزەرانی باش دەبێت.

شۆڕشی 14 ی تەموزی ساڵی 1958 بەسەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم بەرپابوو.گەورەترین رووداویش بوو لەمێژووی عێراقدا.

لە1958/7/ دا کوردەکانی نیشتەجێی بەغداد لەگەڵ نوێنەرانی کوردی هەموو ناوچەکوردنشینەکان روویانکردەوەزارەتی بەرگری.دوابەدوای پیرۆز بایی کردن لەسەر کردەبەزنەی سەرکەوتنیەوە،مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وتارێکی خوێندەوەکەلەئاستێکی زۆر بەرزدا بوو.

هەروەها بەهۆی پێداگرتنی عەبدولکەریم قاسم ، مادەی سێیەم لەدەستوری کاتی دارێژرا کەلە تەموزدا دەرچو.لەوماوەیەشدا بۆ یەکام جار لە مێژووی دەوڵەتی عێراقدا،بەڵکو لە مێژووی کوردستاندا،دان نرا بەشەراکەتی کورد و عەرەب لەیەک نیشتماندا.

ئەوەبوو مەلا مستەفا بارزانی لەرۆژی شەشی تشرینی دووەمی ساڵی 1958 لەیەکێتی سۆڤیەت گەڕایەوە.

بەڕێز ئەیوب بارزانی لەکتێبەکەیدا بەناوی " بەرگری بۆ داگیرکردنی (1924/ 1918) هێناویەتی،کەبێ ئەوەی هیچی لەسەر بڵێین لەلاپەرەکانی 247/246 ئەمەی نوسیوە " مەلامستەفا،پایەوگرنگی ئەو پروپاگەندەیەی بۆ دەرکەوت کەلەو کاتەی لەدەرەوەی وڵات بوو لێپرسراوانی حزب بۆیان کرد وکاریگەری زۆریان لەناو کۆمەڵی کوردیدا کەهێشتا بەپڕوپاگەندەرانەهاتبوون هەبوو.هەروەها کاریگەریش بوو بۆ ناو دەرکردنی لەناو جەماوەردا بەشێوەیەک کەخۆی چاوەڕێی نەدەکرد.بۆیشی دەرکەوت کەپڕوپاگەندەشتی نامەعقولدەکات بەمەعقول.گومان لەوەشدا نییەکەئەوپەڕی ساویلکەیی لەناو ریزی گەلدا پەیدیکرد وهاوڵاتیان ئامادەن بڕوا بەهەموو شتێک بکەن.ج جا مەلا مستەفا بیرتیژ و خەیاڵ فراوان و ئاخێوەرێکی لێهاتو بوو کەلەرێی باسکردنی رۆڵی لەم شەڕەیان ئەوەی تردا هەستی گوێگرانی دەوروبەری جۆشدا. هەروەها توانایەکی گەورەی هەبوو بۆ باسکردنی وردەکاری رووداوەکان و جۆنیەتی هاتنیان بەشێوەیەک کەگوێگر هەستی دەکرد بەراستی لەبەر دەم دیمەنێکی سەرسوڕهێنەردایە.

کاتێک مەلا مستەفا گەڕایەوەبۆ بارزان و ئەو دڵبەند بوونەسەرانسەرییەی بەرامبەر عەبدولکەریم قاسم و کودەتا بینی ئەگەڵ ئەو هەموو چالاکیەی دەدرێتەپاڵی،ئەمەی بەدڵ نەبوو.بەڵام توانی بەئاسانی بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا سەرکەوێت و بێ خۆماندوو کردن یان خۆخستنەمەترسیەوە،توانی بەرەکەی لەژێر پێ دەربکات.جا لەچەند دانیشتنێکدا کەژمارەیەک لەمنداڵەکانی بنەماڵەی بارزانی ئامادەبوون.

ئەکاتێکدا هەمووان گوێیان بۆ شل کردبوو،قسەی زۆر سەرسوڕ هێنەری کرد و وتی:

خەڵک وادەزانن عەبدولکەریم قاسم سەرکردەی راستەقینەی کودەتاکەیە.بەڵام ئەمە راست نییە،چاک وایەئەم نهێنییەتەنها بۆ ئەوانەبدرکێنێ کەجێی باوڕن. کاتێک لە مسکۆ بووم سەرکردایەتی سۆڤیەت رایان سپاردم پلان بۆ کودەتا لەبەغدا دانێم.پەلەم نەکرد لەجێبەجێ کردنی داواکەیاندا،بەڵام لەکۆتاییدا چەند مەرجێکم بۆ دیاریکردن.کاتێکیش ئەوان رازی بوون، منیش داواکەیان جێبەجێ کرد.

دوای ئەوەی بەفڕکەیەکی تایبەتی گەیاندمیانەشوێنێکی نزیک بەغدا بێ ئەوەی کەس پێبزانێت شەو لەوێ دابەزیم چاوم بەئەفسەرەئازادەکان کەوت و وردەکاریی پیلانەکەو چۆنیەتی جێبەجێ کردنیم بۆ باس کردن.لەناو ئەو ئەفسەرانەدا عەبدولکەریم قاسمم بەردڵ کەوت،ئەوان گوێییان بۆ شل کردم و پیلانەکەیان جێبەجێ کرد. بەڵام تەها بامرنی رازی نەبوو خوی بەدەستەوە بدات و زۆر بەتوندی تەقەی دەکرد و هێرشبەرەکان نەیاندەتوانی بچنەناو کۆشکی پاشایەتی و زۆر شپرزەببون،منیش لەبارێکی وادا نەمدەتوانی دەست لەکودەتاچییەکان هەڵگرم.ئیتر ناچار بووم بڕۆم بۆ ئەوەی چونکەکودەتاکەلەوەدا بوو شکست بخوات.چووم بۆ کۆشکی پاشایەتی و بەتوڕەیی بانگی تەها بەمرنیم کرد "تەها لۆک" (ئەمبۆ کاتی سەرزەنشت بەکاردێت)،داوام لێکرد چیتر تەقەنەکات.ئینجا بەدەنگی بەرز هاوارم لێکرد " دەزانی من کێم؟ تەها بامرنی هەر کەدەنگی منی ناسیەوەو بۆی دەرکەوت لەناو ئەفسەرەئازادەکاندام،ئیتر یەکسەر تەقەی راگرت و داوای لێبوردنی کرد.لەسەر ئەوەکودەتاکەسەری گرت و هەموو شتێک درایەدەست عەبدولکەریم قاسم و منیش بەهەمان فڕۆکەگەڕامەوەبۆ مسکۆ،ئیتر بەم شێوەیەدەنگ بڵاو بووەوەکەنەخشەدارێژەری راستەقینەی کودەتاکەمەلا مستەفایەنەک عەبدولکەریم قاسم.

خوێنەری خۆشەویست:

هیچ گرژییەک لەنێوان عەبدولکەریم قاسمی سەرکردەو مەلا مستەفادا نەبوو. 90% داخوازییەکانی مەلا مستەفاش جێبەجێ کران.سەبارەت بەگەلی کوردیش هیچ جیاوازییێک لەنێوان هاوڵاتی کورد و عەرەبدا نەبوو.

لەهەمان کاتدا دوژمنانی کوماری عێراق،شای ئێران و حکومەتی تورکیا و بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا، لەیەکەم هەنگاویاندا کەوتنەپشتگیریکردنی دەرەبەگ و دوابەدوای یاسای چاکسازی کشتوکاڵ(یاسای ژمارەلە1958/9/ ) بەراستی ئەوەبڕیارێکی مێژووی مەزن بوو لەلایەن عەبدولکەریم قاسمی سەرکردەوەدەرکرا.

بەفەرمانی بارزانی کەسایەتی وەک ئەحمەد ئاغای زێباری و سدیق میران ترور کران. ئەوەش بارەکەی بەرەو گرژی برد.

لەکۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی 1961 لێژنەی مەرکەزی کۆبوونەوەبۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی نوێ بەمەبەستی خۆسازدان و گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست.مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد رای وابوو کە: هەرچەندەحکومەتی قاسم لەناوەوەلەدەرەوەش بێ هێزە،بەڵام هێز و توانای ئامادەباشییەکەی بەبەراوەرد لەگەڵ هێز و توانای کوردا جیاوازی زۆرگەورەی هەیەلەرووی چەک و دارایی و لەورووەشەوەکەسوپای عێراق بەچاکترین شێوەیر چەک کراوەلەکاتێکدا چەکدای عەشایەر تفەنگەکانیان ئەو جۆرەن کەلەجەنگی دووەمی جیهانیدا بەکار هێنراون. ئێمە(قسەکەی مامۆستا ئیبارهیم ئەحمەدە) ئامادەنین بۆ شۆرش،رووخاندنی حکومەتی قاسمیش لەبەرژەوەندی گەلی کوردا نییە،هەرچەندەبارودۆخی ئێستای نێوانمان رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو خراپی دەڕوات.

لێرەدا سێ پرسیار قوت دەبنەوە: ئایا بارزانی لەدەرەنجامی خراپ رەفتار کردنیەوەتێوەگلا؟ یان ئایا ئەوەکارێکی پلان بۆ دارێژراو بوو؟ئایا پلانێکی دەرەکی پوچەڵ بوو؟ لەکاتێکدا هیچ پیلانێک لەئارادا نەبوو.یان هیچ داوایەکی سەخت و نەستەم لەلایەن ئەو سەرۆک هۆزانەوەکەدژی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی 1958/9/20 دەوەستانەوەلەئارادا نەبوو.

کۆبوونەوەی ئەندامانی لێژنەی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگوندی عەوداڵان لەو1961/12/25 و راگەیاندنی شۆڕش و خەباتی چەکدارانەو هەڵبژاردنی مەلا مستەفا بارزانی وەکو سەرۆکی حزب و سەرکردەی شۆڕشی لێکەوتەوە.( ئەم رووداوەچەندین پرسیاری لای دوژمنای کورد و لەشۆڕشدا دروست کرد) پاشان مەلا مستەفا کەسەرکردایەتی گەلی کوردستانی گرتەدەست،واتەلەساڵی 1962 هەتا 1975،خەڵکی ئاگادار کردەوەکەجێنشینەکەی کوڕەکانیەتی،بەتایبەتی ئیدریس و مەسعود.

منیش لەسەر ئەوبڕوایەم کەبەرپرسیارێتی گەورەی ئەوەی کەبارزانی دەستی بەسەر کوردستاندا گرت و کوردی گەیاندەئەم چارەنوسەی ئێستای،لەسەدا 95ی لەئەستۆی ئەم بەڕێزانەیە: دوکتۆر محەمەد عەلی عوسمان،جەلال تاڵەبانی،سەیدا ساڵح یوسفی،ئاهیدەسەلام،عەزیز عەقراوی،عەباس مامەند ئاغا،دوکتۆر فواد جەلال،نوری شاوەیس،عەلی عەسکەری،شەمسەدین مفتی،جەلال عەبدالرحمان،عەبدالرحمان زەبیحی،دوکتۆر عزەدین شەمزینی،مەلا عەبدوڵڵئیسماعیل،نوری ئەحمەد تەها،هەمزەعەبدوڵڵا،ئیبراهیم ئەحمەد،عومەر مستەفا،شێخ لەتیف حەفید و کاکەزیاد ئاغا. پێشەوا داوای لێکردن یەکێک هەڵبژێرن بۆسەرۆکی پارتی.

بۆ ئاگاداری زیاتر: تاوانبارانی گەورە کە مەلا مستەفایان هەڵبژارد بۆ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان،هەمزەعەبدوڵڵەو ئیبراهیم ئەحمەد و شێخ لەتیف حەفید و کاکەزیاد ئاغای کۆیی بوون کەمەلا مستەفایان هەڵبژاردەوە و بوو بە دوژمنی کورد و کوردستانیان.

ئەم بەڕێزانە،هەر هەموویان، کەپرسیارت لێکردایەتن کەبۆچی راستەکەتان نەدرکاند،وەڵامیان هەمیشەئەوەبووکەلەپێناو بەرژەوەندی گشتی و دوور خستنەوەی دووبەرەکی لەگەڵی کورد.بەڵام ئەو بارودۆخەهەتاکو ئێستاکەی2009 چارەنەکراوە.

بەڕێز ئەیوب بارزانی برازا و زاوای بارزانی لەکتێبەکەیدا لەلاپەڕەی 8دا دەڵێت:بەڕێز ئیدریس بارزانی لەسەردانێکدا بۆ لەندەن پاش کۆچی دوایی باوکی بەماوەیەکی کەم لەبەر دەم چەند کەسێکدا پێی گوتم رەفتارەخراپەکانی مەلا مستەفا بونەتەهۆی شکست هێنانی شۆڕشی کوردان لەساڵی 1975دا.جا خاک بەدامانی ئەو فەرماندەوا و سەرکردەزاڵمانەلە،لەبەر رق و تۆڵەی جەماوەر لەرۆژی داد و لێپێچینەوەدا،کەپێشم وایەئەو رۆژەنزیکە.

لەکاتێکدا "جیراڵد گالیاند"ی پسپۆر لەکار و باری شۆڕشەکانی جیهانی سێیەمدا دەربارەی مەلا مستەفا و ئەو دەستەسەرکردایەتیەپاڵنتانەی لەنێوان ساڵانی (1958- 1975 ) کاریان لەگەڵدا کردوەدەڵێت: سەرکردایەتی کورد کەم و کورتی لەئایدولوژیایەکی شۆڕشگێرانەو رۆحێکی هاوچەرخانەدا هەبوو.

ئەمەش دەگەڕێتەوەبۆ ئەو جیلی سەرسەرەکیەکەیان،بزوتنەوەی کوردایەتی لەساڵانی1958 - 1975 هەر رەنگدانەوەی دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردایەتی بوو. هیچ سەرکردایەتییەکیش نەیتوانی لەئاستی دواکەوتویی کۆمەڵگای بەرزتر بێتەوەو جەماوەر بەدوای خۆیدا راکێشێت. وەکو ئەوەی زۆر سەرکردایەتی لەجێگایەکدا کردیان. ئەمەوێڕای ئەو ئیفلیجیەی لەمەڵوەمەرجەژنوسیاسیەکەیەوەبۆی ماوەتەوە.ئەمەخاڵێکی گرنگەدەچێتەخانەی هۆکارسەرەکییەکانی لاوازی بزوتنەوەی نیشتمانی.بنەماکانی و عەقڵیەتی و رەفتاری وەکو خۆی بەکلاسیکی مایەوەوهیچنەدەگۆڕا.شتێک هەبوو دەربارەی خووگرتنی بەدیاردەمودێرنەکانەوە،بەڵام شێوازی ماڵیبون و بەکاربردنی ئەو دیاردانەشهیچی نەگۆڕی.بنەما بنەڕەتییەکان هەر ئەوانەی دوێنێ بوون.فێڵی تەکنیکی لەبری شیکردنەوەی سیاسی،بڵاو بوونەوەی خزم خزمێنەو خۆ هەڵواسین بەم و ئەودالەبری هۆشیار کردنەوەی جەماوەر،هەر وەها وازهێنان بەبەرزکردنەوەی چەند دروشمێکی کەمی شۆڕشگێرانەلەبری پیادەکردنی رادیکالیزمێکی راستەقینە.

بەڕێز ئەیوب بارزانی لەلاپەڕەی 7ی کتێبەکەیدا دەڵێت:

تیرەکانی بارزانییەکان لەسەر دەستی رژێمی سەدام حسین لە"قوشتەپە" و " بەحرەکە"و " حەریر" و " دیانا" روو بەرووی شاڵاوی جینوساید بونەوە.ئامانجیش لەوەیەخسیر کردن و تێکشکاندنی تێکڕای کۆمەڵگای بارزانییەکان بوو.

دیکتاتۆری عێراقیش پاساوی ئەو تاوانەی بەهەڵوێستی دوو کوڕەکەی بارزانییەوە( مەسعود و ئیدریس) دەدایەوە، کەدانوستانێکی نهێنیان لەگەڵ رژێمی بەغدا هەبوو، هاوکاتیش هاوکاری سەربازی هێزەکانی ئێرانیان کرد لەکاتی داگیرکردنی "حاجی ئومەران" لەهاوینی ساڵی 1982دا.

بۆیەفەرمانی دا بەگاردیکوماری،تۆڵەلەبارزانییەمەدەنیەکان بکەنەوەکەلەسایەی حکومەتدا دەژیان. ئیدی ئەو گاردەلەی تەموزی ساڵی 1982دا بەزرێپۆش چواردەوری ئوردوگاکانی بارزانییەکانیان گرت و پتر لە2760 بارزانیان دەستگیر کرد و لەو رۆژەوەنەوانەبێ سەر وشوێنن.

پاش کۆچی دوایی ئیدریس بارزانی دەبوو یەکێک لەبنەماڵەکەی لەهەر رەگەزێک بێت جێکەی بگرێتەوە،کەسیش نەبوو جگەلەنێچیرڤان کەبخرێتەبەرزترین پلەو کاروباری میلەتی کورد بدرێتەدەستی. سەیریش لەوەیەکەهەتا رۆژی دەرکەوتنی لەسەرشاشەکەس نەیدەناسی،واتەهیچ چالاکییەکی سیاسی پێشتر یان ــــ تامەیەکی زانستی نەبوو.

قسەهێشتا هی بەڕێز ئەیوب بارزانییە لە لاپەڕەی "7"ی کتێبی ناوبراو:

مافی جەماوەرەکەنەو سەرکردانەیان بناسن کەمتمانەی خۆیان پێیەخیون،رابووردویان و ئاستی لەخۆبووردیان و چۆنیەتی رەفتاریاتلەکاتی لێقەوماندا و رادەی دڵسۆزییان بۆمەسەلەی سەربەخۆیی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەتەواوەتی و بێ نوقسانی بیزانن.ئەوەش تەنها بەپشتبەستن بەقسەکانیان نابێت بەڵکو بەکردەوەکانیشیان.

بەڕێز ئەیوب بارزانی لەلاپەڕەی 204 دا ناوی بەڕێز مەسعود بارزانی ئاوەها هێناوە: لەراستیدا کەسی بنەماڵەی بارزانییەکان لەزیندانی و دوورخستنەوەرزگار نەبوو،جگەلەدواهەمین ژنی بارزانی و مەسعودی کوڕی.کاتێک مەحمەد ئاغای زێباری لای دەسەڵاتدارانی عێراق بۆی تێکەوت و ئەوانیش رێیان پێدا (....) کەکچەکەی ببات بۆ گوندەکەیان(ئیامنی) کەسەر بەپارێزگای موسڵ بوو.لێرەدا دەبێت ئاماژەبەوەبدرێت کەمەسعود بەتەنها لای باپیری مایەوە.ساڵانی پێگەیشتنیشی،واتەهەشت ساڵی سەرەتای ئەشونومای منداڵ کەلەسایکۆلۆژیدا بە(The formative yars ) ناسراوە.لەژێر رکێفی نەنک و باپیریدا بەسەر برد،ئەو ژینگەکۆمەڵایەتیەش دژ بەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و بنەماکانی و مێژوی بارزانی بوو.ئەمەش کەسایەتییەکی سەیر و نامۆی بۆ دروست کردد.

هەر لەو کاتەوەکەتەمەنی گەیشتەپازدەساڵان کلیلی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی لەگەڵ باوکیدا گرتەدەست.ئەوەش لەساڵی 1962وەهەتا ساڵی 1975،هەتا ئەمڕۆش هەر خۆی تاکەفەرمانرەوای رەهایەو بەمەبەشقی خەڵکی کارامەو لەگەڵ ئەزموونی چەندین ساڵەی خۆیدا بووەبەپسپۆڕ لەبواری فرت و فێڵی سیخوڕیانە.جگەلەسفەتی دوژمن کارانەی کەلەدوژمنایەتی بنەماڵەکەیەوە(باپیرانی لەهەر دوو سەرەوە)بۆی ماوەتەوە،لەوانەرق و متمانەنەکردن بەکەس و بێ ئەمەکی و ستەمکردن ،چونکی وا راهاتبوو کە% و بێ ورتەفەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن. ئەوش وەها دەکات کەئەو کەسەی دەیێتەباوەری تاوانبار بکرێت لەهەموو لایەکەوە،بەو شێوەیەناچار بێت لەخزمەتکردنیدا بمێنێتەوە. بەدرێژایەتی مێژوو ئەمەئەرێتی ئەوکەسانەیەکەخەسڵەتی دیکتاتۆریان تێدایە.یەکێکیش لەخسڵەتەکانیان ئەوەیەکەنهێنپارێزن و نهێنی خۆیان نادرکێنن و ئەهاورێیان هەیەو نەبرادەر.

خوشک و برای ئازیزم:

پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرەتای دامەزراندنیدا حیزبێکی سیاسی نەتەوەیی بوو.مەشخەڵی رزگارکردنی کوردستانی هەڵگرتبوو.بەڵام بەداخەوە،مەلا مستەفای خائن بەنەخشەو پلانێکی دارێژراو توانی بەبەشداری حکومەتی دیکتاتۆرعەبدولسەلام عارف،کودەتا بەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بکات.ئەوەبوو لەمانگی تەمووزی ساڵی 1964 سمینارێکیان بەست بەناوی کۆنگرەی شەشەمی قەڵادزێ.مەلا مستەفای بارزانیان هەڵبژارد بەسەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕش.

ئەم بنەماڵەیەشێوازی کارکردنیان شێوازێکی هەواڵگریی روونە.هەر لەیەکەم رۆژێکەوەپارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕش کەوتەژێر دەسەڵاتیان،ئەوەبوو بەفەرمانی بارزانی و بەئاگاداری حکومەتی عەبدولسەلام عارف ،چەکدارەکانی بارزانی هێرشیان بردەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیمراتی کوردستان و ناچاریان کردن کەبارەگای سەرکردایەتی خۆیان کە"ماوت" بوو راکەن.بۆ ئەوەی تووشی شەڕی براکوژی نەبن چونەئێران.

ئینجا دەستیان کرد بەپاکسازی هەموو کادر و مەسئولانی پێشمەرگەکەلەرێکخراوی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون،دووریاین خستنەوە. پاش ئەوەنەخشەو پلانێکی ستراتیژیان دارشت لەپێناو چۆنیەتی دەسەڵاتی بەیەکجاری بەسەر کوردستانی باشوردا.

لەپێناو جێبەجێکردنی پرۆژەکەیان یەک لەدوای یەک چەندەها بارەگا و نوسینگەو دەزگای ئاسایش و هەواڵگریان دامەزراند و گرێیەستیان بەسی لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان.پێشەکی یەکسەر ئەم بارەگا و نوسینگەو دەستگای هەواڵگرییەیان دەمەزراند:

بارەگای سەرەکی مەلا مستەفای بارزانی،لێپرسراوی بارەگا ئیدریس و یاریدەری مەسعود.ڕێکخراوی پارتی و هێزی پێشمەرگەو دارایی و پەیوەندیەکانی ناوەوەو دەرەوەو گرێبەستەکان و عەشیرەتەکان.
دەزگای پاراستنی "هەواڵگری شۆڕش" دامەزرا و ئەرکی بەمەسعود سپێردرا.

نەخشەو پیلان و بیر و بۆچون و هەڵوێست و بیرکرنەوەیان و گرنگترین شت ئیشکیان خستەسەر ئەم خاڵانەی سەرەوەو ئەنجام دالی، ئینجا بەپلەی یەکەم سەروەت و سامانی کوردستان بەگشتی لەخەزێنەی تایبەتی خودی خۆیاندا بێت.بیرکردنەوەیان بازرگانی سەرمایەدارییەکی رووتە.هاوڵاتیان بەگشتی لەژن و پیاو،هەژار و لێقەوماو و برسی بێت،بۆ ئەوەی ناچار بن هەموو چین و توێژەکان لەخزمەتیاندا بن،تاکو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن.

لەرێگای دەزگا جۆراوجۆرەکانی راگەیاندنەوە،بەردەوام خەریکی تەفرەدانی خەلک و هەڵخەڵەتاندنیانن.هەموو گوڤار و رادیۆ و کەناڵەتەلەفزیونەجۆراوجۆرەکانیان و وەزارەتی رەوشەنبیریان خستوەتەخزمەتی خۆیان.لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا چەندین رۆشنبیر و نوسەریان راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ کڕیوە.هیچ حزبێکی کوردی بەئەندازەی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکراوەو نوسین لەسەر کوردایەتی دەرناکات،بەڵام لەواقیعدا بەئەندازەی بنەماڵەی بارزانی دژی کورد و کوردستان لەهیچکوێ پەیدا نابێت.ئەم خائینانەدەستیان بەخوێنی کورد سور بوو،مەسعود،نێچیرڤان،دڵشاد،وەجیەو سوداد و نیهاد و مەسرور.

عەشیرەتەکان:

دوژمنی سەرەکی هەموو سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردن. لەرێگای دژایەتی کردنی ئەو عەشیرەتانەوە خۆیان بەسەر کوردستاندا سەپاندوە. لێرەشدا بەهەڵوێستی نابەرپرسانەو دوژمنکارانەیان بەرانبەربەعەشیرەتەناسراوەکانی گەلەکەمان بوتەهۆی ئەوەی کەچەندین گوندیان سوتاندوەو تاڵانیان کردوەو دەربەدەر کراون. لەرێگای درۆ و فێڵەگەورەکانیانەوە، ناو و سومعەی ئەو عەشیرەتانەیانزڕاندوە.بەکورتی لەخارەوەتیشک دەخەمەسەر ئیستا و رابردوویان.

عەشیرەتی برادۆست:

کاتێک کەشۆڕشی ئەیلول دەستی پێکرد،برادۆستیەکان وەکو هەموو عەشیرەتەکانی کوردپەروەرۆڵێکی سەرەکییان هەبوو لەسەرخستنی شۆڕشەکەدا. مەلا مستەفای بارزانی فەرمانی کوشتنی کەریم خان دەدات،جەلال تاڵەبانی ئاگاداری کەریم خان دەکات.کەریم خان لەگەڵ لەشکری برادۆستی ناچار دەبێت لەدۆڵی باڵکایەتی بکشێنەوەبەرەو ناوچەکانی خۆیان.

لەهاوینی ساڵی 1962دا مەلا مستەفا لەگەڵ هێزێکی گەورەی بارزانییەکان و ژمارەیەکی زۆر لە هێزی پێشمەرگەبەناوی کوردایەتییەوەپەلاماری عەشیرەتی برادۆست دەدات. لەئەنجامدا شەڕێکی گەورەی چەند رۆژی بەرپا بوو کەئاکامەکەی ئاوارەکردنی دوبارەی برادۆستەکان بوو بەرەو وڵاتانی ئێران و تورکیە.تاکو ساڵی 1970 کەبەیانی 11 ی ئازار دەرچوو،دوبارەعەشیرەتی برادۆست گەڕانەوەناوچەکانی خۆیان،بەوناوەی کەهەموو شتێک کۆتایی هاتوە.بەڵام بارزانییەکان کەوتنەپیلان دانان و شەڕفرۆشتن بەعەشیرەتی برادۆست. وایان کرد کەکەریم خان و ئامۆزاکانی و هەندێک لەپیاوەکانی پەنا بۆ رژێم بەرن تا کۆتانی ساڵی 1975 لەناوچەی موسڵ جێ نشین بن.

عەشیرەتی دۆڵەمەڕی:

دۆڵەمەڕییەکان لەراپەڕینی ساڵی 1991 دا بەشداری بەرچاویان بینی.هەر بۆیەکاتێک مەسعود بارزانی هاتەوەکوردستانی ئازاد،سەرەتا نەخشەی و پیلانی ئەوەبوو لەسەرانسەری کوردستانی باشور ئاڵای ئاشتی لەنێوان هەموو عەشیرەتەکان بەرقەرار بێت.مەسعود بارزانی سەردانی سەعید ئاغا دەکات،کاتێک دەگاتەگوندی "سارداوا" ،لەدیوەخانەکەیدا روودەکاتەسەعید ئاغا و لەبەرچاوی هەموو ئامادەبووان دەڵێت: گەلێ میللەتی بارزان ئەز پەشیوانم لەهەموو غەڵەتی بابی من "مەلا مستەفا " کەلەگەڵ "ئەسعەد ئاغای شێتنە " کردویەتی.

سەعید ئاغا دەڵێت: کەرەم کەکەئەز بەلی فەرمو دانیشە.

ئەمەیەکەم جارەلەنێوان بنەماڵەی بارزانی و عەشیرەتی دۆڵەمەڕیەکان دوای ئەوهەموو شەڕ و شۆڕەناشتی بەرقەرار دەبێت.

مەسعود بارزانی ماوەی چوارمانگەو بیست رۆژ لەگەڵ ژمارەی(500) چەکداری،میوانی دەبێت و رۆژانەش 100 هاوڵاتی سەردانی دەکەن.

لەدوای 31ی ئاب /1996 بەیەک حەفتەنێچیرڤان بارزانی نوسراوەیێک ئاراستەی سەعید ئاغا دەکات،داوای لێدەکات تەشریفی بێتەقەزای سۆران بۆ نیوەڕۆ دەعوەتی مەسعودە.

سەعید ئاغا لەگەڵ کورەکەی محەمەد عەلی دەچنەقەزای سۆران بۆ دیداری مەسعود بارزانی،یەکسەر دەسبەسەریان دەکەن.بنەماڵەی بارزانی هەتاکو ئێستاکەئاشکرای ناکەن ئایا ماون یان نا ؟

عەشیرەتی سورچی:

ئەم عەشیرەتەلەمێژووی خۆیدا چەندین فیداکاری و هەڵسوکەوتی جوانمێرانەی بەرامبەر گەل و نیشتمان داوە.

چەند نمونەیەک : لەساڵی 1988 کاتێک رژیم دوڵی بالیسان کیمیاباران دەکات،خەڵکی ناوچەکەهانا بۆ عەشیرەتی سورچی دەبەن.

زەید ئاغای سورچی بەهانایانەوە دەچێ، یەک سەر هەموو زامدارەکاندەگەیێنێتەنەخۆشخانەی سەربازی.بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکەئەفسەر دەبێت،دەڵێت: زێد ئاغا تیمارکردنی بریندارانی چەکی کیمیاوی قەدەغەیەو ئەگەر زامدارەکەسەربازی عێراقیش بێت.

زێد ئاغا دەمانچەکەی دەخاتەناودەمی ئەفسەرەکەو دەڵێت هەر ئێستاکەدەبێت زامدارەکان تیمار کەیت.زێد ئاغا توشی گیر و گرفتێکی زۆر دەبێت و دواجارەروانەی دادگای عەسکەری دەکرێت.

3. لەسەرەتای راپەڕین لەعەیلەقی هەولێر کۆبونەوە بەموستەشارەکان دەکەن،بەناوی سەرکردایەتی شۆرشی بەعسەوەپێیان رادەگەیێنن کەلەمەودوا لەهەر گوندێک ئەگەر یەک پێشمەرگەی لێ بێت هەر هەموو گوندەکەکیمیا باران دەکەین.

ئومەر ئاغای سورچی پرسیار دەکات دەڵێت: گوندەکەی من کە کەلەکینە نزیکەی 500 ماڵە،ئایا ئەگەر کوڕێک لەیەکێک لەوماڵانەچووەناو پێشمەرگە، ئایا ئێوەئەوکاتەهەموو گوندەکەکیمیا باران دەکەن؟

بەرپرسیارەکەوەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: ئەمەفەرمان و بڕیاری سەرکردایەتی شۆرشەکەیەک سەر هەموو گوندەکەکیمیا باران و وێران دەکرێت.

ئەم هەڵوێستەجوانمێرانەی ئومەر ئاغای سورچی بوو بەهۆی ئەمەی لەکۆی 415 موستەشار 409 یان دەنگی نارەزایەتی خۆیان خستەپاڵ ئومەر ئاغا.تەنها شەش موستەشاریان لەگەڵ بڕیاری سەرکردایەتی شۆرشی بەعسی دابوون،چونەدەرێ.

لەسەعات 9ی بەیانیەوەتاکو 5ی ئێوارەدەرگایان لەسەر دادەخەن.ئەو 409 مستەشارەلەناو خۆیاندا گفتوگۆ و قسەدەکەن.بڕیار دەدەن ئەگەر ئەم جارەرزگاریان بێت بەڵێن دەدەن لەداهاتودا هەموو هێز و توانای خۆیان دژی رژیم بەکار بهێنن.

4. لەکاتی راپەڕین سورچیەکان رۆڵی سەرەکیان هەبوو لەراماڵینی سوپای عێراقی و رزگار کردنی ناوچەکانی تر.بەتایبەتی لەرزگارکردنی کەرکوک.

5. نمونەیەک: لەسەر رەوشتی خیانەتکارانەی بنەماڵەی بارزانی کەهەرگیز گوێیان بەهیچ پێوەر و ئەخلاقێکی کوردەواری نەداوە.تاوانبار "کەریم جومعە" کادرێکی دەزگای پاراستن و تەتەری تایبەتی مەسعود بارزانیە.

لە1996/6/ کەریم جومعەنامەیەک لەمەسعود بارزانی دەبا بۆ حسەین ئاغای سورچی،تەسلیمی دەکات و پێی رادەگەیێنی کەسەرۆک مەسعود بارزانی سڵاو و رێزی هەیەبۆبەرێزتان و بۆ خانەوادەتان،حەز لەچاوپێکەوتنتان دەکات و پێخۆشەدووبەدوو دەربارەی ئەو بارودۆخەگفتوگۆ بکەن.جا سبەی سەرۆک لەسەر سفرەی بەرێزتان نانی نیوەڕۆ لای تۆ دەخوات و میوانت دەبێت.بۆ ئاگاداریت سەرۆک بەتەنهایە.

حسین ئاغای سورچی کەنوسراوەکەدەخوێنێتەوەئەو قسەجوانەی کەکەریم جومعەپێی رادەگەیێنێ،یەک بڕیار و فەرمان دەردەکات کەهەرچی چەکدار لەگوندەکەهەیەبەبرا و برازای خۆشمەوە،رازی نیم لێرەبمێنن. چون کاک مەسعود بەیانی بەتەنها دێت و مەبەست لەهاتنیشی وتووێژ کردنەو بەس.

زێد ئاغای سورچی کەبرازا و زاوای حسین ئاغایەدەچێتەخزمەت حسین ئاغا و هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دەدات کەئێستا کەدوو هەزار چەکدار لەناو گوندەچەریگایەک لەکۆبوونەوەی ئێوەدەگرێت،ئەو فەرمانەی تۆ لەبەرژەوەندی عەشیرەتیسورچی و شەخسی خۆت نییە.بنەماڵەی بارزان هەتاکو ئێستا چەند جار لەخشەو پیلانیان داناوەبۆ تیرۆر کردنت.

حسین ئاغا فەرمان بەزێد ئاغا دەدات کەدەبێت هەر ئێستا خۆت و هەرچی چەکدار هەیەبڕۆنەدەرێ لەگوندەکە.زێد ئاغا و هەرچی چەکدار هەیەحسین ئاغ بەجێ دەهێڵن و بڵاوەی لێدەکەن.

لەبرواری 1996/6/16 دا 2000 میلیشیای بنەماڵەی بارزانی چوار دەوری گوندەکەدەگرن و سەرەرێگاکان ناهێڵن هات و چۆ بکرێت.ئینجا بەچەکی سوک و قورس هێرش دەبەنەسەرگوندی کەلەکین و ئەمڕوو دەدات کەلەخوارەوەئاماژەی پێدەدەم:

حسین ئاغای خدر ئاغای سورچی بەزامداری بەدیل دەگیرێت.ئاگاداری مەسعود دەکەن،ئینجا مەسعود بڕیاری کوشتنی دەدات و مزوک خێزانی عەلی عبداللەحاملەدەبێت دەکوژرێت.فتح اللەحەمەحافز،حەمەدەمین یوسف حسین دەکوژرێن.

ئەمانەش زامدار دەبن: مەحمود خنزالی،فارس حەمەئەمین،سەمەد هەینی،کۆمار بادین،سۆران سالح،عەلی مەلا رەسول،فرسەت بایز رەحمان،

ئەمانەش لە1996/6/ بەدیل دەگیرێن وەهەتاکو ئێستاش هەر بێ سەر و شوێنن و دوارۆژیان دیار نییە.(ناوی بەدیگیراوەکان نەهاتوە)

20کەس لەهاوڵاتییانی دانیشتوی گوندەکەدەگرن،ماوەیەک لەگرتوخانەی تایبەتی مانەوە.بەڵام هەر هەموویان گەڕانەوەبۆ نێو خانەوادەکانیان.

گوندەکەیان تاڵان کرد ،ئینجا ئەوتیان خستەژێر دارەکان و سوتاندیان.لە/ئاب/ساڵی 1996 هێرشیان بردەسەر هەولێرو حلجی جەمیلی برای حسین ئاغای سورچی دەستگیر دەکەن،بەفەرمانی مەسعود تیرۆری دەکەن.

تێبینی: بەبۆچونی خۆم دوو هۆی سەرەکی هەبوو کەمەسعود بارزانی هێرشی بردەسەر عەشیرەتی سورچییەکان.

لەسەر داواکردنی رژێمی عێراق بوو.چونکی بنەماڵەی سورچی حیزبێکی سیاسیان داناوە،ناوی پارتی پارێزگارانی کوردستانە،ولایەتی موسڵی تازەکردەوە.هیوادارم رۆژگار ئەم راستیەدەربخات.
ئەخشەو پیلانی باوکیان بوو کەوەسیەتی بۆ کردوون کەدەبێت هەوڵی ئەوەبدەن کەبەتەواوەتی دەسەڵات بەسەر دەبەرەکەتاندا بگرن و ناوچەکەلەژێر کونترۆڵتاندا بێت.نەهێڵن هیچ عەشیرەتێک ئەوەندەبەهێز و توانا بێت،سەرنجی دۆست و دوژمن بۆ خۆی راکێشێت.
دوای حەوت رۆژ لەو رووداوەسەردانی جەنابی شێخ محەمەد و شێخ خالید ئەحمەد بارزانیم کرد.لەکاتی دیدار و وتووێژماندا، حەوت هاوڵاتی بارزانی ئامادەبوون.دەربارەی بارودۆخی ناوچەکەو دوارۆژمان و چۆنیەتی ئایندەمان وتووێژمان دەکرد.

شێخ محەمەد خالید پرسیاری لێکردم:ئایندەی ئێمەچۆن دەبینی؟وتم: مەسعود کارێکی ناجۆری کرد کەهێرشی بردەسەر گوندی کەلەکین،ئینجا کەحسین ئاغای سورچی بەزامداری بەدیل گیرا،دەبوایەتیماریان کردبایەو دەستبەسەر لەلای شەخسی مەسعود دایان بنایەت،نەک مەسعود بەزامداری فەرمانی کوشتنی بدات.

وتی : من ئاگادار نەبووم،رەفیق ئەگەر ئامۆژگاریت کردباماایەرێگای مەسعودم نەدەدا ئەم کارەئەنجام بدات.

خوێنەری هێژا:

بنەماڵەی بارزانی لەژێر دروشمی پارێزگاری هەرێمی کوردستان لەدوژمنی داگیرکەر و خۆفرۆشان کەنەتوانن هەرشەلەگیانی هاوڵاتی کورد لەسەر خاکی رزگار کراوی کوردستان بکەن،پۆستیان بەوانەداوەکەبڕوای تەواویان پێیەتی و ملکەچی فەرمانیانن.لەناو ئەوانەدا چەندین سەرکردەهەبوو کەبەرپرسیاریتی ئیداری گەورەیان هەبوو،بەتایبەتی ئەوانەی لەناو دەستگای پاراستندا بوون.بەر لەشۆرش دەستیان زۆرکورت بوو،باری بژێویان لەخوار ئاستی پێویستەوەبوو.بەڵام دوای ئەوەی ئەو پۆستانەیان وەرگرت،هەر هەموویان دەوڵەمەند بوون.هەموو ئەو هاوڵاتیانەی بەناوی خۆیان کار و باری بازرگانی دەکەن ،بەڵام 90% قازانجیان بۆ بنەماڵەی بارزانییەو تەنیا 10% هی خۆیانە.بەو پێیەش هەموویان دەوڵەمەندن و خاوەن چەند ملیۆن دۆلارن.بنەماڵەی بارزانیش ئێستا لەریز دەوڵەمەندانی گەورەی جیهانن.ئەو دەوڵەمەندییەیان بەخوێنی ئەو شەهیدانەوەدەست هێناوەکەخۆیان کردەقوربانی لەپێناو کورد و کوردستاندا و بۆ ئازادی و سەربەستی بوو.

بنەماڵەبارزانی لەساڵی 1964وەلەسەر ئەوەن هەر هاوڵاتییەک چەک هەڵبگرێت و لایەنگری بارزانی نەبێت و ملکەچی فەرمانەکانیان نەبێت،ئەوا ترور کردن چاوەڕوانی دەکات و ناوی لەلیستی خائینەکان بڵاو دەکرێتەوەو حساب بۆ رابردویان و ئەو قوربانیانەی لەپێناو کوردستان داویانە، ناکرێت.

خۆ ئەگەر لەزۆرداری بنەماڵەی بارزانی رزگار ببوایە، ئەوا دەبوو یەکێک لەم چوار رێگایەهەڵبژێرێت.

1. رازی ببێت بەزەبوونی و سوکایەتی پێکردن،کەلەلایەن بنەماڵەی بارزانی و دارودەستەکەیانەوەئاراستەی دەکرێت.
2. بۆ ئەوەی دەستیان پێنەگات،لەشوێنەسەختەکانی چیاکان خۆی قایم بکات،یان لەدوورترین شوێندا لەهەندەران خۆی بشارێتەوەبۆ ئەوەی خۆی و خانەوادەکەی لەدەستیان رزگاریان بێت.
3. ئەگەر بیەوێت لەگۆڕەپانی خەباتدا بەچەکی نیشتمانی بمێنێتەوە، ئەبێت پەیوەندی بەتاقمەکەی جەلال تاڵەبانی بکات لەهەر شوێنێکدا بوون ...
4. ئەگەر ئەو سێ خاڵەی سەرەوەی دەستەبەر نەبوو،دەبێ خۆی تەسلیمی رژێمی عێراق ،ئێران،تورکیا یان سوریا بکات.رازی ببێت بەوەی ناوی خۆی لەکەدار بکات بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی هەبێت.ئینجا ناوی لەلیستی خۆفرۆشان و جاشەکان تۆمار دەکرێت.

بنەماڵەی بارزانی کەدەسەلاتیان بەسەر شۆرشی ئەیلولدا گرت،لەساڵی 1964 وەئینجا کەوتنەئەخشەکێشان و پیلان دانان و پروپاگەندەو هەڵخەڵەتاندنی جەماوەر و بەناو بۆ چۆنیەتی چارەسەر کردنی کێشەی کورد و پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی،کەخەونی زۆرێنەی کوردەلەسەرانسەری کوردستانی گەورە.

گەلی کورد باوری بەپەیامەکەیان هێنا لەشۆرشی ئەیلولدا بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بارزانی، بەشداریان کرد. ئەوەبوو بوو بەگەورەترین شۆرش لەرۆژهەڵاتی ناوەراست.

لەکۆبونەوەکەی جەزایر سەدام و شای ئێران رێکەوتن:

سەدام حسین نیوەی ناوی عەرەبی بەخشی بەشای ئێران،لەبەرامبەردا شای ئێران فەرمانی بەمەلا مستەفا بارزانی دا کە کۆتایی بەشۆرش بێنێت.ئەوەبوو بارزانی ئاشبەتاڵی بەشۆرش کرد،بەمەرجێک دەستی بەسەر سەروەت و سامانی شۆرشدا بگرێت.

لەئەنجامی ئەو کرین و فرۆشتنەبازرگانیەسیاسیە،زەرەرمەندی گەورەیەلەی یەکەم هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب بوو. تەنها سودمەندیش نەتەوەی فارسی کۆنەپەرست و نژاد پەرستی شیعەمەزهەب بوو.

بنەماڵەی بارزانی لەو سەوداییەبوون بەخاوەن 225 ملیۆن دۆلاری ساڵانی 1975.

بەپێی شەریعەت و هەموو یاسایەکی جیهانی بنەماڵەی بارزانی مەسئولن لەگیانی پاکی هەموو کوژراوەکان و ئەوانەش وا توشی ئازار و ئەشکەنجەو زیانی ماڵی بوون.لەساڵی 1964 تاکو ساڵی 1975،لەئەنجامی ئەم جەنگەکۆی 100هەزار کورد کوژران و 100هەزار کوردیش دەربەدەر کران بەرەو هەندەران،5000 کوردیش سەقەت و کەم ئەندام بوون. هەروەها لەم شەرەدا 85000 کەس لەنەتەوەی عەرەب کوژران و 2000 کەسیس سەقەت و کەم ئەندام کران.

سەرنج:

بەڵگەی ئەو 225 ملیۆن دۆلارەیان لەبانکەکانی جیهانی ئەوروپا بەناوی بنەماڵەی بارزانی دایان ناوە.

چەندەها پرسیارم لەبرا و خزم و کەس و کار و هاوڕێکانم و هاوڵاتیان کرد کەدوای ئاش بەتاڵەکەگەڕانەوەعێراق،یارمەتی ماڵی هیچ کەسێکیان نەدابوو.خەڵکانێکی زۆر گیرفانیانبەتاڵ بوو.تەنها ئەو سێ کەسایەتیەناسراوەنەبێت:

حەبیب محەمەد کەریم، سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان: لەتاران هاتەقاهرەبەناوی گەشت و گوزار مقداری دەهەزار دولاری وەردەگرێت،بەڵام گەڕایەوەعێراق و لەرێگای ئاسایشی گشتیەوەپارەکەیان بۆ گۆڕیەوە. عەلی عەسکەری ئاگاداری کردم کە، مقداری دووهەزاردیناری وەرگرتبوو.نوری ئەحمەد تاها ئاگاداری کردم،مقداری پەنجا دیناریان دابوویە.

کاکە نوری ئەحمەد تاها بۆچوونی سەبارەت بەمەلا مستەفای بارزانی سەلبی بوو،بەکەسێکیشی دادەنا کەلەگەڵ بیری پێشکەوتنخوازی نەدەگونجا وڕێزی دەستوری پارتی نەگرێ.کاکەنوری بەراشکاوی بیر و بۆچونی خۆی سەبارەت بەوەی کەهۆی سەرنەکەوتنی کورد دەسەڵاتداری بنەماڵەی بارزانی بوو بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستاندا بوو،دەردەبڕی.کەباسی سەروەت و سامنی بنەماڵەی بارزانی دەکرا و کاکەنوری دەیگوت: ساڵانەبنەماڵەی بارزانی سەدوپەنجا (150) دیناریان لە"گوڵەکەنگر "فرۆشتن دەست دەکەوت.

3. بنەماڵەی بارزانی لەگەڵ شەیتانی گەورە(خومەینی) رابەرایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران رێکەوتن.بنەماڵە وەکو بەڵێندەر لەو پرۆژەی پاکردنەوەی کوردستانی رۆژهەڵات لەهەرچی چەکداری شۆڕشگێڕ هەیە،بەتایبەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران،بەرامبەر بەو بڕەپارەی کەلەنێوان سەرۆکایەتی کۆماری ئیسلامی و ئیدریس و مەسعود دا دیاری کرا بوو.

بەپێی شەریعەت و هەموو یاسایەکی جیهانی بنەماڵەی بارزانی مەسئولن لەگیانی پاکی هەموو ئەوانەی کوژران یان سەقەتو ئیفلیج و دەربەدەر بوون و رویان کردەهەندەران و توشی زیانی ماڵی بوون.

سەرنج:

ئاماژەم پێداوەو ئاشکرا بوو کەبەئاگاداری ئیدریس و مەسعود،ئیتلاعاتی ئێرانی،تەرمەکەی مەلا مستەفایان لەگۆڕەکەی هێناوتەدەرێ ،بەئاگاداری مەسئولەمێزەر رەشەکان.

بۆ نمونە: ستالین ئەو کەسایەتییەناودارەی روسیا، کەدەستی باڵای هەبوو لەرووخاندنی رژێمی هیتلەر و رووخاندنی نازیزم،دوای مردنی و هاتنەسەرکاری خرۆشچۆف،پەردەلەسەر نهێنیەکانی هەڵماڵرا و دەرکەوت.کاتێ گورباچۆف دەسەڵاتی بەدەستەوەگرت،بڕیاری دەرکرد بۆ دوورخستنەوەی مەزاری ستالین لەناو گۆرستانی روسیا بۆ شوێنێکی گشتی.

مەلا مستەفا بارزانی:

ئەو خەیانەتانەی کەساڵها دەرحەق بەکورد و کوردستان ئەنجامی داوە،گەلێک گەورەتر و زۆرترلەو تاوانانەی کەمستەفا کەماڵ و شای ئێران و خومەینی و سەدام حسین دەرحەق بەنەتەوەی کورد ئەنجامیان داوە.

ئەمرۆ بنەماڵەی بارزانی دەسەڵاتیان بسەر کوردستاندا گرتوە.بەپێی ئەخسەو پلانی دارێژراوی تایبەتی خۆیان و داگیرکەران،بڕیار و فەرمان دەردەکەن،شەقامی کوردیان خەفەکردوە.

رۆژێک دەبێت جەماوەر تەرمی مەلا مستەفا و ئیدریس لەگۆڕەکانیان بەئاشکرا بهێننەدەرێ و لەخاکی کوردستانی گەورەیان دوور خەنەوەو تەسلیم بەسەروەکانیان بکاتەوە.چ بەکۆماری ئیسلامی ئێران یان تورکیا یان سوریا.

گەلی کورد دڵنیا دەکەم ئەم رۆژەزۆر نزیک بووە،هەرچەندەسەروەت و سامان و هێز لەدەستیاندایەبەڵام ژێرخانەکەیان بۆشە.

٤. لەساڵی 1964 کەبنەماڵەی بارزانی دەسەڵاتیان بەسەر شۆڕشدا گرت،تا ساڵی 1975 کەئاشبەتاڵیان بەشۆڕش کرد. زنجیرەخەڵکانێکی سیاسی لەریزەکانی گەلی کوردیان لەسەرانسەری کوردستانی گەورەتیرۆر کرد.

لەخوارەوەناوی چەند هاوڵاتییەک بڵاو دەکەمەوە:

کوردستانی باشور:

قەسابخانەکای مەرگەساتی (کانی ماسی ـ سلێمانی): سەد هاوڵاتی تیرۆر و زامدارکران،بەداخەوەتەنها ناو و وێنەی دوانزەهاوڵاتی لام روونە ودەتوانم ئاماژەی پێبدەم.

عەبدولرەحمان سالح،حوسین قادر،نوری حەمدی علی،سالح عەرەب،عەبدوڵلە،مەلا علی،سەید عەبدوللە،مارف حوسین،مەلا محەمەد ئامین،محەمەد مام ئەمین،ئومەر مام عەلی.فەرەج سەعید عەبدوللە(حەمەسور)،ئەحمەد عەزیز رەشوانی،ئەحمەد عەبدوڵلەمیری،مەحمود سلێمان دیگەڵی،شێخ مستەفا بەهرەکانی،عەزەگورگە،ئومەر سۆفی ماوەتی،عوسمان بەکر عەوینی،سەید ئەنوەر گردەعازەبان،عەبدولرەحمان (دارەوان)،مستەفا عەلی،عەزیز حمکو،عەتا بری حمکو،بەکر گومەشینی،قادر حەسەن شەقلاوەیی،حەمەئەمین گورگو،نوری کاکو،حوسەن یونس،ئەحمەد قادر،خورشید حەمەد،ئەحمەد برایم،حەمەئەمین بەکر عەلی،محەمەد عەبدولرەحمان،حەسەن عەبدولرەحمان،سالم سالح ئەفەندی،محەمەدکویرا،عەبدوڵسەرمان،ئەحمەد سەبری،عەبدوڵرەحمان گەرمافی،ئومەر هادی،مەجید سەعید سوور،رەشید قەرەو کۆچەر،محەمەد زیندوو کۆچەر،حەزفیا شلیمون، حسین کەمەکی،سەلاح شێتەرەوف،حەواس میراسەیق بابوخکی،مەستۆ بیفکی،کەریس نیکی گەردی،نیکی گەردی عەتا،ئەحمەد حاجی برا حەمەی جاف،شێخ سەعید کەسنەزانی،کەریم محەمەد سەعید،عەلی عەسکەری،دوکتور خالد محەمەد سعید،عەتا عەباس ئاغا.

5. کوردستانی رۆژ هەڵات:

سلێمان موعینی "سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران،دڵشاد رەسول،مەلا ئاوارە.

6. کوردستانی باکور:

سەعید ئالچی سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردی تورکیا،محەمەد بێگی (باوەرەکەی)،دوکتور شظان،حەکو،بروسک.

7. کوردستانی باشور:

دوانزەکادری حیزبی شیوعی نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەدار لەدەرەوەی وڵات دەگەڕێنەوەعێراق،بەرێگای پیادەی قاچاخ لەکوردستانی باکورەوەبەرەو کوردستانی باشور،دوای ئەوەی بەسڵامەتی دەگەنەناوچەئازادکراوەکان لەزاخۆ.

عیسا سوار فەرماندەی ناوچەی زاخۆ لەسەر بریار و فەرمانی مەلا مستەفای بارزانی هەر هەموویان تیرۆر کردن.

8. شەڕی براکوژی یەکەم:

دوای ئاشبەتاڵی ساڵی 1975،یەکێتی نیشتمانی بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی دامەزرا.بنەماڵەی بارزانیش قیادەی موەقەتیان دامەزراند.

لەسەر سەروەت و سامان و دەسەڵات شەڕی براکوژی لەنێوان شەخسی جەلال تاڵەبانی و ئیدریس و مەسعود دا دەستی پێکرد.بەپێی شەریعەت و هەموو یاسایەکی جیهانی شەخسی جەلال تاڵەبانی و بنەماڵەی بارزانی مەسئولن لەگیانی پاکی هەموو ئەوانەی کوژران و بریندار و سەقەت و دەربەدەر بوون.

سەرنج:

بەندەرەفیق پشدەری خزمەتکاری کورد و کوردستان، دەورێکی سەرەکیم هەبوو لەپێناو بەرقەراری ئاشتی لەنێوان ئەو دوو خوێن مژە(جەلال و بنەماڵەی بارزانی).کاتێ خودی مامۆستا عەلی عەبدوڵڵەو شایەتییەی دا و وتی: رەفیق پشدەری سەرکەوتنی بەدەست هێنا،بەڵام بەناوی عەلی خامنەیی تەواو بوو.لەکتێبەکانمدا بەدوور و درێژی باسم کردوە.

بەندەباس لەساڵی 1985 دەکەم،کەمامۆستا عەلی عەبدوڵڵەو مەسعودو من کۆ ببووینەوە.مەسعود دەربارەی شەخسی نەوشیروان مستەفا رایێکی سەلبی هەبوو.ئەوەبوو بۆم شی کردەوە.

کاک نەوشیروان مستەفا مرۆڤێکی راستگۆ و شەفافەدژی شەڕی براکوژییە.هەرچەندەمن نوێنەری جەلال تاڵەبانیم بۆ گفتوگۆ کردن،بەڵام بۆ ئاگاداریت بەندەهاتم بەنەخشەو پیلانی کاک نەوشیروان مستەفایەکەسەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ناچار کرد کەدەست پێشخەری بکەن بۆ کۆتایی هێنان بەشەڕی براکوژی و هەڵدانەوەی لاپەرەیێکی سپی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان.من لە% باوەڕم بەشەخسی کاک نەوشیروان هەیە،بەڵام بەپێچەوانەبۆ جەلال تاڵەبانی،بۆیەپێش کۆبوونەوەکەئاگادارم کردن کەقسەکانم بۆ دوارۆژی مێژوو تۆمار بکەن.

9. ڕێککەوتنەکەی پارتیدیمکرات و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ساڵی 1994 :

لەسەر بڕیارو فەرمانی حکومەتی تورکیا و CIA و موسادی ئیسرائیل بەنەخشەو پیلانێکی ستراتیژی چەکدارەکانی بنەماڵەی بارزانی و جەلال تاڵەبانی هێرشیان بردەسەر بارەگای گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لەقەندیل و سێ سوچکەکە.

نێچیرڤان بارزانی لەکۆبونەوەیەکی رۆژنامەگەریدا دانی بەوەدا نا و وتی:لەهێرشی پێشمەرگەکانی پارتی و یەکێتی بۆ سەر پ.ک.ک سێهەزار و پانسەد(3500) پێشمەرگەکوژران.ئەی ژمارەی زامدارەکان؟

لەم شەڕەدا نزیکەی 500 کەس لەگەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستانیش شەهید بوون.

سەرنج:

بەپێی شەریعەت و هەموو یاسایەکی جیهانی،جەلال تاڵەبانی و بنەماڵەی بارزانی مەسئولن لەگیانی پاکی هەموو ئەوانەی کوژران و زامدار و سەقەت و کەم ئەندام کران وەیان لەهەندەران دەربەدەر بوون.

10. 31/ئاب/ساڵی 1996 :

لە 1996/8/ تاوانبار خورشید شێرەپارێزگاری هەولێر لەهاوینەهەواری سەلاحەدین لەکۆبونەوەیەکدا لاگەڵ چەکدارانی بنەماڵەی بارزانی دەڵێت:سبەی لەهەولێر چیتان دەست کەوت هەتاکو 72 سەعات سەر بۆ ئێمەو ماڵیش بۆ ئێوە.وەکو خۆی بەزیادەوەجێبەجێکرا.جێی باس و سەرسوڕمانەبنەماڵەی بارزانی ئەوەندەداخ لەدڵ و تورەبوون لەخەڵکی بەشەرەفی شاری هەولێر،هەموو شوێنێکیان بەبێ گوێدان بەهیچ بەها و داب و نەریتێکی کوردەواری تاڵان کرد. کتێبخانەو پەرلەمان و وەزارەتەکانیان تاڵان کرد.هەرچی هاوڵاتی و پێشمەرگەی لەنەخۆشخانەدا هەبوو هەر هەموویان کوشت.لەو هێرشەدا لەهاوڵاتیان 50 کوژرا و 65 برینداربوو و لەپێشمەرگەش 400 کوژراو و 170 زامدار کران.هەموو پێشمەرگەکادرەکانییەکێتی کە بەدیل گیران،هەر هەموویان بەتیرباران کردن و کەسیان بەزیندویی نەهێشتەوە.

سەرنج:

یەکەم: بەرانبەر ئەو پێشێلکرییەی عێراق کەبەراشکاوی ئەنجامی دا،ئەوەجێی سەرسوڕمان بوو کەئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی جددی وەرنەگرت.بەڵکو تەنها بۆ ئەوەی خۆی لەگلەیی دوور بکاتەوە،چەند موشەکێکی نا بەپرۆژەیەکی بەخێو کردنی مریشکەوەلەباشوری عێراق و دوو تانکی شکاویشی سوتاند.

دووهەم: سەرەتا رژێم دوای داگیر کردنی هەولێر و بستیان بنەماڵەدەستیان تاکو بگات کۆمەکییان بکەن بەرەو پێشچون.ئەوەبوو هەموو چەک و جبەخانەکانیان خستەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی بۆ داگیرکردنی هەر هەموو ناوچەکان.یەکێتی دەستی کرد بەپاشەکشێ،تاسەر سنوری ئێران لەسەر کێوەکان خۆی گرتەوە.

سێهەم ؛ مەسعود و سەدام لەو دیدارەدووقۆڵیەداخراوەدا،ڕێککەوتبوون لەسەر ئەوەی کەسەرکەوتنیان بەدەست هێنا ،ئەو کاتەبەیانی 11 ئازاری دووهەم تازەدەکەنەوە.

چوارەم : بەپێی شەریعەت و هەموو یاسایەکی جیهانی بنەماڵەی بارزانی مەسئولن لەگیانی پاکی هەموو ئەوانەی کوژران و زامدار بوون و توشی ئازار و ئەشکەنجەو زەرەری ماڵی بوون ،هەروەها ئەوانەی دەربەدەری هەندەران کران.

پێنجەم : چۆن قەساب حەیوانەکانی نیشان دەکات تاکو کاتێک دزران یان کەگوم بوون،بەهۆی نیشانەکەوەبیانناسێتەوەو داوایان بکاتەوە.31ی ئابیش نیشانەیەکەکەبنەماڵەی بارزانی بەدەستی خۆیان داویانەلەخۆیان و مێژووی خۆیان پێ رەش کردوەو هەتا هەتاشەناسرێتەوەلەو خەیانەتەی کەکردیان دژی گەلی کورد بەگشتی و خۆیان سوک و رسوا کرد.هۆی ئەوەبوو جەماوەر بەگشتی شان بەشانی برا پێشمەرگەکانیان بەشداریان کرد لەو هێرشەی کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان هێنایەسەر چەکدارەکانی بنەماڵەی بارزانی .ئەوەبوو لەهەموو راستێیەکدا رایان کرد چونەوەباوشی دیکتاتۆر سەدام حسێن و دەزگای میتی تورکی.مەسعود بارزانی رایکرد لەسلێمانیەوەهاتەکەرکوک لەگەڕەکی رەحیم ئاوا کەبەگشتی هەر هەمووی دانیشتوانی کوردن،هاوڵاتیان مەسعود تەماتەو هێلکەباران دەکەن.مەسعود لەترسی گیانی خۆی لەکەرکوک هاتوەتەمەخمور،ئینجا دەگەڕێتەوەهەولێر.سەرکردەکانیان بەخانەوادەوەلەهەولێر و هەوارگەی سەلاحەدین رایان کردەباوشی سەروەرەکانیان لەموسڵ و تورکیا.ئەوەبوو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەدیگەلەراوەستان.بەڵام دوای ئەو شکانەی چەکدارانی مەسعود بارزانی ،ئەوەبوو تووشی دڵەڕاوکێ و مەترسیێکی گەورەهات لەهێز و توانای یەکێتی نیشتمانی کوردستان.مەسعود ئاگادای سەفین دزەیی دەکات بەبۆنەی گرتنەوەی هەولێر میواندارێکی گەورەئامادەبووانی لەکاربەدەستانی دەزگای میت ولێپرسراوانی سوپای تورکی و بەسەخاوەتەوەدیارێیکی گەورەیان پێشکەبکە.

سەفین دزەیی :ئەمجا لەسەر نەخشەو پیلانی مەسعود لەهەموو کەناڵەکانیان پرۆپاگەندەبڵاو دەکەنەوەکەیەکێتی نیشتمانی کورستان و پارتی کرێکارانی کوردستان،رێککەوتن و گەریلاکانی پ ک ک بەئاشکرا لەپارێزگای سلێمانی لەگەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی مەشق دەکەن.مەسعود لەبارودۆخێکی نا هەموا بوون لەپێناو مانەوەی خۆی پەنا و هاواری بۆ حکومەتی تورکیا برد و داوای لێکردن سوپای تورکی بێتەکوردستانی باشور.ئەوەبوو دوای چەند مانگێک لەو وتووێژە:

لەبرواری 1997/7/17 رۆژنامەی نیوس تورکیش بڵاوی کردەوەلەزمانی سامی سەنجاری کەپێشنیازی ئەوەدەکات ژمارەی 20 هەزار پێشمەرگەی پارتی ئەتوانێت سنور بپارێزێت.هەموو رێگایەک لەگەریلاکان دەگرێت،لەپێناو پاککردنەوەی ناوچەکوردنشینەکان لەشمالی عێراق کەپ.ک.ک داگیری کردوە،بەمەرجێک بەچەکی تازەیان بەدەستەوەبێت و موچەیان بەدولاری ئەمریکی بدرێت.

حکومەتی تورکی بڕیاری دا: سوپای تورکی بەهەموو توانایەکیەوەبەشداری دەکات لەپێناو پاککردنەوەی ناوچەکوردنشینەکان لەچنگ پ ک ک. ژمارەی 20 هەزار کەس لەچەکدارانی مەسعود بارزانی بەشداری دەکەن و وەکو سوپای تورکی تەماشا دەکرێن.جۆری کیانیان و مانگانەو موچەیان دوو هەزار دولار دەبێت.

سوپای تورکی لەگەڵ چەکدارەکانی بنەماڵەی پارزانی هاتنەکوردستانی باشور بەرواڵەت بەبیانوی ئازادکردنی ناوچەکەلەدەست پ ک ک ، بەڵام لەراستیدا بەپلان و فێڵەوەهاتبون کەدەست بەسەر کوردستانی باشوردا بگرن و تەسلیمی بنەماڵەی بارزانی بکەن کەجێی متمانەی هەر چوار داگیرکەرەکانی کوردستان یانی ئێران و سەدام و تورکیا و سوریان.

ئەوەبوو ئەوەی رویدا : سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بڕیاریان دا روو بەروویسوپای تورکی راوەستن.شەڕی مان و نەمانیان لەگەڵدا بکەن.کوردستان یان نەمان.هەرچەندەجیاوازیێکی زۆر هەبوو لەسەر جۆری چەک لەنێوانیاندا.

ئەوەبوو جەنگێکی دژوار روویدا لە "هێران و نازەنین" لەنێوان سوپای تورکی و چەکدارەبەکرێگیراوەکانی مەسعود بارزانی و هێزی پێشمەرگەجەنگاوەرەقارەمانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەیەکێتی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.سوپاس و ستایش و پێزانین بۆ ئەو پێشمەرگانەی کەگیانی خۆیان بەخت کرد و زامدار بوون لەپێناوی کورد و کوردستان.سوپاس و ستایش بۆ کەسایەتی کوردی جەنگاوەر و بەرێز کۆسرەت رەسول عەلی کەسەپەرشتی ئەوجەنگەی کرد و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.داستانێکی تۆمار کرد بۆ خودی خۆی کەلەبیر ناچێتەوەو مێژوو باسی دەکات.مل شۆڕی و نەمان بۆ بەکرێگیراوان و خائینان و دوژمنانی کورد و کوردستان "بنەماڵەی بارزانی".

خوێنەری هێژا:

بەندەنەدوژمنایەتیم بۆ کەس راگەیاندوەو نەرایدەگەیێنم،تەنها ئەوەم لەئەستۆ گرتوەکەلەو کتێبەنەوەبنوسم کەدەیزانم و کەسانی دیکەئاگاداری نین.پێویستەلەسەر سیاسەتمەدارێکی نیشتمانپەروەر بەسنگێکی فراوانەوەرەخنەپەسەند بکات و لەخستنەرووی راستیەکان نەترسێت.ئەگەر هاتو ترسی لەوەنەبوو خیانەتکاریەکان بخرێتەروو:

مێژوو بریتیەلەچەندین رووداو کەرەتبونەبۆ ئەوەی لەورێگایانەوەئاگاداری داهاتوو بین و ئەوەی لێوەفێر بین کەجیاوازی لەنێوان دوژمن و دۆست بکەین.

پەند وەرگرتن لەرووداوەکانی رابردو خاڵێکەکەمرۆڤ لەبوونەوەرانی دیکەجودا دەکاتەوە.بیارەئەو کەسەی هەڵەبکات و دوو سێ جار هەڵەکەی دووپات بکاتەوە،هەر لەگەڵ هەڵەدا دەژی و ناتوانێت خۆی بپارێزێت و نەکەوێتەهەڵدێرەوە.پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت دەڵێت : " المؤمن لايدغ في حجرمرتين" .واتەیەکەم جار فریوت دام خودا بت گرێت و دووهەم خودا خۆم بگرێت.

ئەوراستی و زانیاری و بیرەوەرییانەی لەکتێبەکەمدا ئاماژەم پێیان کردوەو تۆ بیبینی، خوشک و برای ئازیزم:

کاتێکی زۆرت بۆ خوێندنەوەی تەرخان کردووە،هیوادارم سوودت لێی وەرگرتبێت،بۆ ئەوەی ئاگاداری راستیەکان بیت و هەلوێستی راست لەرووداوەکان وەربگریت.چونکەبەدەست هێنانی زانیاری بەبێ هەوڵدان بۆ بەراوردکردنیان لەگەڵ واقیعدا لەوەباشتر نابێت کەکەسێک دەست بداتەکارێک، بەبێ ئەوەی سارەزایی و زانیاری لەسەر هەبێت، هەر وەکونیمام شافعی (خودای لێ رازی بێت) دەڵێت : لوكان للعلم دونا لتقى شرف لكان خير خلق اللهابليس" ئەگەر زانست بەبێ پەرستن بەهێند وەربگیرایە،ئەوا شەیتان باشترین کەس دەبوو.

خوشکی ئازیز و برای دڵسۆزم

بۆ زانیاری و ئاگاداری زیاتر چەند ها بابەتم روونکردوەتەوە.هەرچەند هەندێک لەو بابەتانەلەکتێبەکانم بڵاوم کردوەتەوە،بەڵام لەسەر داواکردنی هاوڵاتیان جارێکی کەبەشێکیان دوبارەئاماژەپێدەدەمەوە.

یەکەم:خەیانەتی مەلا مستەفا بارزانی:

دوای گەڕاننەوەی بەبیست مانگ،کەوتەدژایەتی رابەری شۆڕشی 14 تەموزی ساڵی 1958 و حکومەتەکەی خوالێخۆشبوونیشتمان پەروەر عەبدولکەریم قاسم.دەستی کرد بەئاژاوەنانەوەو فرت و فێڵ و کێشەو نەخشەو پیلان دارشتن تاکو جەنگی هەڵگیرساند.

زەرەرمەندی هەرەگەورەگەلی عێراقی بوو بەگشتی و بەتایبەتی نەتەوەی کورد. هەتاکو ئەمڕۆی ساڵی 2009 گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەباجی ئەو خیانەتەی بارزانی دەدات.

تاکەسودمەندی هەتاکو ئێستای ئەو خەیانەتە، بنەماڵەی بارزانیە.

تێبینی : بەندەلەکتێبەکانم بەدوور و درێژی ئاماژەم پێداوە،بۆیەلێرەبەکورتی باسی دەکەم.

دوەم: رێکەوتنەکەی دیکتاتور عەبدولسەلام عارف و مەلامستەفا بارزانی: بەرێز کاک "ئا . ک. گ." دەچێتەناحیەی ماوت سەردانی پرسگای بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکات.سەردانی شەخسی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەکات بۆ کارێکی تایبەتی.مامۆستا ئیبراهیم بەکاک" ئا.ک.گ "دەڵێت فەرموو قسەکانت بکە.دەڵێت: سەرۆک کۆماری عێراق عەبدولسەلام عارف بەندەی نارد وەئامادەیە لەگەڵ ئێوەی بەرێز کۆببێتەوە بەدیالۆگ بۆ چارسەرکردنی کێشەی کوردی.ئامادەیەبۆ جێبەجێ کردنی بەڵام بەمەرجێک مەلا مستەفا بارزانی بەشداری ئەو کۆبوونەوەو رێککەوتنەنەبێت.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەوەڵامدا دەڵێت: مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی و شۆڕشە،هەموو بڕیارێک و فەرمانێک لەدەستی ئەودایە.چ شەڕ یان ئاشتی.

تۆ کوردێکی دڵسۆز و پاکی و ڕێزت هەیەلای ئێمە،بەڵام جارێکی کەبەناوی ئەو دیکتاتۆرەی دوژمنی کورد و کوردستان و مرۆڤایەتیەوەڕوو بکەیتەوەئێرەبەسەلامەتی ناگەڕێتەوە.ئەم جارەبەسەلامەتی ڕەوانەت دەکەمەوەبۆ سلێمانی،بەم شێوەش ئاگاداری عەبدولسەلام عارف بکە.

بەڕێز کاک " ئا.ک.گ " دەگەڕێتەوەبۆ بەغدا و وەڵامەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدسکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، وەکو خۆی تەسلیمی حکومەتی عەبدولسەلام عارف دەکات.بۆ جاری دووهەم عەبدولسەلام عارف سەرۆکی کۆماری عێراق بۆ هەمان مەبەست لەڕێگای کاک" ئا.ک.گ" وەپەیامێک ئاراستەی مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی و شۆڕش دەکات.

ناوەرۆکەکەی: من هەڵوێست و بیر و بۆچونم ئاشکرایەبەرامبەر، هەرهەموو حیزبەکان لەعێراقدا سەرچاوەی ئاژاوەو دوبەرەکین و بەفەرمانی دەرەوەدەجوڵێنەوە.هەر بۆیەیەکەم ڕۆژ بەیانی ژمارەدوانزەم دەرکرد بەدژی حیزبی شیوعی عێراق و کوشتنیانم حەڵال کرد.

ئێمەئاینمان ئیسلامە،ئامادەم بۆ دیالۆگ و گفتوگۆ لەپێناو چارەسەر کردنی کێشەی کورد.بەڵام بەمەرجێک لەڕێگای شەخسی تۆوەکۆتایی بەو شەڕەناوخۆییەبهێنین ،بەهیچ جۆرێک حیزبی پارتی بەشداری ئەو ڕێکەوتنە نەکەن.

مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕش لەڕێگای کاک "ئا.ک.گ "وەوەڵامی پەیامەکەی سەرۆک کۆماری عێراق عەبدولسەلام عارف دەداتەوەو دەڵێت هەموو ئامادەگیێکم تێدایەبۆ گفتوگۆ کردن لەپێناوی کۆتایی شەڕی برا کوژی.

ئەوەبوو ئەوەی ڕوویدا کەڕوویدا.دوو بەرەکی لێرەوەدەستی پێکرد و کۆتایی نایە.بەدوور و درێژی لەکتێبەکانم ئاماژەم پێداوە.

تێبینی:

هەتاکو ئێستاکەبەردەوام خەڵکانێک چ ڕوو بەڕوو یان بەتەلەفون پرسیاریان ئاڕاستەکردوم کەئەو ذاتەکێیەو ئەو هەواڵەی چۆن زانی؟

1. کەخۆم تەسلیم بەحکومەت کرد، خەڵکانێکی زۆرم لەکاربەدەستەکانی حکومەتم ناسی.یەکێک لەوانە" ئەبو حەیدەر" بو بەڕێوەبەری بەشی سێ بوو.لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بەغدا ئەو ئاگاداری کردم.

وتی: لەسەرەتا گفتوگۆ بەنهێنی لەنێوان عەبدولسەلام عارف و مەلا مستەفای بارزانی دەست پێدەکات.هەڵگری نامەکەکاک ئەحمەد کەریم دەبێت.کاتێک بەئاشکرا گفتوگۆ دەستی پێکرد لەنێوان حکومەتی عارف و بارزانی،من(ئەبو حەیدەر) بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بووم.من کاک ئەحمەد کەریمم ناسی بەڵام هیچ پێوەندییەکی بەئاسایشەوەنەبوو.

2. لەساڵی 1981 کەلەلەندەن بووم،خوالێخۆشبو مامی گەورەم،مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەدوور و درێژی ئەم باسەی بۆ کردم.ناوی ئەو زاتە ئەحمەد کەریم ەو ناسراوەبەئەحمەد کەریمەگێل.
3. کەلەهەولێر رامکرد هاتمەسلێمانی،لەساڵی 2000 بەدیداری "ا.ک.گ" شاد بووم کەناوی ئەو بەڕێزەکاک ئەحمەد کەریمەو ناسراوەبەئەحمەد کەریم گێل. بەدوور و درێژی بۆی باس کردم کە کاتی خۆی سەردانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و مەلا مستەفای بارزانی کردوە،نێردراوەلەلایەن عەبدولسەلام عارفەوە.

کاک ئەحمەد کەریم ناسراو بە ئەحمەد کەریمەگێل.

کەسایەتیێکی ناسراوی شاری سلێمانیە،کاسبی بازرگانیەتی دەکات.خاوەن سەروەت و سامانە.بنەماڵەیێکی ڕووناکبیر و نیشتمان پەروەر و بەشداری شۆڕشیان کردوە.بەتایبەتی کوڕی گەورەی مەحمود نیشتمان پەروەر و شۆڕشگێڕ،دەورێکی سەرەکی هەبوو لەڕاپەڕینی ساڵی 1991 و گرتنەوەی کەرکوک و جێ باوەڕی جەماوەرە.هەر بۆیەلەلایەن پیاوکوژەکانی جەلال تاڵەبانیەوەهەوڵی تیرۆر کردنیان دا و زۆر بەسەختی بریندار بوو.

11/ئاداری ساڵی 1970:سەودایەکی بازرگانی بوو لەنێوان ئەو دوو تاوانبار و دیکتاتۆرەوە(سەدامحسین،مەلامستەفای بارزانی)

خوێنەری هێژا:

لێرەدا داوای لێبوردنت لێدەکەم کەمالی ئەوەبەخۆم دەدەم باس لەو رێکەوتنەشومەبکەم کەمەلا مستەفای بارزانی و سەدام حسین توانییان گەلی کورد و عەرەب چەواشەبکەن لەعێراقدا.بەڵکو توانیان زۆربەی سیاسەتمەدارانی عێراق و جیهان فریو بدەن بەتایبەتی شۆرەوی و حزبی شیوعی عێراق و دەزگای هەواڵگری " ک.گ.ب " ،لەو ریکەوتننامەیەکەبەمەزندەخزمەت بەبەرژەوەندی گەلی عێراق دەکات بەگشتی و بەتایبەتی گەلی کورد.بەڵکو خزمەتی بەبەرژەوەندی تایبەتی هەردوو بنەماڵەی هەر دوو کیانی دەکرد.

جا ئەگەر بهاتبایەلەسەر خزمەتی بەرژەوەندی گەلی کورد و عەرەب رێکبکەوتنایە،ئەوا بۆ خۆیان مێژوویێکیان تۆمار دەکرد و گەلی عێراقیان دەپاراست لەو نەهامەتییانەی بەهۆی دیکتاتۆرانەبەسەر گەلی عێراقیاندا هێنا.

دەبوا سەدام و بارزانی نەخشەو پلان و ستراتیژیەکەیان بۆ عێراقی فیدرال و دیمکرات و یاسا و یەکگرتو بکەن.بەکۆکردنەوەو رێک خستنی هەموو لایەنەسیاسیەکان،وەکو "بەعسی،پارتی،حیزبی شیوعی عێراق،باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد)حیزبی دیموکراتی و چەند حزبێکی عەرەبی" کەقەدەغەکراون.ئەوکاتەکێشەی کورد کۆتایی پێدەهات و نەدەبوو بەگەمەو گۆچانی دەستی شای ئێران.

بەڵام ویستی سەدام و بارزانی لەسەروی هەموو ویستەکانەوەبوو.جێی داخەئاکامەکانی زۆر کەوت بەتایبەتی لەسەر گەلی کورد.هەر لەئاشبەتاڵی شۆرشەوەتا ئەنفال و بەبەعس کردن و تەعریب و راگوێستن و زیندەبەچاڵ کردن و بومبارانی کیمیاوی هەڵەبجەو گرتن و کوشتن و دەربەدەری و و بنەوەی ناوی عەرەب.

خوێنەری هێژا:

لێرەدا لەبەر ئەوەی پەیوەندیم راستەوخۆ بەدەستگاکانی ئەمنی دەولەتەوەهەبوو،چاوم بەسەرانی حزبی بەعس دەکەوت،جا ئەوزانیارییانەی کەمن کۆمکردونەتەوە،ئاگاداری تەواوم لەسەر "11/ئاداری ساڵی .." هەیەو روونمکروەتەوەلەبەر دوو هۆ:

یەکەم: بۆ ئەو کەسانەی کەبەدوای زانینی راستیەکاندا دەگەرێن.

دووهەم: مەسعود بارزانی لەهەموو کۆڕ و کۆبونەوەیەک دەربارەی کەرکوک ئەوەدەڵێت کەبارزانی لەسەر کەرکوک شەڕی کردوە.نەخێر راست ناکات و درۆی فەرمووە.

بنەماڵەی بارزانی هەتاکو ئێستای ئیمەو کەکتێبی شەشەمم بڵاو دەکەمەوەبازرگانیەتی بەکورد و کوردستان دەکەن.مەلا مستەفای بارزانی لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی بنەماڵەی خودی خۆیان و بەس،کەرکوکی لەبرواری 12 و 13ی کانونی دوهەمی ساڵی 1970فرۆشت بەسەدام حسین.

خوشک و برای ئازیزم:

لەبەر ئەوەی بابەتەکەئەوەندەدوور و درێژەلێرەدا ئەو خاڵانەزۆر کورت دەکەمەوەوا لەخوارەوەئاماژەم پێداوە.

سەرانی حیزبی بەعس هەر هەموویان بەگشتی گەیشتونەئەو باورەکەئەگەر سەدچەکداریش لەشاخەکاندا بمێنێت، چارەسەرکردنی کێشەی کورد هەرگیز بەجەنگ کۆتایی نایەت، ،کۆتایی هێنان بەم باروذۆخەناهەموارەو چارەسەرکردنی تەنیا لەرێگای دیالۆگ و گفتوگۆی لێوەبکرێت بۆ یەک تێگەیشتنەوەو جێبەجێکردنی.

روسیا و دەزگای ک.گ.ب نەخشەدارێژەری ئەم پرۆژەیەبوون: ئەوەبوو بەشێوەیەکی راستەوخۆ روسیا داوای لەحکومەتی عێراق کرد کەگفتوگۆ لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی بکات لەپێناوی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی،مەرجی ئەوەی دانا

کەحزبی شیوعی رۆڵی کاریگەری تیابێت و لەو مەسەلەیەدابکەوێتەبەینەوە.لەرێگای کەناڵەکانیانەوە(حزبی شیوعی عێراق)کەوتبوونەجموجۆڵکردن بەشێوەیەکی گەرم.

بۆ نمونە:

1. لەسەر داوای روسیا و دەزگای ک.گ.ب لەپێشەوەکاری بۆکرا بوو کاتێک شاندی حزبی شیوعی لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی کۆبوونەوە،ئامۆژگاری ئەوتۆی دەخستە روو کەلەبەرژەوەندی شەخسی بارزانی دایە،بۆیەنابێ گوێ لەبەڵێن و گفتی ئێرانییەکان بگرێت.وێڕای ئەوەی تاقمەکەی جەلال تاڵەبانی لەگەشەکردنداو رەنگەلەدوا رۆژدا مەترسی لەسەر بەرژەوەندیەکانتان دروست بکەن.بۆیەپێویستەبۆ رێگەگرتن لەپەرەسەندنی هێزەکەی جەلال تاڵەبانی و بۆ ئەوەی دەستی گەورەیەدەست نەهێنێ،دەبێ ئەم رێکەوتنەبەزووترین کات بەئەنجام بگات.
2. لەلایەکی دیکەوە،کەچاویان بەسەرانی بەعس،واتەئەحمەد حەسەنولبەکر و سەدام حسین دەکەوت،ئەوانیشیان ئاگادار دەکردەوەکەسود وەرگرتن لەم رێکەوتنەئاکامی باش ئەبێت.

ئەمەو ک.گ.ب زانیاری تەواوی لەسەر ئەو بەشەهاوبەشەی نێوان ئێران و ئەمریکا هەیە،بۆ ئەوەی کودەتا لەسەر کودەتا ئەنجام بدرێت و، بەبەردەوامی کەسانێکیان لەناوەوەشک دەبرد پارەتییان بدەن و بەپێی ناراستەکارییەکانی ئەوان،دژی بەرژەوەندی حکومەتی عێراق کار بکەن.وایان هەڵوێست و دڵسۆزی بۆ هەر دوو لا دەربڕی کەئەوان کاری خێریان بەدەستەوەیەو نییەتیان پاکە.

3. سەدام حسین جێگری سەرۆک کۆماری عێراق:

بەتەواوەتی دەسەڵاتی کۆنترۆڵ نەکردبوو،تەنیا 60% دەسەڵاتی بەدەستەوەبوولەو سەردەمەدا زەمینەی بۆ ئەوەخۆش دەکرد کەدەست بەسەر تەختی عێراقدا بگرێت .مەبەستی لەسەر خستنی ئەرکی ئاشتبونەوەی نێوان بەعس و بارزانی ئەوەبوو متمانەی 80% لەسەدی خەڵکی کوردستان بەدەست بهێنێت بەوەی هەندێ لەو مافەیان پێ ببەخشێت کەداوایان دەکرد و بەهێنانەوەی خۆی توانی پشتگیری سیاسەتمەدارەبەعسیەکان و سەرکردەکانی دبەدەست بهێنێت،هەروەها بۆ لاوازکردنی باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد)،کەبەپێی ئاگاداری خۆم کەبەبەردەوامی نیگەرانی هەبوو ،هەوڵی دەدا رێگەلەپەرەسەندنیان بگرێت.

لێرەدا لایەنێکی مەزندەکراو هەیە،لەرادەی پەیوەندی ئەوەوەبەک.گ.ب و کارکردنی لەپێناو بەرژەوەندی ئەواندا.

4. مەلا مستەفا بارزانی: وەکو شەخسی سەدام حسین دەیویست دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت.پێی وابوو ئەم رێکەوتنەلەگەڵ بەعسیەکان و قەناعەت پێکردنی سەدام حسین لەپێشترەو هەموو کێشەکانی بۆ چارەسەر دەکات،هەموو گیر و گرفتەکانی لەبەردەمیدا رادەماڵێت و ئەو بتوانێت وەکو تاکەکەس دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت.هەردەم نیگەران بوو چونکەپێی وا بوو کەئیبراهیم ئەحمەد نەخشەو پیلانی خاوەنی ستراتیژی و ئایدیولۆژیەکی بیری یەکلاکەرەوەو دارشتوە.ئەمەوێڕای ئەوەی کەزۆربەی خێڵ و رەوشنبیر و سیاسەتمەداران پشتگیریان لێدەکەن،لاوازکردنی جەلال تاڵەبانی ئیتر کەس ناچێت لەبەر رێگایدا وبەهاسانی کۆنترۆڵی کوردستان دەکات.بۆیەمەلا مستەفای بارزانی سەر کەوتنی ئەو رێکەوتننامەیەی بەباشترین رێگەدەزانی بۆ بەدیهێنانی هەموو ئامانجەکانی هەر کارێکی دەکرد لەپێناوی سەرخستنیدا.
5. عەبدولخالق سامەرایی ـ حەماد شەهاب و خزمانی بەکر: خزمانی بەکر و زۆربەی سرکردەسەربازی و سیاسیەکانی بەعس لە% لەگەڵ هەڵوێست و بیر و بۆچون و نەخشەو پیلانی باڵی دووهەم بوون کەلەسەرەوەئاماژەم بەناویان داوە.40% دەستەڵاتیان لەناو ریزەکانی بەعسدا هەبوو.

سەدامیان خۆش نەدەویست،ئاگاداری بەکریان کردبوو کەدەسەڵاتی زۆر بەسەدام نەدات و ملکەچی ئەو نەخشەی روسیا نەبێت و کوردستانی نەدات بەدەستیەمەلا مستەفای بارزانی کەکەسایەتێکی خەتەرناکەو جێی باور و متمانەنیە.

وێڕای ئەوەزۆرینەی کوردی لەگەڵدا نییە.تاقمەکەی تاڵەبانی لەناو گەلی کوردستاندا لایەنگری زۆریان هەیە.جگەلەسەلایەنەعارەبەکان نابێ بەکر بەتەواوەتی ئەوان پشتی گوێ بخات.

دەربارەی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی ئاگاداری روسیاکانیان کردبوو کەمەرجیان ئەوەبوو کەدەبێت باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد) لەیەنێکی سەرەکی بن لەو ڕێکەوتنەی کەبڕیارەلەگەڵ بارزانی دا بکرێت.

6. ئەحمەد حەسەن بەکر: لەناو بەعسدا بەناوی ( شاییب/پیرەمێرد) ناودەهێنرا،باگشتی ڕێزێکی تایبەتیان لێدەگرت.هەر دوو باڵەکەی حزبی بەعس (سەدام حسین و عەبدولخالەق سامەرایی و حەماد شەهاب خزمانی بەکر) گوێی لەهەر دوو لا دەگرت و سەردانی هەموو سەرکردەسەربازییەکان و سیاسەتمەداران و نوسینگەو دەزگاکانی هەواڵگری دەکرد.

دەربارەی ئەخشەی ئەمریکا و ئێران و چۆنیەتی پوچەڵکردنەوەی ئەوکودەتایە،بەچارەسەر کردنی کێشەی کوردی،ئاشتی و ئازادی بەرقەرار دەبێت لەسەرانسەری عێراقدا.لەوەڵامدا بەکر نیجابی بوو،باوڕی هێنا بوو بەچارەسەرکردنی کێشەی کوردی بەیەکجاری و مەرجەهەموو کورد بەشدار بێت.بەتایبەتی باڵی مەکتەبی سیاسی ئیبراهیم ئەحمەد.

7. باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد): بەر لەوەی کۆبونەوەیەکی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی لەنێوان بەعس و بارزانیدا بکرێت،ئەوەبوو دانیشتنێکی فراوان لەنێوان ئەندامانی باڵی مەکتەبی سیاسی(ئیبراهیم ئەحمەد) و هەندێ لەسەرانی بەعس لەماڵی بەندەلەبەغدا ئەنجام درا و بەعسیەکان بڕیاریان دا بوو لەکاتی خۆیدا ئەگەر ڕێکەوتن لە نێوان ئەوان و مەلا مستەفادا روبدات،حەتمەن ئەوا نیوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لایەنێکی سەرەکی دەبن لەو ڕێکەوتنەدا.

سرانی بەعس بەردەوام بیریان لەکێشەی کورد دەکردەوەو لەهەوڵدا بوون بۆی. بۆ نمونە:

مامۆستا عەزیز شەریف لەدەرەوەی وڵات دەژیا،لەسەرداوای سەرۆک کۆمار بەکر گەڕایەوەعێراق،بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئەو شاندەبکات بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ بارزانی بەنوێنەرایەتی حکومەت بۆ جێبەجێکردنی داواکاری کورد.

هەروەها ئاگاداری بارزانی دەکات کەشاندێک لەئاستێکی بەرزدا دەگەنەبارەگاکەت،سەرانی بەعس بڕیاریان داوەکەئەو شاندەدەسەڵاتی تەواوی هەیەبۆ چارەسەر کردنی کێشەکە.

حەماد شەهاب و عەبدولخالەق سامەرایی:سەرپەرشتی شاندەکەیان دەکرد.حەماد کەپۆستی سوپای عێراقی لەئەستۆدا بوو،سامەرایی دوای سەدام دەبێت لەناو بەعسدا.شاندەکەلەئاستێکی گەورەدا بوو،جێی باوەڕ و متمانەی بەعس بوو.بەڵام سەدام بەنهێنی لەهەموو بارێکەوەدژایەتی دەکردن.

بەراشکاوی مەرجەکانی حزبی بەعس ڕووبەڕو ئاگاداری بارزانی دەکەن.لەو ڕێکەوتنەئەبێت هەموو لایەنەکانی کوردی بەشداری بکەن،بەتایبەتی باڵی مەکتەبی سیاسی(ئیبراهیم ئەحمەد) خاوەن بیر و باوڕن.خەڵکانێکی زۆریان لەگەڵدا هەیەو زۆر ینەیان ڕووناکبیر و نیشتمان پەروەرن،هەزارەها پێشمەرگەیان هەیەو لەناو پارت و ڕێکخراوەسیاسیەکانی عەرەب جێگای خۆیان کردوەتەوە.

دەربارەی ئوتونومی وتووێژ دەکەین،لەپێناوبەرژەوەندی گشتی عێراق و بەرپا بوونی ئاشتی و بەرقەراری هەتا هەتایەو ئامادەیی.

بارزانی داوای کەرکوک،خانەقین،کفری،مەخمور،شێخان و سنجار،تلعفر دەکات.بارزانی دەڵێت ئەگەر دەتانەوێت کێشەکەچارەسەر بکەن هەتا هەتایە، مەرجە هەموو ئەو جاشانەی کەرووبەڕوی شۆڕش شەڕیان کرد،هەر هەموویان یەکسەر چەک بکرێن،بەتایبەتی (جاشی 66،جەماعەتی جەلال).ئەو بۆچونەجیاوازەبوو بەهۆی ئەوەی دەرگای گفتوگۆ داخرا و کۆتایی بەدانیشتنەکەهێنرا و شاندەکەدەگەڕێتەو بۆ بەغداد.

حەماد و سامەرانی یەک سەر لەگەڵ بەکر و سەدام کۆبونەوەدەکەن،بارزانی بیر و را و بۆچونی نابەجێی خستەروو،بەراشکاویدەیەوێت بەتەواوەتی دەست بەسەر شمالی عێراقدا بگرێت و هەموو ئەوانەش چەکیان هەڵگرتبو دەبێت چەک بکرێن و سزاش بدرێن.

ئاگاداری بارزانیمان کرد کەحزبی بەعس ئەخشەو پرۆگرامی ئەوەیەکەئەو کێشەیەبەگفتوگۆ چارەسەر بکرێت و ئاشتی بەرقەرار بێت لەسەراسەری عێراق و بەتایبەتی لەشمال،نەک تەسلیم بوون.

بەکر هیچ قسەیەک نادرکێنێ و گرژ نابێت،بەڵام سەدام دەڵێت: ئایا ئێوەچوبوون بۆ شەڕ یا بۆ ئەوەئاشتی بەرقەرار بێت؟ کۆتایی بەکۆبوونەوەکەدێت. بەڵام بەکر و سەدام دوو بەدوو بۆ ماوەی سێ سەعات بەتایبەتی وتووێژ دەکەن و پاشان کۆبونەوەکەیان کۆتایی پێ دێت.

سەرۆک کۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر،کاغزێکی سپی بۆ جێگرەکەی ئیمزا دەکات کەهەموو بڕیارێک و دەسەڵاتێک دابەشەخسی سەدام حسین لەپێناو جێبەجێ کردنی ئەو پرۆژەیەو تاکو ئاشتی بەرقەرار بێت لەسەرانسەری عێراق بەتایبەتی لەشمالی عێراق.

ئەوەبوو ئەوەی رویدا کەرویدا:

سەدام حسین یەک بڕیار دەدات کەسەردانی کوردستان بکات و چاوی بەمەلا مستەفای بارزانی بکەوێت و بەجددی هەوڵ بدات بۆ سەرخستنی پرۆژەی ئاشتبوونەوەو رێککەوتن بۆ هەمووانی بسەلمێنێت کەئەو کێشەی کوردەکانی،کەماوەی 70 ساڵ درێژەی کێشا، چارسەر کرد.بەبێ ئەوەی کەسێکی دیکەبتوانێت چارسەری بکات.

بەمەش دەسکەوتێکی مەزن بەدەست دەهێنێت و بەنیازی خۆی دەگات و متمانەی هەمووان بەدەست دەهێنێت.دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کەئەو خاوەنی عەقڵیەتێکی وەهایەبتوانێت بەرژەوەندییەکانی خودی خۆی دەستەبەر بکات.

سەدام حسین ئاگاداری تەواوی هەبوو کەلەرۆژی 7ی هەمان مانگدا دوکتور مەحمود عوسمان،نوری سدیق شاوەیس،محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان،سالح یوسفی،نافیز جەلال،موحسین دزەیی و دارا تۆفیق، سەردانی بەغدادیان کردوەبۆ وتوویژ کردن لەسەر رێکەوتننامەکەلەگەڵ نوێنەرانی حزبی بەعسدا.ئەوەی باش دەزانی هەموو ئەو بەڕێزانەجێ باوەڕ و متمانەی شەخسی بارزانین،بەڵام دوابڕیار و دەسەڵات لەدەستی خودی مەلا مستەفا بارزانیدایە.

ئەوەبوو سەدام لەبڕی بڕیاری دا بۆ خۆی بڕوات سەردانی بارزانی بکات، بەسەرۆکایەتی شاندێک کەپێکهاتبوو لە:

سەعدون غیدان،دوکتور عزەت مستەفا،عەمید روکن ئیسماعیل تایەنعیمی،عەقید روکن تاریق توفێق و بارزان تەکریتی وسەباح میرزا. لەبرواری 12ی کانونی دووهەمی ساڵی 1970 بەرەو ناوپردان بەڕێ کەوتن.

بارزانی سەرەتا سوور بوو لەسەر خستنەوەی چوار پێشنیارکردنی بەمەرجێک بۆ تەواو کردنی رێکەوتننامەکە:

1. شارەکانی خانەقەین،کەرکوک،دوبز،شنگار،تەلەعفەر بکەونەچوار چێوەی ئوتونومیەوە،چونکی ناوچەی کوردنشینین.
2. چوار کورد بکرێن بەئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش و لەلایەن خودی بارزانییەوەدەستنیشان بکرێن.
3. مامەڵەو هاوکاری لەگەڵ پارتیدا بکرێت بەسەرکردایەتی بارزانی لەتەواوکردنی رێکەوتننامەکە.
4. چەکدارەکانی تاڵەبانی چەک بکرێن و رێکخستنەکانیان هەڵوەشێنرێتەوەو کاری رێکخستنی سیاسیان لێ قەدەغەبکرێت.

لەسەرەتای کۆبوونەوەکە: سەدام حسین سوربوو لەسەر جێبەجێ نەکردنی مەرجەکانی بارزانی بەتەیبەتی (چوارەم)تاقمی تاڵەبانی ،سەدام وتی: ئەوان حزبێکی سیاسی رێکخراون و پەیوەندی سیاسی گومان لێکراویان بەدەرەوەنییەو ترسی ئەوەیان لی ناکرێت ئاسایشی وڵات بشێوێنین ،پێگەی جەماوەری فراوانیان هەیەو پەیوەندی توند و تۆڵیان بەسیاسەتمەدارەعەرەبەکانەوەهەیەلەناوەوەو لەدەرەوەی ەڵات.ناکرێ پشت گوێیان بخەین.وێرای ئەوەی کاردانەوەیان ئێستا بەشێوەیەک نییەکەبەو جۆرەتوندەمامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

مشت و مڕ کەوتەنێوانیان،بەڵام لەبەر ئەوەی هەر دوولا سوور بوون لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆیاندا رێکبکەوین،دوو بەدو بۆ ماوەی سێ ساعەت (بارزانی و سەدام)بەتەنیایی کۆبوونەوە.

لەرۆژی دواتری کانونی دووەمی ساڵی 1970 دا سەدام حسین بەخۆشحاڵی گەرایەوەبۆ بەغداد بەوەی لەو کۆبوونەوەنهێنییەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.سەیر ئەوەیەئەندامانی شاندی بارزانی لەبەغداد،ئاگاداری ئەو کۆبونەوەدوو قۆڵیەی سەدام و بارزانی نەبوون تا ئەوکاتەی گەرانەوەبۆ بارەگای بارزانی.

جگەلەبارزانی و مەسعود و ئیدریس کەسی دیکەلە سەرانی پارتی لەبڕگەکانی رێکەوتنەکەئاگادار نەبوون،لەلایەن حزبی بەعسیشەوە،تەنیا سەدام ئاگاداری ئەو نهێنیانەبوو.

خوێنەری هێژا ئەم بابەتەلەبەرگرنگی دووبارەی دەکەمەوەکەلەسەرەوەئاماژەم پێداوە:

سەرەتا بارزانی سوور بوو لەسەر ئەو خاڵانەی خوارەوە:

شارەکانی خانەقین، کەرکوک،دوویز،شنگار ،تەلەعفەر...
چوار کورد بکرێن بەئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش..
مامەڵەو هاوکاری لەگەڵ بارزانی دا ..
چەکدارەکانی تاڵەبانی چەک بکرێن ..

لەکۆتایی کۆبوونەوەدوو قۆڵییەکەی کەماوەی سێ سەعات گفتوگۆیان لەسەر کرد،یەکسەر رێک دەکەون بەم جۆرەی خوارەوە:

بارزانی: چاوپۆشی لەخاڵی یەکەم و دووەم هێنا،ئەی شارەکانی(خانەقین،کەرکوک،دوویز،شنگار،تەلەعفەر) هێنا و خاڵی دووەم کەچوار کورد بکرێن بەئەندامیئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش.

سەدام: بڕیار و فەرمانی دەرکرد کەحیزبی بەعس حاکم مامەڵەو هاوکاری لەگەڵ پارتیدا بکرێت بەسەرۆکایەتی بارزانی،چاوپۆشی لەخاڵی چوار کەبەرگری لەتاقمی جەلال بکات.

بارزانی: لە کانونی دووەمی ساڵی 1970دا فەرمانی بۆ هێزەکانی دەرکرد کەخۆیان لەقەرەی سوپای عێراق نەدەن و ئاگاداری کردنەوەکەتەقەیان لێنەکەن و خۆیان ئامادەبکەن بۆ پەلاماردانی بارەگاکانی تاڵەبانی.خاوەنی رێکەوتننامەی 1966 و هەوڵی جددی بدەن بۆ لەناو بردنیان هەتاهەتایە.

سەعاتی سفر لەشەوی 24/23ی کانونی دووەمی ساڵی 1970 دا بوو کەبەپێی نەخشەیەکی دارێژراو پەلاماری بارەگاکانیان دا.

بەندەرفێق پشدەری خزمەتکاری کورد و کوردستان لێرەدا من دەڵێم:

بەمۆرکردنی رێکەوتننامەکەلەنێوان سەدام و بارزانیدا، دەرفەتێکی باش بۆ بارزانی رەخسا تاوەکو باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد) لەناو بەرێت،هەموو هێزێکی خۆی خستەگەڕ، بۆ ئەو مەبەستەرژێمیش بێ لایەن مایەوەو نەک هەر خۆی تێ نەقرتاند،بەڵکو گوێی خۆی لێخەواند،تاوکو دەرفەتی ئەوەبرەخسێت لەدوژمنی هەردوو لا،باڵی مەکتەبی سیاسی رزگاریان ببێت.

لەکاتی چاوپێکەوتنەکەی سەدام و بارزانی،هەردووکیان دەست بەکار بوون بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی لەسەری رێکەوتبوون بەرامبەر ئەو گفتانەی بەیەکیاندا بوو.لە دوانزەی ئازاری1970 سەرۆک کۆمار دەقی رێکەوتنەکەی لەتەلەفزیون و رادیو خوێندەوە.

لەمەیدانی ئازادی بەیانی 12ی ئادار یەک ملیون جەماوەر کۆبوونەوە،لەعەرەب و کورد و تورکمان و مەسیحی،کەدروشمی بارزانی و برایەتی کورد و عەرەبیان بەدەمدا دەهات.هەموو رادیو ناوخۆییەکان و جیهانییەکان باسیان لەو سەرکەوتنەو لەدەسکەوتەمەزنەدەکرد کەبۆ گەلی کوردستان و قارەمانانێتی بارزانی و بەکر و سەدام بەدیهات.

دیاری تای بارزانی لەو کاتەدا سەنگینتر بوو و تەوژمێک بوو هەموو کەسێکی رادەماڵی لەبەردەمیدا بوەستایە.ئەمەش وای لەشەخسی جەلال تاڵەبانی کردکەبۆ خۆی بروسکەی پیرۆزبایی لەبارەگاکەی کەلەبەکرەجۆوەلەنزیک سلێمانی بنێرێت و هەروەها مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کەئەوسا لەلەندەن بوو بۆ چارەسەری،هەمان دەسپێشخەری بکات.

سەرنج و تێبینی:

دوای تێپەڕبوونی نزیکەی ساڵێک بەسەر مۆرکردنی رێکەوتنەکەدا،سەدام حسین و مەلا مستەفای بارزانی هەریەک لەلای خۆیەوەنەخشەی دارشت بۆ تێکدانی رێکەوتنەکە. لەساڵی 1971 دا حیزبی بەعس و بنەماڵەی بارزانی بەناوانبارکردنی

یەکتری ،بەئاشکرا کەگوایەرێکەوتننامەکەیان شکاندوە،بارودۆخەکەیان رۆژ بەرۆژ بەرەو رەش بینی دەچوو و بۆنی شەڕی لێدەهات.

2. سەدام حسین بەو رێکەوتنەی لەگەڵ شەخسی مەلا مستەفای بارزانی لە12/ کانونی دووەمی ساڵی 1970دا ، گەورەترین خزمەتی نەتەوەی عەرەبی کرد.بەتایبەتی ئەوانەی باوڕیان بەئازادی و دیموکراتی وسەربەخۆی نەتەوەیی کورد و مافی مرۆڤ نییەلەکۆنەپەرست و شۆڤێنی و نەژادپەرستەکان.
3. سەدام حسین بەو نەخشەوپیلانەی کەئاگاداری بەکر دەکات،کاغزی سپی بۆ ئیمزادەکات،ئەوەبوو سەرکەوتنی بەدەست هێنا.توانی لەرێگای مەلا مستەفای بارزانی ناوچەکوردنشینەکان(خانەقین،کەرکوک،دووبز،شینگار و تەلەعفەر) لەجوگرافیای کوردستان جیا بکاتەوەو حزبێکی نەتەوەیی کوردی باوڕی بەئازادی و دیموکراتی سەربەخۆیی هەبێت لەناوی بەرێت.
4. بنەماڵەی بارزانی گەورەترین تاوان و خەیانەتیان دژی گەلی کورد ،لەئاداری 1970 کرد. ناوچەکورد نشینەکانیان لەجگرافیای کوردستانی باشور جیاکردەوەهەتا خانەقین و کەرکوک و دووبز ، شنگار و تەلەعفەر تەسلیم بەئیرادەی نەتەوەی عەرەب کرد.

بەڵام لەرێگای کەناڵەکانیانەوەبەردەوام هەتاکو ئێستا پروپاگەندەدەکەن بەکەرکوک،کەبارزانی لەسەر کەرکوک لەساڵی 1974 شەڕی کردوە،راست ناکەن و درۆ دەکەن.

تەنیا ناوەڕۆکی بەیانی 11 ئادار 1970 مەلا مستەفا و ئیدریس و مەسعود دەیانزانی،هیچ یەکێک لەئەندامانی سەرکردایەتی و دەزگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەناوەڕۆکەکەی ئاگادار نەبوون.

5. بۆ نمونەو بەڵگە: لەساڵی 1972 دا لەکاتێکدا من لەگەڵ مام جەلال و هاوسەرەکەی لەگەشتێکدا بووین بۆ کومیت،باسی باروذۆخی عێراق و تێکچونی پەیوەندی نێوان سەدام و بارزانیانمان دەکرد،کەچۆن حکومەتی بەعس چالاکی سیاسی و سەربازی حزبەکەی نەهێشت.دەپرسن بۆچی تاقمەکەی تاڵەبانی چونەریزی تاقمەکەی بارزانییەوەو هەروا بەئاسانی خۆیان بەدەستەوەدا.لەم بارەیەوەتاڵەبانی بەمنی گوت خۆت باش ئاگاداری باروذۆخەکەبویت لەکاتی 11ی ئازاری 1970.کاتێ لەگەڵ روسەکاندا قسەم دەکرد بەمنیان وت: هۆی لەیەکتر حاڵی نەبوونمان بەهۆی وەرگێڕەوەبوو کەلەنێوانماندا کاری دەکرد،بەجوانی قسەکانی ئێمەی وەرنەدەگێڕا،داخوازی ئێمەو "تەنانەت سیاسەتمەدارانی عەرەبی و بەعسیش،ئەوەبوو تۆ و حزب دامەزرێنیت.
6. بەپێی ئاگاداری خۆم مام جەلال هیچ ئامادەگیێکی تێدا نەبو،بەپێی توانا یارمەتیم دا کەبچێتەدەری،بەهاسانی بەیەکجاری چووەدەرەوەو نەگەڕایەوەبەغداد،تاکو رژێم رووخا.
7. ک.گ.ب و حزبی شیوعی ئاگاداری ناوەڕۆکی رێکەوتنەدوو قۆڵییەکەی سەدام و بارزانی نەبوون.کاتێ خۆی ئامۆژگاری بارزانیان کرد لەپێناو بەرژەوەندی کورد و خۆت لەگەڵ بەعس رێکەوە.سوود لەو باروذۆخەوەرگرەکەرووبەرووی حزبی بەعس بەوەتەوەکەئێرانیەکان و ئەمریکاییەکان نەخشەیێکیان دارشتوەکەکودەتا بکەن بۆ روخانی حزبی بەعس.

لەسەعات 9ی بەیانی 12 ئاداری ساڵی 1970 رۆیشتمەوەبارەگای باڵی مەکتەبی سیاسی بەپێچەوانەی رۆژانی رابردوو هەر هەموو ئامادەبوان کۆڕیان بەستبوو و، دەربارەی ئەو رێکەوتنەی نێوان سەدام و بارزانی، وتووێژ و لێکۆڵینەوەیان دەکرد .قسەلەسەر چۆنیەتی باروذۆخی ئایندەی باڵی مەکتەبی سیاسی دەکرا.

بەندەداوای لێبوردنم لەئامادەبووان کرد و وتم: ئەچم سەردانی برادەرەکەم دەکەم.بەرێز مامۆستا کەماڵ مەحیەدین ئامۆژگاری کردم،وتی: ئێمەتومان خۆش دەوێت،ئەوەندەهاتوچۆ مەکەبا تیرۆرت نەکەن.برادەرەکەت نازم کزار سێهەم کەسایەتییەلەناو حزبی بەعس،بەڵام ئەنجا ئاگاداری خۆت بە!

لەسەعات 11ی بەیانی رۆژی 12ی ئاداری ساڵی 1970 سەردانی بەڕێوەبەری ئاسایشی عێراقم کرد،کەچومەژورەکەی بەرامبەر تەلەویزیون دانیشتبو،ئەوەندەخۆشحاڵ بوو ، قاقا پێدەکەنی. وتم: جیاوازیێکی زۆر هەیەلەنێوانماندا،راستی 11 ئادار گۆڕانێک بوو بەپلەی 180 دەرەجەلەبەرژەوەندی شەخسی مەلامستەفای بارزانی و حزبی بەعس.ئێوەگەش بینن،بەڵام بەندەرەش بینم و لەو رۆژەوەژیانم رووبەرووی ترسناکی دەبێتەوەو جیهانم لێهاتوەتەیەک.

ناظم گزار وتی: ئەتپارێزین،کەزانیمان بارودۆخی ئەمنیت ترسناکەرەوانەی دەرەوەت دەکەین.مەلا مستەفا گۆڕی خۆی بەدەستی خۆی هەڵکەند،ئەم نهێنییەبڵاو بێتەوەژیانت دەکەوێتە... ئەنجا رفیق گەش بین بەئەوەیەراستیەکەی بەیانی 11ی ئادار بۆیەئێمەدڵ خۆشین.

سەرانی بەعس بەگشتی شاد و گەشبین بوون بەو ڕێکەوتنەی نێوان سەدام و بارزانی کەلەو 13 ی کانونی دووەمی ساڵی 1970دا.تەنیا ئەم دوو نیشتمان پەروەرەانە( عەبدولخالەق سامەرایی و حەماد شەهاب) بەراشکاوی هەڵویست و رایان دەربارەی ڕێکەوتنی نێوان سەدام و بارزانی دەربڕی و دەیان گوت کەئەم ڕێکەوتنەخزمەت بەکورد و عەرەب ناکات و داهاتوی عێراق تاریک دەبێت.ئەوەبوو سەدام حسین ئەخشەو پیلانێکی دارشت کەعەبدولخالەق سامەرایی خرایەگرتوخانەو ژێرلێکۆڵینەوە.خوالێخۆشبو سەرۆکی فەلەستین(یاسر عەرەفات) توانی رزگاری بکات،بەڵام دووهەم جار گیرا و دوای ئازار و ئەشکەنجەێکی زۆر ئینجا حوکمی لەسێدارەدانی پێدرا.

خوێنەری هێژا :

لە2003/10/ مقۆ مقۆی ئەوەهەبوو کەدەستەی هاوکاری لەگەڵرژێمی عێراقدا هەیە.تا کار گەیشتەئەوەی کەرۆژنامەی و رادیوکان بەراشکاوی قسەی لەسەر بەکان.

زۆرینەی هاوڵاتیان چاوەروانی ئەوەبوون کەئەو دۆسیانەبەردەست بکەوێت و ناوی ئەو کەسایەتیانەئاشکرا بکرێت،بەتایبەتی سەبارەت بەرووداوی 31 ئابی 1996!؟

دانیشتوانی شاری هەولێر نێر و من شاهیدی ئەوەن کەمەسعود و نێچیرڤان چۆن (قسەی سەدام حسین) یان بەرێوەبەرایەتی گاردی کۆماریان قەڵاتو و منارەیان داگیر کرد.

ئەم خۆ فرۆش و خائینە(مەسعود بارزانی)سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی هەرێمی کوردستان،بەراشکاوی لەنامەیەکی کراوەدا بۆ جەماوەر رایگەیاند کەهەموو ئەوانەی ناویان لەفەیلەکومان لێکراوەکانتدا هەبوو کەپەیوەندیان بەرژێمی بەغداد هەبوو،هەر هەمووی بەئاگاداری خۆی بووە.ئەی مەسعود بارزانی، ئەوەبوو دالی بەتاوان و خەیانەتەکەی خۆیدا نا !.

بەندەرمێق پشدەری خزمەتکاری کورد و کوردستان سەرزەنشتی بنەماڵەی بارزانی ناکەم سەبارەت بەو کارەنابەجێیانەی ئەنجامیان داوە،چونکی ئەم بنەماڵەیەبەرەزامەندی سیاسەتمەداران و سەرکردەمەیدانییەکان ( کاکەزیاد حەمەئاغای کۆیی،شێخ لەتیف شێخ مەحمود،ئیبراهیم ئەحمەد،هەمزەعەبدوللا)پۆستی سەرکردایەتییان وەرگرتوەو بوونەتەسەرکردەی کوردستان بۆ ماوەی 65 ساڵ.

لەبەر ئەوەی تاجی سەرۆکایەتییان بە مەلا مستەفای بارزانی دا.کەزۆر بەداخەوەدەڵێم کەشایستەی ئەو پلەیەنەبوو.چونکەمەزەندەکارییەکانی ئەوان هەڵەبوو و بینیمان چۆن ماوەی 65 ساڵە گەلی کورد بەهەڵەی دەدا.

لەساڵی 1951 کاتێک لەکۆنگرەی دووەمی پارتی،کەلەساڵی شەهید عەلی حەمدی بەرواری لەبەغداد بەکۆی دەنگ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەسکرتێری پارتی هەڵبژێردرا،ئەوکاتەمەلا مستەفای بارزانی لەعێراقدا نەبوو.لەروسیا بوو شەقامەکانی پاکدەکردەوەو ئاگایشی لەو کونگرەیەنەبوو.

ئەی کەواتەبەهۆی چییەوەبەسەرۆکی پارتی هەڵبژێردراوە؟ ئەی بۆچی ئەو هەموو پرۆپاگەندەیەی بۆ کراحتاکو گەیشتەدەسەڵاتێک لەحزبدا کەس شانی لەشانی نەدەدا.

سەرنج:

مەسعود بارزانی لەکتێبەکەیدا "بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازیکوردی،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/هەولێر ساڵی 2003 بڵاوکرایەوە"هێرشێکی زۆر دەکاتەسەر ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزەعەبدوللا و جەلال تاڵەبانی، تاوان و خەیانەتێکی زۆری خستوەتەئەستۆی ئەوان.

بەندەنگم دەخەمەپاڵ دەنگی کاک مەسعود بارزانی،تەنیا دەربارەی شەخسی جەلال تاڵەبانی:دوای روخانی سەدام حسین ئەوەبوو کوردستانی باشوری تەسلیم بەبنەماڵەی بارزانی کرد،زۆرینەی گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورەئێمڕۆ جەلال تاڵەبانی بەتاوانبار و جاش و دوژمنی کوردستان دادەنێت.

ئیبراهیم ئەحمەد:

لەکتێبەکەیدا بەوەتاوانباری دەکات کەهۆکاری دووبەرەکی نێوان براکوژدەکانەو هۆکاری رژاندنی خوێنی پاکەو،رۆژێ لەرۆژان کارێکی نەکردوەو لەتۆسیەی نیشتمانیدا تۆمار بکرێت.هەروەها لەکتێبەکەیدا ئاماژەبەوەدەدات کەئیبراهیم ئەحمەد هۆکاری ئەوەبوو کەرووناکبیران بکەونەناو زەلکاوی خەیانەتەوە...

مەسعود ئەفەندی پرسیارێک وا خۆشم وەڵامت دەدەمەوە:

ئاخۆ رووناکبیر دەرکی راستیەکان ناکات و فریو دەدرێ؟بەکەست روناکبیر دەگوترێت..(قل هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون)؟

بەندە،مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کە کەسایەتییکی ناسراوە لەسەرانسەری کوردستانی گەورەهەڵدەسەنگێنم،لێرەدا باسی هەندێ لایەنی کەسایەتی ئەم زاتەمەزنەدەکەم لەگەڵ ئەو تۆمەتبارکردنانەی کەمەسعود بارزانی لەم کتێبەی دواییدا ناراستەی کردوون،ئەمەش بۆ ئەوەناکەم تا خۆم بکەم بەوەکیلی خۆی یا خانەوادەی ،بەڵکو بۆ ئەوەیە بەشداری لەراستکردنەوەی چەواشەکانی هەڵبەستەکاندا بکەم.

لەناو کۆمەڵگادا بەدەگمەن رێکدەکەوێ هاوڵاتییک هەڵکەوێ ئەو هەموو بەهرانەی بەجارێک تێدا کۆببووبێتەوە:

کەسایەتیەکی بەهێز، بەخشینی بەردەوام،تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەر و سیاسەتمەدارێکی بەئەزمون و دەرکەوتو کەلەجیهانی سیاسەتی کوردستاندا ناسراوبێت.

دەریایەک بوو لەزانیاری دەربارەی سیاسەت و کەلتور و ئەدەبی کوردی،چەندین زمانی دەزانی،شاعیر و چیرۆکنوسێکی وا چەندین دانراوی هەبوو وەکو:گۆڤاری گەلاوێژ،رۆمانی ژانی گەل،کوێرەوەری،چریکەی کوردستان و هیتر کەبەڵگەی شارەزایی بوون.ئەم شۆرەسوارەی دارێژەرو رێکخستنی کوردایەتی وەکو پارێزەرێکی دەستپاک دەستی بەکار کرد.

مەلا مستەفا بۆ کورد وەکو چاوو وایە بۆ مرۆڤ،بەڵام مرۆڤ چی بکات کاتێ چاوی توشی شێرپەنجەدەبێ؟ئایا چارسەرکردنی هەڵکێشانی نیە؟ئەمەقسەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

تێبینی:

کەکۆنگرەی بڵێ مەکتەبی سیاسی گیرا لەگوندی "جافەران"ی ناوچەی قەرەداغ،مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وتی: سەرکەوتنی بارزانی دوارۆژ نەمانی گەلی کوردە.ئەمەقسەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

بەندەش دەڵێم راستت فەرموو مامۆستا.بۆنمونە: بەیانی 11 ئاداری 1970.

مێژوو حەتمەن دوای چەند ساڵ کەلێکۆڵینەوەت لەگەڵدا دەکات لەسەرتاوانەکانت .

1. پێشەوا قازی محەمەد فەرموی یەکێک هەڵبژێرن بەسەرۆکی پارتی،مامۆستای بەرێز یەکێک لەو چوارانەبوون کەبارزانیان هەڵبژارد.
2. دەوری سەرەکیت هەبو لەگەرانەوەی بارزانی بۆ عێراق.
3. کەچوی لەگەڵ هەڤاڵان بارزانیتان هێنایەوەو شارەزاییت لەماهیەتی ئەو خێڵەکیەهەبوو بۆ تەسلیم بەئیرادەی بویت؟
4. دوو بەرەکی لەنێوان کورد و خوالێخۆشبو عەبدولکەریم قاسم ئەوەبوو مەلا مستەفای بارزانی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کێشەی دروست کرد.
5. لەکاتێکدا هەڵوێست و بیر و بۆ چونت دیار بوو،کەفەرمۆت.کاتی ئەوەنەهاتووەشۆرش بەرپا بێت.بەڵام تەسلیم بەئیرادەی جەلال تاڵەبانی و بارزانی بوییت.ئایا بۆچی مەوقیفت وەرنەگرت بۆچی جیانەبویتەوە؟ئاخ جەلال؟!

6. خەڵکانێکی زۆر رەخنەم لێدەگرن کەساڵها گۆچانی دەستی جەلال تاڵەبانی بویت و پرۆپاگەندەت بۆ دەکرد،ئێستا کتێب لەسەر جەلال دەردەکەی.بەندەش رەخنەکەتو دەگرم کەماوەی 50ن ساڵ زیاترەکردوتەجێ باوەڕ و متمانەو زاوای خۆت،ئەم هەمو ساڵانەبارزگانی و کوردایەتی بەناوەپیرۆزەکەت دەکات.ئەی بۆ ئاگادارت نەکردم.

ئەی بنەماڵەی بارزانی....ئەی سەروەرانی ئەمڕۆ:

ئەی دوژمنانی کورد و کوردستان، بەهەموو زۆرداری خۆتانەوەهەتاکو ئەمڕۆ ساڵی 2009 دەستان بەسەر کوردستانی باشوردا گرت، تۆ بڵێی بنەماڵەی بارزانی کەسێکیان دەست بکەوێت لەگۆڕەکەیاندا سڵاویان لێبکات. یان تۆ بڵێی چۆن وەڵامی بنەماڵەی شەهیدان دەدەنەوە،کەژمارەیان دەگاتە هەزاران کەس،بۆچی رۆڵەی کورد باوکیان شەهید بوو و هەزارەها بنەماڵەئاوارەو دەربەدەر کران.

هەیدەڵێت هەڵکەندنیان لەرەگ و ریشەکارێکی مەحاڵە،بەڵام دەستی خوای مەزن لەسەروی هەموانەوەیەو باشترین بەڵگەی زیندوش سەدام حسینە.

رونکردنەوەیەک:

کەشۆرشی 14 تەموزی ساڵی 1958 بەرپا بوو بەسەرۆکایەتی نیشتمان پەروەر خوالێخۆشبو عەبدولکەریم قاسم،ساڵهای ساڵ بوو کورد خەوی پێوەدەبینی بەو بارودۆخەهاوڵاتی کورد بەم جۆرەگەش بین بوو،ئازادی دیموکراسی بەرپا بوو.دانی بەمافی نەتەوایەتی کورددا نا.لەسەرەتای گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق تاکو ساڵی 1961 کەشەڕی هەڵگیرساند و بوو بەهۆی روخاندنی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم و حیزبی بەعسی هێنایەسەر حوکم.لەکتێبەکانم بەدوور و درێژی ئاماژەم پێداوە.

لەساڵی 1960وەبەندەبەردەوام لەهەوڵدانم کەبزانم هۆی چی بوو بارزانی ئەو ئەزمونەی لەگەڵی کورد تێکدا و بەرەو رۆژگارێکی رەشی بینی برد؟ لەکۆتایی کتێبی شەشەم بووم کاک جەمیل م ئەو ئاگادایەکەکردم.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن، دوای 48 ساڵ خیانەتی مەلا مستەفای بارزانی ئاشکرا بوو. هەر وەها سوپاس بۆ کوردستان پۆست و ئەو بەرێزە"عیسا بزمان" وا بیرەوەرییەکانی خۆی بڵاو دەکاتەو پەردەی لەسەر نهێنییەکان هەڵدایەوەکەبارزانییەدەسیسەی شای ئێران ئەوەبوو بارزانی جەنگی هەڵگیرساند.جەلال تاڵەبانی رۆڵی سەرەکی هەبوو.

بەندەهێشتا لەژێر کاریگەریی کەسایەتی مەلا مستەفای بارزانی دا بووم و بەبەردەوامی پەیوەندییم بەوەوەهەبوو.

ئەو کەسەی بەرگەکانی کتێبەکانم(کورد دوژمنی خۆت بناسە) بخوێنێتەوە،ئەوەباش دەزانێت کەیەکێک لەئەرکەکانی من لەناو ریزەکانی دەستگاکانی ئەمنی عێراق و حزبی بەعس،ئەوەبوو بەدوای نهێنییەکان و جموجۆڵی ئەو کوردانەدا کەریزەکانی شۆرشیان بەجێهێشتوەو چەکیان بۆ حکومەتی عێراق هەڵگرتوە،بەبەردەوامی پەیوەندیم بەبارەگای بارزانیەوەهەبوو.بۆ ئەوەی لەهەر زانیارییێکی نوێ ئاگاداریان بکەمەوەبەتایبەتی سەبارەت بەجموجۆڵی شێخ عوسمان شێخ ئەحمەد بارزانی و عوبەیدوڵلا مەلا مستەفای بارزانی.

لەبەرگەکانی کتێبەکانم بەدرێژی باسم لەوەکردوەکەشۆرش بەبەردەوامی سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەر جوڵەیەکی دوژمنکارانەی شێخ عوسمان و عوبەیدوڵلا،ئەوەش بەهۆی ئەو زانیارییانەوەکەبۆم رەوانەدەکردن.ئەمەبەردەوام بوو تا ئەو کاتەی مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەوەبوو ناشبەتاڵی بەشۆرش کرد.

عوبەیدولڵا مەلا مستەفای بارزانی:

عوبەیدوڵلا بەهۆی سەدیق شلشل چاوی بەزەعیم عەبدولکەریم قاسم کەوتبوو.باوڕی 100% پێ بوو.ئەوکاتەی پەیوەندی مەلامستەفای بارزانی و شەخسی عەبدولکەریم قاسمەوەتوند و تۆڵ بوو،پەیوەندی عوبەیدوڵلایش بەباوکییەوەزۆر بەهێز بوو.

ناکۆکی نێوان عوبەیدوڵڵا و باوکی لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە مەلا مستەفا پشتگیری سەرۆک عەشیرەتەکانی کرد کاتێک یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرچوو.کێشەکان گەورەتر بوون و ناکۆکی لەنێوان بارزانی و عەبدولکەریم بەرپا بوو.ئەوکاتە ئێرەبەکورتی عوبەیدوڵڵا بەمنی وت: کاک رەفیق لەبەر ئەوەی من کوڕە گەورەی ئەوم بۆیەکەس وەکو من نایناسێت... ئەو مرۆڤێکی ترسناکە لەسەر ئایندەی کورد،جێی باوەڕ نیەو گەلی کورد بەرەو نابوتی دەبات،بۆیەمن بەقەناعەتی تەواوەرازی دەبم بەچارەنوسێکی نادیار لەگەڵ حکومەتی عێراق نەک ئەوەی لەگەڵ پیاوێکدا بژیم کە متمانەم پێ نییە.تەنانەت ئەگەر باوکیشم بێت.

کەراستەو خۆ داوام لێکردن ڕۆژێک زوتر خۆت رزگار کەلەدەست بەعس،بەزوترین کات پێوەندی بەباوکتەوەبکە،ئەوە وەڵامەکەی بوو کەلە سەرەوەئاماژەم پێداوە.

عوبەیدوڵڵا مەلا مستەفای بارزانی پیاوێکی بەرز و ژیر بوو،چاونەترس بوو لەمردن نەدەترسا و گاڵتەی بەگەر شتێکی ترسناک دەهات.

لەدانیشتنێکماندا لەگەڵ ئیدریس و مەسعود بارزانی،لەگوندی راژان سەر سنور لەساڵی 1985 داسێ قۆڵی ماینەوەتا چەند پرسیارێکیان سەبارەت بەبنەماڵەی خودی خۆیان ئاراستەم کردن،ئەویش ئەو پرسیارەبوو کەچۆن براگەورەیان عوبەیدوڵڵا تیاچوو.وەڵامی پرسیارەکانیانم دایەوە،کاتی خۆی هەوڵێکی زۆرم لەگەڵدا.

زانیاری دەربارەی عوبەیدوڵڵا و عوسمان بارزانی:

سەبارەت بەحکومەتی عیراقەوەواللە... واللەبەم جۆرەبوو.یەکەم جار خۆیان پەیوەندیان بەئەمنی عێراقەوەکرد بەشێوەیەکی راستەوخۆ،خودی خۆیان دەستپێشخەر بوون نەک لەرێگای فریودان و پارەو پووڵەوەلەلایەن بەعسیەکانەوە،مەبەستیان ئەوەبوو کەدەسەڵاتی مەلا مستەفا و ئیدریس و مەسعود بەسەر ناوچەی بارزاندا نەهێڵن.ئەوەیان دەزانی هەتاکو مەلا مستەفا دەسەڵات بەسەر ناوچەکەیاندا بگرێت نۆکەرەناگرن.مەبەستی سەرەکییان ئەوەبوو کەبگەڕێنەوەگوندەکانی خۆیان بەئاسودەیی لەوێ ژیان ببەنەسەر.دەسەڵاتی مەلا مستەفا بەسەر عەشیرەتی بارزاندا لەمێنێت.

بەپێی نەخشەوپیلان و هەڵوێستی خۆیان تاکەرێگا،بەهاوکاری لەگەڵ رژێمی بەغداد رزگارمان دەبێت.شێخ عوسمان شێخ ئەحمەد بارزانی رووبەروو ئاگاداری رژێمی کردەوەوتی: هاوکاریمان بکەن لە% دانیشتوانی ناوچەکەلەگەڵمانن.

سەرەتا حکومەتیش ئامادەبوو هەموو داواکاریەکانییان بۆ جێبەجێ بکات لەپێناو نەخشەو پیلانەکەیان،بەداخەوەشەرەمەزار و تاوانبارەم دەورێکی سەرەکیم هەبوو بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست نەهێنن.

لەدواتر بەئاکامێکی دڵتەزێن گەیشتن،ئەوەبوو بەعسیەکان بەپاساوێکی نابەجێ لەناویانی برد.جێگایان بەهەشتی بەرینە ئینشاالله.

من داوای لێبوردن دەکەم لەبنەماڵەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەتایبەتی شێخ عوسمان و عوبەیدوڵڵا،بەگەورەیی خۆیان بمبەخشن.هەرچەندشێخ ئەحمەد و محەمەد خالد و عوسمان و عوبەیدوڵڵا لەبنەماڵەی شێخانی بارزانین بەڵام خەڵکانێکی نیشتمان پەروەر بوون،هەوڵێکی زۆریان دا کەگەلی کورد بەرەنگاری شەڕ ودووبەرەکی و ئازار و ئەشکەنجەنەبێت.هەڵوێست و بیر و بۆچونیان لەگەڵ مەلا مستەفا نەبوو.

جا کەباس لەتاوانەکان و خیانەت و دوژمنانی کوردستان ئەهێنین نەڵێین بنەماڵەی بارزانی ئەمانەن(مەلا مستەفا،ئیدریس،مەسعود،نێچیرڤان،مەسرور،دڵشاد،وەجیە،نهاد،سواد)تەنیا ئەمانەن ئەبێت لەنوسین ئاماژەی پێ بدەین.

تێبینی:بەندەرەخنەلەخۆم دەگرم ئەم کەسایەتیانەئامۆژگاریان کردم.

1. پێش دەستپێکردنی شەڕ لەنێوان قاسم و بارزانی،عوبەیدوڵڵا مەلا مستەفای بارزانی وتی: بارودۆخی خۆت و خانەوادەت تێک مەدە،دوای باوکم مەکەوە.
2. کەشەڕ دەستی پێکرد،ئەوەبوو لەهەموو راستیکا هێزی عەشیرەکان شکان و رایان کرد.مەلا مستەفاش رایکرد و چووەسەرسنوری تورکیا،شێخ ئەحمەدی هاتەبەغداد. بەرگی یەکەم لەکتێبەکەم ئاماژەم پێداوە،بەڵام دەقی قسەکانی وەکو

خۆی یاداشتم نەکردوە. وتی: رەفیق ئیشی کوردان پووچە،مستۆ(مەلا مستەفا)ئاڵۆز و بەڵۆز دەکات.ئەم شەڕەی بۆ دروست کرد.

3. لەساڵی 1963 کەدوو بەرەکی بەرپا بوو لەنێوان بارزانی و پارتی،ئەوەبوو چومەلای شێخ ئەحمەد شکاتم کرد لەمەلا مستەفا،شێخ محەمەد خالد فەرمووی کاک رەفیق، مەلا مستەفا بڕیاری داوەدەسەڵات بەسەر شۆڕشدا بگرێتو ئینجا لەناوی بەرێت.من رەوانەت دەکەم بۆ لای شێخ،بەڵام رۆژێک دەبێت چاومان بەیەک دەکەوێت،دەڵێت نەچوبامایە.
4. شێخ عوسمان بارزانی وتی: من برازای مەلا مستەفام،ئەگەر ئەمزانی ئەوەکوردەو بۆ کورد هەوڵدەدات خزمەتی نیشتمانەکەدەکات،منیش چەکم بۆ هەڵدەگرت،بەڵام دڵسۆزی و پاکی لەدڵی ئەو مامەمدا نییە.
5. ئینجا لاپەڕەی دوای ئەوە: لەسەرتاوانبار و خائن و دوژمنی کورد و کوردستانی گەورەو ئازادی و دیموکراتی و مافی چارەنوسی گەلی کورد و دامەزراندنی حکومەتی کوردی (جەلال تاڵەبانی).

## رونکردنەوەیەک دەربارەی خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی :

بەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان وێڕای بەڕێزم مامەگیان یەکترمان لەساڵی 1952وەناسی، بەڵام لەسەرەتای شۆڕشی 14ی تەموزی مبارەکی ساڵی 1958 وەساڵ بەساڵ شارەزایی و زانیاری و ماهیەتی ئەم زاتەمەزنەم بۆ دەرکەوت و بوین بەجێی باوەڕ و متمانەی یەکتری،هەڵوێست و بیر و بۆچوون و نەخشەو پیلانمان دامەزراندنی حکومەتی کوردی بوو.

جەلال تاڵەبانی کێیە؟ بەدەگمەن رێکدەکەوێت هاوڵاتییەک هەڵکەوێ ئەو هەموو بەهرانەی بەجارێک تێدا بێت.کەسایەتی یێکی بەهێز و توانا،تێکۆشەرێکی نیشتمان پەروەر و سیاسییەکی بەئەزمون و دەرکەوتووکەلەجیهانی سیاسەتی کوردستاندا بەم جۆرەناسراو بێت. دەریایەکەلەزانیاری دەربارەی سیاسەت و کلتوری ئەدەبی کوردی.چەند کتێبی دەرکردوە،چەندین زمان دەزانی،سەفەرەزاوەو قسەخۆش و نوکتەزان و بەگاڵتەو گەفە.

گەیشتبومەئەو باوەڕەکەجەلال فریشتەیەو خودای مەزن بۆ گەلی کوردی ناردوەتەخوارێ تاکو رزگاری بکات.

کەلەساڵی 1964 مەلا مستەفای بارزانی و عەبدولسەلام عارف کودەتایان کرد،بەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان،ئەوەبوو بارزانی دەسەڵاتی بەتەواوەتی بەسەر پارتی و شۆڕش و کوردستانی باشوردا گرت.

جەلال رووبەرووی بارزانی و عەبدولسەلام عارف راوەستا و تەسلیم بەئیرادەیان نەبوو.کەعەبدولرەحمان عارف بوو بەسەرۆک کۆماری عێراق،ئەوەبوو لەرێگای بەندەوەپەیوەندییەحکومەتی عارفەوەکرد.باڵی مەکتەبی سیاسی دامەزراند.

جەلال گەیشتەئەو باوەڕەکە،یەکەم نەخشەو پیلان دانان بۆ لەناو بردنی بنەماڵەی شێخانی بارزانی، پاشان دامەزراندنی حکومەتی کوردی.

جەلال دوای ئەوەی بنەماڵەی بارزانی ئاشبەتاڵیان بەشۆڕشی ئەیلول کرد،ئەوەبوو لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی تێکۆشەری سیاسەتمەدار حزبێکی سیاسی دامەزراندوەبەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.زۆرینەی هاوڵاتی کورد لەسەرانسەری کوردستانی باشور پەیوەندیان بەیەکێتیەوەکرد.

خوێنەری هێژا : کەرامکرد لەکوردستانی باشور لەچنگ بەڕێزان،مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی،هاتمەئەوروپا،لەشاری گوتێنبورگی وڵاتی سوید جێگیر بووم. چەند هاوڵاتی یەکێتی پەیوەندیان پێوەکردم ،چ لەرێگای تەلەفون یان بەنوسراوە یان لەدیداری حزوریدا، و پرسیاریان ئاراستەدەکردم دەربارەی شەخسی بەڕێز جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ناوەڕۆکی پرسیارەکانی هەمویان لەیەک بازنەدا کۆ دەبووەوە.جا لەبەر ئەوەپێویست بەوەناکات یەکەیەکەئاماژە بەناوی ئەو هەڤاڵانەبدەم .هەرچەندەهەر هەموویان شەخسەن جەلال تاڵەبانی باش دەناسن،بەڵام ئیمڕۆ جەلال تاڵەبانی ئەو هەڤاڵەدێرینانەناناسێتەوە،چونکی ئەوەندەغەرور و لەخۆ بایی بووەکەتەنها کومپانیاکەی دەوروپشتی دەبینێ و بەس.

جا هەڤاڵانی بڕێز،داوای لێبوردنتان لێدەکەم،تەنها ناوی یەکێک ئاماژە پێدەدەم، لەبەر ئەوەی شارەزایی و زانیاری تێوەو بەندەو خودی جەلال تاڵەبانی،هەرسێ لامان بەرامبەر ئەو برا بەڕێزەهەمانە.

ناکۆکی نێوان عوبەیدوڵڵا باوکی لەو ڕۆژەوەدەستی پێکرد کەمەلا مستەفا پشتگیری سەرۆک عەشیرەتەکانی کرد کاتێک یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرچوو.کێشەکان گەورەتر بوون و ناکۆکی لەنێوان بارزانی و عەبدولکەریم بەرپا بوو.ئەوکاتەلێرەبەکورتی عوبەیدوڵڵا بەمنی وت: کاک ڕەفیق لەبەر ئەوەی من کوڕەگەورەی ئەوم بۆیەکەس وەکو من نایناسێت... ئەو مرۆڤێکی ترسناکەلەسەر ئایندەی کورد،جێی باوەڕ نیەو گەلی کورد بەرەو نابوتی دەبات،بۆیەمن بەقەناعەتی تەواوەرازی دەبم بەچارەنوسێکی نادیار لەگەڵ حکومەتی عێراق نەک ئەوەی لەگەڵ پیاوێکدا بژیم کەمتمانەم پێ نییە.تەنانەت ئەگەر باوکیشم بێت.

کەراستەو خۆ داوام لێکردن ڕۆژێک زوتر خۆت ڕزگار کەلەدەست بەعس،بەزوترین کات پێوەندی بەباوکتەوەبکە،ئەوە وەڵامەکەی بوو کەلە سەرەوەئاماژەم پێداوە.

عوبەیدوڵڵا مەلا مستەفای بارزانی پیاوێکی بەرز و ژیر بوو،چاونەترس بوو لەمردن نەدەترسا و گاڵتەی بەگەر شتێکی ترسناک دەهات.

لەدانیشتنێکماندا لەگەڵ ئیدریس و مەسعود بارزانی،لەگوندی ڕاژان سەر سنور لەساڵی 1985 دا،سێ قۆڵی مایەوەتا چەند پرسیارێکیان سەبارەت بەبنەماڵەی خودی خۆیان ئاراستەم کردن،ئەویش ئەو پرسیارەبوو کەچۆن براگەورەیان عوبەیدوڵڵا تیاچوو.وەڵامی پرسیارەکانیانم دایەوە،کاتی خۆی هەوڵێکی زۆرم لەگەڵدا.

زانیاری دەربارەی عوبەیدوڵڵا و عوسمان بارزانی:

سەبارەت بەحکومەتی عیراقەوەوالله... والشبەم جۆرەبوو،یەکەم جار خۆیان پەیوەندیان بەئەمنی عێراقەوەکرد بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ،خودی خۆیان دەستپێشخەر بوون نەک لەرێگای فریودان و پارەو پووڵەوەلەلایەن بەعسیەکانەوە،مەبەستیان ئەوەبوو کەدەسەڵاتی مەلا مستەفا و ئیدریس و مەسعود بەسەر ناوچەی بارزاندا نەهێڵن.ئەوەیان دەزانی هەتاکو مەلا مستەفا دەسەڵات بەسەر ناوچەکەیاندا بگرێت نوقرەناگرن.مەبەستی سەرەکییان ئەوەبوو کەبگەڕێنەوەگوندەکانی خۆیان بەئاسودەیی لەوێ ژیان ببەنەسەر.دەسەڵاتی مەلا مستەفا بەسەر عەشیرەتی بارزاندا نەمێنێت.

بەپێی نەخشەوپیلان و هەڵوێستی خۆیان تاکەرێگا،بەهاوکاری لەگەڵ ڕژێمی بەغداد ڕزگارمان دەبێت.شێخ عوسمان شێخ ئەحمەد بارزانی ڕووبەڕوو ئاگاداری ڕژێمی کردەوەوتی:هاوکاریمان بکەن لە% دانیشتوانی ناوچەکەلەگەڵمانن.

سەرەتا حکومەتیش ئامادەبوو هەموو داواکاریەکانییان بۆ جێبەجێ بکات لەپێناو نەخشەو پیلانەکەیان،بەداخەوەشەرەمەزار و تاوانبارم دەورێکی سەرەکیم هەبوو بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست نەهێنن.

لەدواتر بەناکامێکی دڵتەزێن گەیشتن،ئەوەبوو بەعسیەکان بەپاساوێکی نابەجی لەناویانی برد.جێگایان بەهەشتی بەرینە ئینشاالله.

من داوای لێبوردن دەکەم لەبنەماڵەی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەتایبەتی شێخ عوسمان و عوبەیدوڵڵا،بەگەورەیی خۆیان بمبەخشن.هەرچەندەشێخ ئەحمەد و محەمەد خالد و عوسمان و عوبەیدوڵڵا لەبنەماڵەی شێخانی بارزانین بەڵام خەڵکانێکی نیشتمان پەروەر بوون،هەوڵێکی زۆریان دا کەگەلی کورد بەرەنگاری شەڕ ودووبەرەکی و ئازار و ئەشکەنجەنەبێت.هەڵوێست و بیر و بۆچونیان لەگەڵ مەلا مستەفا نەبوو.

جا کەباس لەتاوانەکان و خیانەت و دوژمنانی کوردستان ئەهێنین ئەڵێین بنەماڵەی بارزانی ئەمانەن(مەلا مستەفا،ئیدریس،مەسعود،نێچیرڤان،مەسرور ،دڵشاد،وەجیە،نهاد،سواد)تەنیا ئەمانەن ئەبێت لەنوسین ئاماژەی پێ بدەین.

تێبینی:بەندەرەخنەلەخۆم دەگرم ئەم کەسایەتیانەئامۆژگاریان کردم.

1. پێش دەستپێکردنی شەڕ لەنێوان قاسم و بارزانی،عوبەیدوڵڵا مەلا مستەفای بارزانی وتی: بارودۆخی خۆت و خانەوادەت تێک مەدە،دوای باوکم مەکەوە.
2. کەشەڕ دەستی پێکرد،ئەوەبوو لەهەموو ڕاستیکا هێزی عەشیرەکان شکان و ڕایان کرد.مەلا مستەفاش ڕایکرد و چووەسەرسنوری تورکیا،شێخ ئەحمەدی هاتەبەغداد. بەرگی یەکەم لەکتێبەکەم ئاماژەم پێداوە،بەڵام دەقی قسەکانی وەکو

خۆی یاداشتم نەکردوە. وتی: رەفیق نیشی کوردان پووچە،مستق(مەلا مستەفا)ئالۆز و بەلۆز دەکات.ئەم شەرەی بۆ دروست کرد.

3. لەساڵی 1963 کەدوو برەکی بەرپا بوو ،لەنێوان بارزانی و پارتی،ئەوەبوو چومەلای شێخ ئەحمەد شکاتم کرد لەمەلا مستەفا،شێخ محەمەد خالد فەرموی کاک رەفیق، مەلا مستەفا بریاری داوەدەسەڵات بەسەر شۆرشدا بگرێتو ئینجا لەناوی بەرێت.من رەوانەت دەکەم بۆ لای شێخ،بەڵام رۆژێک دەبێت چاومان بەیەک دەکەوێت،دەڵێیت نەچووبامایە.
4. شێخ عوسمان بارزانی وتی: من برازای مەلا مستەفام،ئەگەر ئەمزانی ئەوەکوردەو بۆ کورد هەوڵدەدات خزمەتی نیشتمانەکەدەکات،منیش چەکم بۆ هەڵدەگرت،بەڵام دڵسۆزی و پاکی لەدڵی ئەو مامەمدا نییە.
5. ئینجا لاپەرەی دوای ئەوە: لەسەرتاوانبار و خائن و دوژمنی کورد و کوردستانی گەورەو ئازادی و دیموکراتی و مافی چارەنوسی گەلی کورد و دامەزراندنی حکومەتی کوردی (جەلال تاڵەبانی).

## رونکردنەوەیەک دەربارەی خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی :

بەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان وێرای بەرێزم مامەگیان یەکترمان لەساڵی 1952وەناسی، بەڵام لەسەرەتای شۆرشی 14ی تەموزی مبارەکی ساڵی 1958 وەساڵ بەساڵ شارەزایی و زانیاری و ماهیەتی ئەم زاتەمەزنەم بۆ دەرکەوت و بووین بەجێی باوەر و متمانەی یەکتری،هەڵویست و بیر و بۆچوون و نەخشەو پیلانمان دامەزراندنی حکومەتی کوردی بوو.

جەلال تاڵەبانی کێیە؟ بەدەگمەن رێکدەکەوێت هاوڵاتییەک هەڵکەوێ ئەو هەموو بەهرانەی بەجارێک تێدا بێت.کەسایەتی یەکی بەهێز و توانا،تێکۆشەرێکی نیشتمان پەروەر و سیاسییەکی بەئەزمون و دەرکەوتووکەلەجیهانی سیاسەتی کوردستاندا بەم جۆرەناسراو بێت. دەریایەکەلەزانیاری دەربارەی سیاسەت و کلتوری ئەدەبی کوردی.چەند کتێبی دەرکردوە،چەندین زمان دەزانی،سفرەرازاوەو قسەخۆش و نوکتەزان و بەگاڵتەو گەپە.

گەیشتبومەئەو باوەرەکەجەلال فریشتەیەو خودای مەزن بۆ گەلی کوردی ناردوەتەخوارێ تاکو رزگاری بکات.

کەلەساڵی 1964 مەلا مستەفای بارزانی و عەبدولسەلام عارف کودەتایان کرد،بەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان،ئەوەبوو بارزانی دەسەڵاتی بەتەواوەتی بەسەر پارتی و شۆرش و کوردستانی باشوردا گرت.

جەلال رووبەرووی بارزانی و عەبدولسەلام عارف راوەستا و تەسلیم بەئیرادەیان نەبوو.کەعەبدولرەحمان عارف بوو بەسەرۆک کۆماری عێراق،ئەوەبوو لەرێگای بەندەوەپەیوەندییەحکومەتی عارفەوەکرد.باڵی مەکتەبی سیاسی دامەزراند.

جەلال گەیشتەئەو باوەرەکە،یەکەم نەخشەو پیلان دانان بۆ لەناو بردنی بنەماڵەی شێخانی بارزانی، پاشان دامەزراندنی حکومەتی کوردی.

جەلال دوای ئەوەی بنەماڵەی بارزانی ئاشبەتاڵیان بەشۆرشی ئەیلول کرد،ئەوەبوو لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی تێکۆشەری سیاسەتمەدار حزبێکی سیاسی دامەزراندوەبەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.زۆربەی هاوڵاتی کورد لەسەرانسەری کوردستانی باشور پەیوەندیان بەیەکێتیەوەکرد.

خوێنەری هێژا :   کەرامکرد لەکوردستانی باشور لەچنگ بەرێزان،مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی،هاتمەئەوروپا،لەشاری گوتێنبورگی وڵاتی سوید جێگیر بووم. چەند هاوڵاتی یەکێتی پەیوەندیان پێوەکردم ،چ لەرێگای تەلەفون یان بەنوسراوە یان لەدیداری حزوریدا، و پرسیاریان ئاراستەدەکردم دەربارەی شەخسی بەرێز جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ناوەرۆکی پرسیارەکانی هەموویان لەیەک بازنەدا کۆ دەبووەوە.جا لەبەر ئەوەپێویست بەوەناکات یەکەیەکەئاماژە بەناوی ئەو هەڤاڵانەبدەم .هەرچەندەهەر هەموویان شەخسەن جەلال تاڵەبانی باش دەناسن،بەڵام ئیمرۆ جەلال تاڵەبانی ئەو هەڤاڵەدێرینانەئاناسێتەوە،چونکی ئەوەندەغەرور و لەخۆ بایی بووەکەتەنها کومپانیاکەی دەورووپشتی دەبینێ و بەس.

جا هەڤاڵانی برێز،داوای لێبوردنتان لێدەکەم،تەنها ناوی یەکێک ئاماژە پێدەدەم، لەبەر ئەوەی شارەزایی و زانیاری تێوەو بەندەو خودی جەلال تاڵەبانی،هەرستی لامان بەرامبەر ئەو برا بەرێزەهەمانە.

پێشەکی کورتەیەک باسی نوێنەری مام جەلا ئەکەم،یانی مامۆستا بورهان حەبیب: لەمانگی تەموزی ساڵی 2006 کاک نەبەز حاجی شەفیقی مەلایان پەیوەندی پێوەکردم.خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کەئیقامەم وەرگرتوەو سەردانم دەکات.وتی مامۆستا بورهان حەبیبیش زۆر حەز بەدیدارت دەکات.کاک بورهان مەسئولی یەکێتی لەستۆکهۆڵمەو شەخسێکی زۆر ناسراوەو نوێنەری خودی مام جەلالەو جێ باوڕ و متمانەیەتی و پەیوەندی راستەوخۆی رۆژانەیان پێکەوەهەیە،بۆ تۆ زۆر باشەپێویستیت پێدەبێ.ئەگەر پەیامێکت هەبێت بۆ خودی مام جەلال بەهاسانی دەگاتەدەستی.

کاک نەبەز یەک لەدوای یەک پەیوەندی پێوەدەکردم و ئەمەی تکرار دەکردەوە. لەیەکەم رۆژی کەپێوەندی پێوەدەکردم ئەمەوەڵامم بوو" سوپاست دەکەم و خۆشحاڵ دەبم با هاتنت و حەز بەدیدارت دەکەم".

وتم : من شانازی بەوەوەدەکەم رۆژێ لەرۆژان لەخزمەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا بووم،بەڵام ئێستاکەهیچ جۆرەپەیوەندیەکم بەیەکێتی و جەلالەوەنەماوە.خێرم زۆر دیت لەجەلال هەتاکو لەبرهان حەبیب ببینم،ئەخێر پێویستم بەیارمەتی دان نییەو بورهان حەبیبیش ئەناسم باشترە.

دوای سێ رۆژ هاوسەرەکەم ناچاری کردم لەوەڵامدا بەکاک نەبەز بڵێم فەرمون و کاتمان دانا. تەشریفیان هاتن،بەگەرمەوەپێشوازی و بەخێر هاتنمان کردن،بەندەو هاوسەرەکەم میوانداریمان کردن.

بەرێز بورهان حەبیب چەند پرسیارێکی دەربارەی کتێبەکانم ئاراستەکردم ،یەکەیەکەوەڵامم دایەوە.وتم: چاپیان ناکەمەوەو ئیتر کتێب نانوسم و پەیوەندی بەهیچ حزبێکی سیاسی کوردییەوەناکەم.لەخزمەتی گەلی کورد و کاری سیاسی سەربەخۆدا دەبم.

بەرێز بورهان حەبیب دەستی کرد بەگفتوگۆ لەیەکەم وشەو دوا قسەی دەربارەی خودی مام جەلال ویەکێتی پروپاگەندەکردن بوو، وەکو CD ویدیو لەقسەکانی راوەستانی نەبوو،هەر مام و یەکێتی.

بەندەچەند جارولامم دایەوەو نمونەم بۆ هێنایەوەکەمن دەربارەی مام جەلال گەلێک لەتۆ زیاتر زانیاریم هەیە،لە چەندەهاساڵ پێش ئێستاکەوە،بەداخەوەهەر گوێی لەقسەکانی خۆی بوو ،ناچاری کردم وتم: بەرێزتان پەیوەندیتان هەیەبەمام جەلال،ئایا ئەگەر پەیامێکی ئاراستەبکەم لەرێگای تۆوەئەتوانیت بگاتەدەستی خودی مام جەلال.

لەوەڵامدا وتی پەیامەکەت چییە؟

وتم : لەرەفیق پشدەریەوەبۆ مام جەلال،مام جەلال یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کردەسێ باڵ ،دوایی خۆت خانەنشین دەکەی،بەیەکجاری دەگوازییەوەبۆ پایتەختی عێراقی عەرەبی،ئینجا بەناوی خودی خۆت نوسینگەیەک دەکەیتەوە.

بۆ ئاگاداری لەساڵی 2005 نامەم بەکاکەدوکتور فواد مەعسوم وت.دوای ئەو قسەی من،ئیتر هەمبانەکەی هیچی تێدا نەما و رۆیشتن.لەخزمەتیاندا بووم تاکو سواری ئوتوموبیلەکەیان بوون بەو نیازەی بگەڕێنەوەبۆ ستۆکهۆڵم.

بەرێز کاک فواد مەعسوم: تێکۆشەر و کەسایەتیێکی ناسراوەلەسەرانسەری کوردستانی گەورە،جەنابی خاوەن هەڵویستە(مەوقف) هەزار ئەوەندەی بەندەزانیاری هەیەدەربارەی بەرێز تاڵەبانی ،بەڵام جیاوازیێکی زۆر هەیەلەنێوانماندا ،کاک فواد پشتی مام جەلال بەرنادات و بەجێی ناهێڵێت.

جەمیل سەبری بەگ : لەتەمەنی 12 ساڵیدا لەشاری سلێمانی یەکترمان ناسی.لەیەکەم رۆژەوەبووین بەجێی باوەڕ و متمانەی یەکتر،وەکو دوو برا ،خانەوادەی هەردووکمان وەکو کوری خۆیان تماشایان دەکردین.ئەو پەیوەندی و دڵسۆزی و باوەڕەبەردەوامەتاکو ئێستا.ئەوەبوو لەساڵی 1970 ، بۆ تەداوی سەفەری کرد بۆ دەرەوەی وڵات.هەردووکمان لێک دوورکەوتینەوەو ئاگاداری یەکتر نەماین.

کاکەجەمیل لەبرواری 2008/7/2 پەیوەندی پێوەکردم دوای ئەو هەموو ساڵەشاد بووینەوەبەیەکترلەسوید.بەجۆرێک خۆشحاڵ و بەختەوەر بووین ژیانمان بەپلەی 180 دەرەجەگۆرانی بەسەرداهات.

کاک جەمیل بەخانەوادەوەلەشارێکی نزیک یوتوبوری دەژی.هاوسەرەکەی کچی شۆرشگێڕ و فیداکار بەکر عەبدولکەریم حەویزیە،یەکێکەلەسەرکردەکانی سوپای کۆماری مەهاباد لەساڵانی 1945 و 1946 ،هەر وەها لەساڵی 1961 پەیوەندی

بەشۆڕشی ئەیلول کرد.هاوسەرەکەی تەوافی کرد.خوسکێ جەلال حسام الدین تاڵەبانی هێناوە. کاک جەمیل لەبنەماڵەیەکی ڕووناکبیر و نیشتمان پەروەرن کەلەبنەماڵەکانی شاری "کۆی"ن شاعیری بەناوبانگ حاجی قادری کۆییە.خوالێخۆشبو باوکی سەبری بەگ بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگاری هەولێر و سلێمانی بوو لەساڵی (1942/1946).

لەساڵانی پەنجاکان کاک جەمیل پەیوەندی بەپارتی دیموکراتی کوردستانەوەکرد، بوو بەئەندامێکی پارتی، کەمەلا مستەفای بارزانی گەڕایەوەعێراق لەساڵی 1958،ئەوەبوو بارزانی سەردانی کەرکوکی کرد بەونیازەی بچێتەبارزان.

تورانیەکان نەخشەو پیلانێکیان ئامادەکردبوو بۆ تیرور کردنی مەلا مستەفای بارزانی. کاک جەمیل دەست بەسەر ئەو نەخشەو پیلانەدا دەگرێت. لێژنەی ناوەندی پارتی ئاگادار دەکات.ئینجا کاک جەمیل ڕێگای هاتنەژوورەوەی بارزانی بۆ کەرکوک و چونەدەرەوەی دەگۆڕێت.بارزانی بەسەلامەتی رزگاری بوو.

کاکەجەمیل پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلولی ساڵی 1961 کرد،مەکتەبی سیاسی کاک جەمیلیان هەڵبژارد بەدادوەری شاری قەلادزێ و مەلا مستەفاش بڕیارەکەی پەسەند کرد.کەدووبەرەکی و جیابوونەوەلەنێوان باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی و خودی مەلا مستەفای بارزانی ڕویدا،کاک جەمیل لانەی حزبایەتی گواستەوەبۆ ناو باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی.دوای 11 ئاداری ساڵی 1970 لەگەڵ هەڤاڵانی باڵی مەکتەبی سیاسی گەڕایەوەناو پارتی دیموکراتی کوردستان.دوای ئاشبەتاڵی ساڵی 1975لەگەڵ شەهید "عەلی عەسکەری" و پێشمەرگەکان گەڕایەوەبۆ عێراق.

کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان دامەزرا خۆی بەخت کرد لەخزمەتی یەکێتی دابوو.کەساڵی 1985 عێراقی بەجێهێشت لەگەڵ خانەوادەی لەشاری "ترۆلهێتان "ی وڵاتی سوید جێگیر بوو.بەدرێژایی هەموو ئەوساڵانەنێشوکاری یەکێتی بەڕێوەبردووە و چەندەها کتابی بڵاو کردوەتەوە.لەڕۆژنامەعەرەبیەکان بەردەوام وەڵامی داوەتەوە.کەهێرشیان هێناوەتەسەر کێشەی کوردی،بەردەوام وڵامی روناکبیر و نوسەرانی عرەبی داوەتەوە،لەسەر چارەسەر کردنی کێشەی کورد.

بەندەو کاک جەمیل ڕۆژانە پەیوەندی تەلەفونیمان لەگەڵ یەکتری هەبوو. گەوتوویژ و لێکۆڵینەوەمان لەسەر کێشەی کورد دەکرد،هەندی بۆچونمان جیاوازی پێکەوەهەبوو.بەتایبەتی دەربارەی ئەو باروەدۆخەو دامەزراندنی حکومەتی کوردی. بەڵام بەندەرێگایەکی ترسناکم بۆخوم تەرخان کردبوو،ئەویش دەمزانی دواجار تیرۆر دەکرێم.ئەو بەڕێزەش (کاک جەمیل) ئاگاداری هەبو کەلە2008/12/ چوار میلشیای پاراستنی مەسرور و مەسعود بارزانی هاتبون بۆ تیرۆرکردنم.

لەبرواری 2009/2/2 کاک جەمیل نوسراوێکی ناراستەکردبووم،ئاوەرۆکی نامەکەی دەربارەی شەخسی بەڕێز مام جەلال بوو،دەڵێت وڵامی هەر هەموو ئەو پرسیارانەم بدەیتەوەجێی سوپاسە.

بەندەش وڵامی پرسیارەکانم دایەوەو لەخوارەوەبەکورتی ئاماژەم پێداوە.

*پرسیاری یەکەم:* پەیوەندیت لەگەڵیان چۆن بوو؟ تاچ ڕادەیەک باورتان بەیەک هەبوو؟

*وڵام:*پەیوەندیمان دوو براو و دوو هەڤاڵی سیاسی ،نەخشەو پیلانمان چارەسەر کردنی کێشەی کوردی و رزگار کردنی گەلی کورد لەچنگی کۆنەپەرەست و شۆڤێنی نژادپەرەستی "تورک،فارس و عەرەب" ،پاشان لەناو بردنی بنەماڵەی شێخانی بارزانی،چۆنیەتی دامەزرانی حکومەتی کوردی.چەندەباوەرم بەباوک و براکانم هەبوو و دڵسۆزیم بۆیان بوو سەد ئەوەندەزیاتر باوەرم پێی هەبوو.وام دەزانی فریشتەیەو خودای مەزن ناردویەتی گەلی کورد رزگار بکات.

بەندەبەئان و بەرگی خۆم لەخزمەتی دابووم.لەکاتێکدا پێویستیم بەهیچ جۆرێک بەو نەبوو کەیارمەتیم بدات.بەڵام خودی ئەو لەهەموو بوارێکەوەپێویستی بەبەندەهەبوو.لەئەنجندەی خۆم ئەو حیسابەم بۆ کردبوو، سرکەوتنیم بەرزگاری گەلی کورد دادەنا.

لەبەر ئەوەچەندەها شتی گرنگم ئەنجامداوەو لەکاتێکدا ئەو ئاگاداری نەبوە،بەڵام پروپاگەندەم بۆ ئەو تۆمار دەکرد.

بۆنمونە: 1. حەمەی مەلا شەریفی مەنگور کوێخای گوندی سورەگوڵی،لەکتێبەکانم "کورد دوژمنی خۆت بناسە" ئاماژەم پێداوە، وا بەکورتی دووبارەی دەکەمەوە.لەسەر کێشەی زەویهاوڵاتیکی خەڵکی گوندی (نسینی)ی خۆراگری تیرور کرد.فەوجێک لەپۆلیس و دەستەیەک لەسەرباز لەشاخی قەندیل دەگەڕان بۆ ئەوەی دەستگیری بکەن و لەشاری سلێمانی

لەسێدارەی بدەن.ڕاپۆرتێکم ئاراستەی مەکتەبی کاروباری شمال کرد کەبەرپرسیارەکەی،سەدام حسین بوو.دوای ئاشبەتاڵ ئەمەیەکەم ڕوداوەلەشمالی عێراق ڕوویدات.لەناوچەی پشدەر ـ قەڵادزێ،چەند چەکدارێک ژمارەیان(10 کەس) ڕوویەڕوی حیزبی بەعس ڕاوەستان.

ئەوەبوو نەخشەو پیلانەکام سەرکەوتنی بەدەست هێنا و سەدام حسین م لەخشتەبرد.لەکاتێکدا ئاگاداری نەبوو،بەڵام ئەم پرۆژەیەم بەناوی مام جالال بڵاوکرەوە.

2/ دوای ئاشبەتاڵ لەسەرانسەری کوردستانی هیچ هاوڵاتیێک توانای ئەوەی نەبوو نەبەئشکرا و نەبەنهێنی چەک هەڵگرێت.

پێش ئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شۆڕشی چەکداری بەرپا بکات،ئەوەبوو بارەگایەکم لەشاخی قەندیل بۆ دامەزراندن.یەکەم خانەوادەی کەڕوویان کردەئەوبارەگایەخوشکی نیشتمان پەروەر،هاوسەری خوالێخۆشبوو شەهید عەلی عەسکەری بوو،بۆ حەسانەوەو باری ئەمنی.لەکاتێکدا مام جەلال ئاگاداری نەبوو بەناوی ئەو پرۆپاگەندەم بۆکرد.

3/ چیم لەتوانا بوو بۆ هەڤاڵانی کۆمەڵەی رەنجەدەران ئەنجامدا،چ ئەوانەی شەهیدکران یان ئەوانەی خراپەتەگرتوخانەوزیندانەوەیان ئەوانەی چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کردن.وەڵامەشم وەشەجەلال ئاگادار نەبوو.بەڵام پرۆپاگەندەکەم بۆ ئەوکرد.

4/ دوکتور فواد ئەحمەد و چەند هەڤاڵێکی کەرزگارم کردن لەگرتوخانەی ئاسایسی گشتی بەغداد،لەکاتێکدا مام جەلال ئاگادار نەبوو،پرۆپاگەندەم بۆ ئەو دەکرد.

<u>پرسیاری دووەم</u>: لەساڵی 1958وەسام جەلال ئەناسیت و پەیوەندیت لەگەڵیدا هەیە،ئایا چۆن ئەم مرۆڤەت ئەناسیوەو بۆت ئاشکرا نەبووە؟

وڵام : لەسەرتاسەری ساڵی 1964 تاکو 1981/12/16وەلەئەجندەی تایبەتی خودی خۆم بەم شێوەیەمام جەلالم هەڵدەسەنگاند. هەر حکومەتێک یان هەر حزبێک یان هەر سەرۆک هۆزێک یان مرۆڤێک هەڵوێست و بیر و بۆچونی بەرامبەر گەشبین بوایە،بەئەندەبەدۆستی دێرینی کوردم دادەنا و ڕێزی زۆر تایبەتیم لێدەگرت. ئەگەر هەڵوێست و بیر و بۆچونی بەرامبەری ڕەشبین بوایە،بەئەندەبەدوژمنی کوردم دادەنا و بەئاشکرا و نهێنی دژایەتیم دەکرد. بۆ نمونە: بنەماڵەی شێخانی بارزانی،

بەندەی خزمەتکاری کورد و کوردستان(ڕەفیق پشدەری) لێزانێکی موخابەراتیم کەسایەتیێکی سانایی نیم. دوای سەروەت و سامان و پلەئەکەوتووم،هەتاکو ئێستاکەهیچ حکومەتێک و حزبێکی سیاسی و هەواڵگرێکی جیهانی چەند هەوڵیان دابێت،نەیونتوانیوەبەندەبخەنەبازنەیان و کاریان لەگەڵدا بکەم.توانیوەمەڤێڵ لەهەر هەموویان بکەم.

لەکاتێکدا شارەزایی و زانیاری تەواوم هەبوو(100%) و هاوکاریم کردوەکەلەخوارەوە ئاماژەم پێداوەلەسەر خودی جەلال تاڵەباتی. ئەوەندەزیرەک و زانایە لە شەیتان شەیتانترە، خزم و کەس و کار و هەڤاڵی نییە.ئەوەی فەرمانەکەی جێبەجێ بکات ئەوکاتەبرایەتی،دوای ئەوەی کارەکەی ڕاپەراند پشتی تێدەکات یان بەکوشتنی دەدات یان ئاشکرای دەکات.بەناو ئاینی ئیسلامەبەڵام هیچ ئاینێک ناپەرستێ،حەرام و حەڵاڵ لێک ناکاتەوە،دیکتاتۆرەو باوڕی بەئازادی و دیموکراتی نییە.مامۆستایەکی گەورەیەبۆ دووبەرەکی و ئاژاوەنانەوە.تێکدەرەو ڕق و کین هەڵدەگرێت بۆ کات و ڕۆژی خۆی. پارەپەرست،ڕەزیل، هیوایەتی هەرگەورەی ئەوەیە لەناو حیزب و عەشایر و هەمو خانەوادەیەک مەرجەهەمو زانیارێکی هەبێت.

100% بۆیە هاوکاریم کردبوو چونکی قەناعەتی پێ هێنابووم هەموو ئەو ڕێگایانەی کە ئاماژەم پێداوە دەگەرێتەبەر لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی گەورە و دامەزراندنی حکومەتی کوردی،جا بۆیە تەسلیم بە ئیرادەی بووم،هەربۆیە چەند جار لەتیرۆرکردن رزگارم کردوە.کە خودی خۆی ئەو شەهادەتەی داوە چەند جار رزگارم کردوە.

لەبرواری 1981/12/17 لەگەڵ ئەوهەڤاڵانەی کە لە خوارەوە ئاماژەم بەناوەکانیان داوە و هاتینە ریزیشۆڕشی چەکداری یەکێتی نیشتمانی کوردستان:

بازیان رەفیق پشدەری و براکانم هەریەک جەماڵو قادر و نادر و کوڕەکانی خوشکەکانم جەلال ئیسماعیل و مەریوان رەحمان.

لەبرواری 1981/12/18 لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە دیداری مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانمان کرد لە بارەگای تایبەتی خۆی لە ناوزەنگ لە سەرسنوری عێراق و ئێران.لە پرسگا چەکەکانیان لێوەرگرتین،ئەخوش نەبوو،ئەوە بوو خۆی ئەخۆشکرد،بۆ ئەوەی وتووێژم لەگەڵ نەکات،تاکو پرسیاری لێنەکەم.بەساردی پێشوازی لێکردم،یەکسەر زانیم کە هەلویستی گۆڕاوە بەرامبەرم بە پلەی 180 دەرەجە.هەتاکو دوێنێ لە 100% باورمان بە یەکتری هەبوو،وا ئەمڕۆ نزیکی ساڵی 1982 شک و گومانم لێدەکات؟

شەوی 18 لەسەر 1981/12/19 لەناو خۆماندا دەربارەی ئەوچاوپێکەوتنە وتووێژمان لەسەرکرد.

بازیان وتی: مام گۆڕا بوو بەرامبەرمان،بەتایبەتی بەرامبەر بە من،ئایا بۆچی ماچی نەکردم و رێگای پێنەدام دەستی ماچ کەم.

قادر وتی: مام خۆشحاڵ نەبوو بە دیدارت بە تایبەتی لێرە چونکی لە ماهیەتی تۆ ئەترسێت،ژیانت کەوتە ترسناکی،پرسیارێک : ئایا چۆن خۆت رزگار دەکەی؟

جەماڵ وتی : سەدخۆزگە لە لەندەن یان عێراق جێگیر بوایەتی و نەهاتبایتەوە بەردەستی ، کارێکی ناجۆرت ئەنجامدا،ئێنجا یەکەیەکە وەڵامم دانەوە.

وتم: نەخۆش نەبوو،نەگۆڕاوە و مامجەلالی جارانە،بارەکەی زۆر قورسە چونکی کێشەی گەلی کورد رووبەرووی ئەو بووەتەوە دەربارەی چارسەرکردنی.شک وگومانمان لەیەک نەبووە و نابێت.ئێمە دووبرای یەکترین،چەند رێز و دڵسۆزیتان هەیە بۆ من،ئەبێت سەدئەوەندە زیاتر بۆ مام جەلالتان هەبێت.ئەوەندەی باورم بە ئێوە هەیە سەدئەوەندەش باورم بە مام هەیە.بۆ نمونە وتم،داستانێکتان بۆ بگێرمەوە،پادشای عێراقی یەکەم"مەلیک فەیسەڵ" دەبێت ،کە مرد کوڕەکەی "غازی" بوو بە پادشای عێراق.ئەوکاتە "غازی" لە کۆلیجی عەسکەری قوتابی ئەبێت.هاورێکی زۆر دڵسۆزو خۆشەویستی ئەبێت بە ناوی "فواد عارف" .پادشا غازی لەگەڵ فواد عارف دووبەدوو گفتوگۆ دەکەن.پادشا غازی دەڵێت: من بووم بە پادشای عێراق و تۆم هەڵبژارد بە یاوەری خۆم،جا لە کاتی پێشوودان کە دووبەدوو دەبین ئەوکاتە هاورێکەی جارانین،بەڵام لەکاتی کۆبوونەوەم لە کۆشکی پادشایی تۆ یاوەریت.هەموو قسە و وڵامێک بەڵێ پادشا لەخزمەتدام دەبێت.

ئێمڕۆ مام جەلال لەو دەبەرە پادشایە و گەورەترین دەسەڵاتی هەیە و هەموو کارێکی ناجۆری لەدەست دێت.ئەبێت من و ئێوە باوەڕ بەوە بکەین تاکو رۆژێک دێت خۆمان رزگار بکەین لەدەستی.ماهیەتی جەلال و باروددۆخەکەم بەتەواوەتی بۆ شیکردنەوە.ئەبێت ئاگام لەخۆم بێت و فێڵ لە خۆم بکەم و بە هیچ جۆرێک وا پیشان نەدەم کە هەستم پێکردوە.

پرۆگرام و نەخشەو پیلانێکم ئامادەکرد.لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆمان و چۆنیەتی جێگای خۆمان بکەینەوە لەناو برا پێشمەرگەکانماندا لەدەبەرەکە بەگشتی. یەکەم هەنگاو لەپێناو حەسانەوە و پشودانی خۆمان و براپێشمەرگەکان بە شێوەیەکی گونجاو و رێکو پێک و مودێرن بارگەکەمان رێک خست .هەموو پێویستیەکانمان بە تەواوەتی جێبەجێ کرد.ماکنەیەکی کارەبام کڕی،تەلەفزیۆن و ڤیدیو،خۆراک و زەخیرە،لەنەوت و بێنزین و کارەبام دابینکرد بۆ هەموو بارەگاکانی دراوسێم لەگەڵ ماڵی هاڵاڵێک لە گوندەکە.چێشتخانە و حەمام و تواڵێتم دانا،سەرنجی خەڵکی راکێشا،توانیم لەورێگایەوە لەگەڵ زۆرینەی پێشمەرگەکان ناسیاوی پەیدا بکەم.توانیم لەو رێگایەوە باس لە بیرەوەرییەکانی خۆم بکەم و باسی ئەو باروددۆخەیان بۆ شی بکەمەوە،دوا رۆژمان رەش بینم بەهۆی ئەو دووبەرەکیەی کە بەردەوامە لەناو حیزبە سیاسیەکان.

سەردانی براپێشمەرگە زامدارەکانم کرد کە لە بیمارستانی شۆرش بوون.یەکێک لەوبرا پێشمەرگە زامدارانە یەکەم جار بوو بە خزمەتی شاد دەبووم.وتم تۆ گەنجی بۆ چی پێت دەڵێن مام رۆستەم.ئێنجا سەردانی هەڤاڵی نیشتمان پەروەر و شۆرشگێر دوکتور فایەق گوڵی بەرێوەبەری بیمارستانەکەم کرد وتم بەیانی خواردنتان بۆ رەوانە دەکەم و تەلەفزیۆن و ڤیدیوشتان بۆ ناراستە دەکەم.

ئەمە یەکەم جارە دووبەدوو لەگەڵ جەلال گفتوگۆ بکەین ،وتی: چیمان بۆ ئەکەی؟ وتم: چی بە ئێوە ناکرێت ئامادەم ئەنجامی بدەم.

وتی: گەورەترین کێشەی ئێمە دابین کردنی خۆراکە بۆ بارەگاکانی پێشمەرگەکان،تۆ لەبەر ئەوەی کەسایەتییەکی ناسراویت بەتایبەتی لەودەبەرە ئەتوانیت بەهاسانی کێشەی خۆراکمان بۆ جێبەجێ بکەیت و ژمارەی پێشمەرگەکانت زیاد بکە بگاتە 50 کەس.

وڵامم داوە ئامادەم ئەنجامی بدەم ،بەڵام با بزانم پێویستیەکانم چیە ئامادەی بکەین ،بەیانی قسەی لەسەر دەکەین.

لەدیداری دووەم جار پێویستیەکانم خستە سەرکاغز،ئەمجە قەڵادزێ بۆ چۆنیەتی دابین کردنی خۆراک و هێنانی.

وتی: کارێکی گرنگی کەش هەیە ئەنجامی بدە،ئەتوانیت لەگەڵ خۆت چەند پێشمەرگەیەک ببەیتە ناوشاری قەڵادزێ،دەست بەسەر سەرای قەڵادزێ"دا بگریت.چونکی ئێمە توانای زۆرمان هەیە،بەتایبەتی لەرێکخراوی ناو پۆلیسی قەڵادزێ.

ئەوە بوو چومە قەڵادزێ،دوای 7 رۆژ گەرامەوە،یەکسەر لەگەڵ مام کۆبوینەوە بە دوورودرێژی ئاگادارم کرد.

1/ دەربارەی گرتنی قەڵادزێ : لەبەر ئەوەی شتێکی سانایی نییە بە جارێک 14 پێشمەرگە بچێتە ناوشاری قەڵادزێ،داوام لێکردن بگەرێنەوە کەی پرۆژەکەم دەست پێکرد داوای هاتنیان دەکەم..تەنها بەندە و یەک پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم بردە ناوشاری قەڵادزێ( مختار عەبدوڵە حاجی غەریب) پەیوەندیم بە مەسئولی کەرتی پۆلیسەکان کرد.(خالە هەمزە) نەخشە و پیلانێکی ستراتیژیمان دانا بۆ ئەنجامدانی و کاتمان دانا،باڵام ئەوە بوو پاشگەزمان کرد،چونکی دوو لەو هاوڵاتیانە ئاشکرایان کردین،دەرکەوت سەر بە ئاسایشی سلێمانین.

2/ دەربارەی خۆراک: توانیم مقداری ئەو هەمو خۆراکە کۆ بکەمەوە بەو شێوەیە حەسەن و جەماڵی برام و فەخری خۆشکم خۆراکەکە لەچەند ماڵێک دادەنێن.ئینجا بە تراکتۆر بازیان و نادر دەبنە کاروانچی،چوار ئێسترم کری بۆ گواستنەوەیان بۆ ئێرە.

جەلال پرسیاری کرد وتی: ئەوەی بۆت باسکردم شتێکی باشت ئەنجامداوە،باڵام چۆن توانیت ئەم هەمو خۆراکە بە پێتاک کۆ بکەیتەوە،ئەوانە کێن کە ئەوەندە دڵسۆزی یەکێتین بابزانم؟

وتم:لەگەڵ 19 هاوڵاتی لەچەند ماڵێک کۆ بوومەوە بە ئامادە بونی حەسەنی برام داوای یارمەتیم لەو بەرێزانە کرد بە ناوی بنەماڵەی خۆمان،کتوپر ئامادەی خۆیان پیشاندا کە یارمەتیەکەیان پارەی نەقدم بدەنێ.من لەهەر هەمویان بەرامبەر پارەکە خۆراکم دەوێت بە نرخی حکومت.لەم 19 هاوڵاتیە 14 پارتین و 2 شیوعین و 2 یەکێتین.

ئینجا لیستی ناوەکانم دایە یەکە یەکە سەرنجی ناوەکانی دا و وتی<ئەمە باش ئەناسم "حەمەسوری مینە عەرەب" پارتیە.

هەڤاڵی نیشتمان پەروەر و شۆرشگێر دوکتور خدر مەعسوم " گۆچانی دەستی مام جەلال" سەردانی کردم بە دووروودرێژی باسی ئەو سەرکەوتنەی بۆ کردم . کە هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شێرانە هاتنەدەست و هێرشی بردە سەر بارەگای سەرکردایەتی حیزبی شیوعی لە "پشتاشان" هەر هەموو بارەگاکانیان داگیر کرد.چەکدارەکانیان،زۆرینەیان رایان کرد و ئەوەی کوژرا و زامدار بوو یان بە دیل گیرا لەناویاندا "کەریم ئەحمەد"یان تێدایە.

وتم: کاکە دوکتور ئەوەندە خۆشحاڵی ئەڵێی کوردستانتان رزگار کردوە،دەبوو ئەو هێرشە کرابایەتە سەر حیزبی بەعسی حاکم نەک بۆ سەر حیزبی شیوعی عێراقی.باسی مامۆستای نیشتمانپەروەر و شۆرشگێر و کەسایەتی ناسراوی کورد دەکەی دەڵێیت لە ناو دیلەکاندایە(کەریم ئەحمەد).ئێوە دوارۆژ چۆن وەڵامی شەقامی کوردی دەدەنەوە.گوتم ئەوەی ئێوە ئەنجامتان داوە ،ئەوە وەڵامی پەیامەکەی سەدام حوسەینە کە وتی: ئێمە ئامادەین کێشەی کورد بە ئاشتی چارسەر بکەین بەڵام پرسیارێک دێتە پێشێ،نازانین لەگەڵ چ لایەکیان گفتوگۆ بکەین.لەکەناڵەکان بە راسکاوی بڵاوکرایەوە لە زمانی خودی سەدام حوسەین،کە ئێمە ئامادەین؟

دوکتور: هەتاکو ئێستاکە یەکێتی شەری پارتی کردوە،بەڵام وا لەگەڵ حیزبی شیوعی و سوشیالیستی ،ئەوێشی هاتە سەر.

ئینجا گفتوگۆ دەستپێدەکات لە نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حیزبی بەعسی حاکم.دوای رۆیشتنی دوکتور خدر لە ناوخۆماندا کۆ بوینەوە بە دوور ودرێژی ئەو بارودۆخەم بۆ شیکردنەوە و بۆم هەڵسەنگاندن: ئەم دەنگۆ باسە بڵاو بوەتەوە کە بە نهێنی گفتوگۆ هەیە لە نێووان حزبی بەعس و یەکێتی دا.بۆم رونبوەتەوە کە ئەمە راستە چونکی پرسیارم کرد لە کاکە نەوشیروان مستەفا لە وەڵامدا وتی: مەلا مستەفای بارزانی توانی لە رێگای گفتوگۆ کردن خۆی بە هێز بکات و سەرکەوتنەکە و سودێکی گەورەی دەبێت بۆ یەکێتی.

ئەم دەنگۆ باسە بە رشکاوی بڵاو دەبێتەوە دوای ماوەیەکی کە لە سەرانسەری کوردستان ،ئینجا چاوپێکەوتنی دەست پێدەکات لە نێوان خودی جەلال و سەدام.پروپاگەندەی بۆ دەکەن (یەکێتی و بەعس) لە کەناڵەکانی خۆیاندا کە رێکەوتنی دەبێت.خەڵکانێکی زۆر لە دەوروپشتی یەکێتی کۆدەبنەوە،چەند هەڤاڵێکی یەکێتی نەفس نزم بە نهێنی دەچنە پاڵ دەزگاکانی بەعس.

سودمند تەنها حیزبی بەعس دەبێت،چونکی لە هەڵوێست و بیر وبۆچونی حیزبی بەعس چارەسەرکردنی کێشەی کوردی تێدا نیە.ئینجا جەنگ دەستپێدەکاتەوە و زۆر بە توندی گەلێک لە جارانی باشتر.

جا من بڕیارم داوە لە ئێستاوە مەوقف وەرگرم،پێش ئەوەی ئەو بارودۆخە روو بدات و گفتوگۆ دەستپێبکات،ئەگەر ئێوە لەگەڵمدا بن لە ئێستاوە لە یەکێتی جیا ببینەوە و حیزبێکی شەش کەسی دابنێین و هەموو نەخشە و پیلانێکی بۆ دادەنێم،هەر هەمویان 100% هەڵوێستەکەی منیان پەسەند کرد.دوای ئەوەی لەناو خۆماندا گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەمان لەسەر خاڵەکان کرد،یەکە یەکە بە دوورودرێژی شیمان کردەوە.ئینجا بڕیارماندا دەست بە کارەکان بکەین بە پشتیوانی خودای مەزن ئینشاءالله سەرکەوتن بەدەست ئەهێنین.

یەکەم هەنگاو ئاگاداری مام جەلالم کرد کە من لانەکەم دەگۆرم،حیزبێکی سیاسی سەربەخۆی شەش کەسی دادەمەزرێنین و لە خزمەتی یەکێتیدا دەبین،هەردەم ئامادەم فەرمانەکانت جێبەجێ بکەم.

ئینجا بە راشکاوی بڵاوم کردەوە و دەستم بە نامە نوسین کرد،راستەوخۆ پەیوەندیم کرد بە هەموو ئەوهاوڵاتیانەی کە زانیاری و دۆستایەتیمان لەگەڵیاندا هەبوو.جاری پەیوەندیمان پێوە مەکەن وهیچ جۆرە یارمەتیێکمان جاری پێویست نییە.هەمووی ئەو هاوڵاتیانەی کە نوسراوەیان ئاراستە کردبووم و ئەو بەرێزانەی کە سەردانیان کردم.

وەڵامی پرسیارەکانی هی هەر هەموو ئەو بەرێزانە یەکە یەکە چ بە نوسین یا رووبەروو بۆم رونکردبونەوە لە هەڵوێست و بیر و بۆچون و نەخشە و پیلانەکانمان بەراشکاوی پرۆگرامەکەم بۆ شیکردنەوە کە لەو دوو خاڵەی خوارەوە بە کورتی ئاماژەم پێداوە.

1/ دەربارەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هیچ هەڤاڵێکی یەکێتی لە حیزبەکەمان وەرناگرین.گەشبین دەبین،هەڵوێستێکی ناجۆرمان نابێت،یارمەتی بە یەکێتی ئەدەین و لە خزمەت گەلی کورد دا دەبین.

2/ کەم و پوخت، لەژمارەی 200 ئەندام تێنایەڕین.زوو زوو بارەگاکەمان دەگۆڕین،لە شوێنێک دەبین لە شاخەکان دوور لە بارەگاکانی یەکێتی.شێوەی پارتیزانیمان (ئێلدەوراکە)،ناوی هەموو ئەندامان نهێنی دەبێت،تەنها ناوی 8 هەڤاڵ نەبێت.راوە بەعسیەکان و سیخورەکان دەکەین لەناو شارەکان.ئێپوردن لای ئێمە نابێت بەرامبەر سیخور و دوژمنانی کورد.

ئەوانەی دیداریان کردم تەنها ناوی سێ لەو بەرێزانە ئاماژە پێدەدەم،کە بە دوور ودرێژت بۆم روونکردنەوە کە لە سەرەوە باسم کردوە،ناوی ئەو بەرێزانە:

یەکەم شۆرشگێری ناسراو "عومەر عەبدوڵلە" بەڕێوەبەرایەتی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی. دووەم شۆرشگێڕ و کەسایەتی رۆژهەڵاتی ناسراو و کادرێکی چالاکی بە ناوبانگی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەرێز ئەحمەد حەداد.سێهەم خۆشکە "هێرۆ" کچی مامی گەورەم مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد هاوسەری جەلال تاڵەبانی.ئەم خوشکە بەرێزە هەمیشە شانازی پێوەدەکەم،دوو بە دوو گوتم: راستی جێی شانازیە کە توانیوتە هەتاکو ئێستاکە لەگەڵ ئەو مرۆڤە (جەلال) ژیاویت! خودای مەزن ئاگادارت بێت.

بەندە ئاماژەم پێداوە لە کتێبەکانم دەربارەی رابردوی ماهیەتی یەکترمان لە هەڵوێست و شارەزایی تەواوی یەکترمان دەزانی .باڵام خوشبەختانە لە ماوەی ئەو یەک ساڵە کە لە ژێر فەرمانیدا بوم،بە قەدەر ئەو 25 ساڵەی رابردوو شارەزایی و زانیاری زیاترم لە ماهیەتی ئاگادار بووم.کە دەسەڵاتی بە سەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان داگرت،ئەوە بوو لە هەموو بوارێکەوە گۆڕا.

چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد بەم جۆرە دیکتاتۆر و زاڵم و پیاوکوژ بێت.بەرامبەر بە من بەو شێوەیە بگۆڕ بێت.من لەژیانمدا ئازار و ئەشکەنجە و بەربەرەکانێم نەکردوە،بەڵام هەندێک جار باروددۆخەکە وا هاتوەتە پێش کە خۆم بەسەر ئەودا زاڵ بکەم،بۆ ئەوەی کارەکە ئەنجام بدەم.لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی ئەوبەڕێزە. بەڵام ئەو کین و قین هەڵدەگرێت هەتا هەتایە.بۆ نمونە: لە ساڵی 1972 لە کوەیت دەگەڕاینەوە (رەفیق و مام جەلال و هێرۆ) بۆ عێراق،لە گومرکی سفوات کارەکەم ئەنجامدا.وتم: بەڕێوەبەری گومرگ سفوان ئاگاداری کردم کە لە نێوان شاری "عەممارە و بەغداد" پۆلیسی گومرگ بەردەوام لە هاتوچۆکردنندان،راتان دەگرن بۆ ئەوەی توشی کێشە نەبێت و بەسەلامەت بگەیتەوە بەغداد،تەنها دەسەڵات بەدەست ئاسایشی "بصرە"یە ئەوان ئەتوانن کۆمەکتان بکەن.یەکسەر گوتی ئەمە بۆ ئێمە زۆر باشە و لەبەرژەوەندیمانە با بڕۆین ئەوکارە ئەنجامدە.بەڵام ئێمە لەناو ئوتومبیلەکە چاوەڕوانت دەکەین.

کە دیداری بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی شاری بەسرەم کرد وتم: لە کوەیت گەڕاومەتەوە ئەوەندە شتومەکم بە قاچاغ هێناوە تاکو پارەکەم تەواو بوو و جێگام بووە لە ناو ئوتومبیلەکە.هەرچەندە بەڵگەم بۆ هێناوە کە دەبێت بگەڕێمەوە ،بە پەلەم ئەبێت ئەم شەو لە بەغداد بم.ناچاری کردم کە خواردنێک پێکەوە بخۆین.ئەوە بوو ئاشکرام کرد کە مامۆستا جەلال و هاوسەرەکەی لەدەرەوە چاوەڕوانی من دەکەن. کتوپڕ هاتەدەرێ و بە گەرمە پێشوازی لێکردین. چوینە چێشتخانەیەک،سەعات 2ی دوانیوەڕۆ کەوتینە رێگا،هەر لە شاری بەسرە تاکو لە شاری عەممارە تێپەڕبووین .دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵکردن و قسەی ناجۆر کە زۆرمان پێچو،بەردەوام بوو لەو وتنانە.نێوان کوەیت و بەسرە یەک سەعاتە ئێمە شەش سەعاتە بە رێگاوەین،سەبر لێبخوڕە لە 80 زیاتر تێپەڕ نەبێت،ئایا نەتەوێت بە کوشتنم بدەی،ئەوەی دەیگوت دووبارەی دەکردەوە ناچاری کردم راوەستام. وتم: ترسنۆک خوا بە قوربانی ئەو شازادەیەت بکات، ئەگینا ئەوەی خراپە ئێستاکە پێم دەکردیت،بڕۆخوارێ هەی چەنەبازی ترسنۆک،ئەوە بوو دەمی خۆی بەست.خوشکە هێرۆ خان کەوتە نێوانمان و حەقی دامێ و باسی لە هەڵوێست و پیاوەتی و خزمەتێ بەندەی کرد.کەوتینەوە رێگا،هێرۆ هاتە پێشێ وجەلال چوە دواوە و ئیتر قسەی نەکرد.بە سەلامەتی گەیشتینەوە بەغداد،لەگەڕەکی ئەفسەرەکان بوو هورنی ئوتومبیلەکەم لێدا و خوشکە گەلاوێژ خانی بەڕێز هاتە دەرێ.ئینجا جەلال قسەی کرد وتی حەقی تۆ بوو کە عاجز بویت.

ئەمە لەساڵی 1972 رویدا،ئەوە بوو لە 1981/12/18 ئەوەی لەبیر مابوو بە ناحەق کێشەی بۆ دروست کردم.

بۆ نمونە کاتێک کارەبام دابین کرد بۆ دەبەرەکەم،روناکیم خستە بارەگاکان،کتوپڕ ناردی بۆچی ماکنەکەت دەسوتێنی،بۆ کارەبا دابین دەکەی بۆ ئەو هاوڵاتیانە(هاوڵاتیەکان بارەگای پێشمەرگە بوون) هاوڵاتی تەنها یەک ماڵ بوو.

3- مام جەلال دوای48 سەعات داوای دیداری کردبووم،پرسیاری لێکردم خواردنت رەوانەی بیمارستانی شۆڕش کردبوو،جۆری خواردنەکان چی بوو؟

وتم: بەڵێ دوو جۆرە برنج و دوو جۆرە شلە و دوو جۆرە گۆشتی مریشک و حەیوان و کاستر و شیرینی و زەلاتە،ئینجا تەلەفزیون و ڤیدوشم بۆ ناردوون.

جەلال وتی: خودایە سەرکەوتو نەبیت،ئەوەی تۆ ئەنجامت داوە ئەمە ئەرکی سەرشانی منە،بەڵام بەمن ناکرێت.

بڕوا ناکەم هیچ هاوڵاتیێک ئەوەندەی جەلال ترسنۆک بێت. بۆ نمونە: بازیان ی کوڕم بەردەوام ئەمەی دەوت،ئازاترین پێشمەرگە مام جەلالە،منیش دەمگوت ترسنۆکترین مام جەلالە.

شەوێک خواکردی مام جەلال تەلەفونی بۆ کردم وتی کاسێتێک ڤیدیوم بۆ بنێرە و کەسم لا نییە.وتم: نیوەمتر زیاتر بەفر باریوە و هاتوچۆ کردن بە رۆژ سانایی نییە ،جا بەم شەوە.بازیان وتی من بۆی دەبەم و ئەم کارە ئەنجام دەدەم.

داوام لە جەماڵی برام کرد هەرچەندە هاتوچۆ کردن بەناو ئەو شاخە هاسان نییە و زۆریش زەحمەتە،بەڵام چیت دیبێت بۆمان بگێڕەوە.لەدەرگا مەدە و بچۆ ژوورەوە و یەکسەر چەکەکەت لە شانت داگرە،ئینجا بزانە چ دەکات.

کە جەماڵ هاتەوە هەر هەمووومان لەدەور و پشتی کۆبوینەوە بۆ ئەوەی قسەکانمان بۆ بگێڕێتەوە. جەماڵ وتی: کە چومە ژورێ ، لەناکاو هەستایە سەرپێ ،هەی بەقوربانت بم،فەرمو گەورەمان کە و یاخوا بە خێر بێت.بڕیار بدە تاکو ئەنجامی بدەم.هەردو دەستی بەرزکردەوە،ئینجا جەماڵ دەڵێت:ئەوە کاکە رەفیقم ئەوکاسیتەی بۆ ئاراستە کردیت.

مام جەلال چونکی هەواڵگرێکی جیهانییە ،لە سەرەتای ژیانی کە دەستی داوەتە سیاسەت،هەوڵی ئەوەی داوە لەناو هەموو حیزب و رێکخراو عەشایر و بنەماڵە ناسراوەکان خەڵکێکی هەبێت دەنگ و باسی بۆ بهێنێت.

بۆ نمونە: ژمارەمان 8 کەس بووین ،کە س و کاری یەکتری بووین.هەوڵێکی زۆری دا ژمارەمان بگاتە 50 پێشمەرگە،من وەڵامم دایەوە کارەکان بەو 8 پێشمەرگە ئەنجام دەدەم.دەیویست خەڵکانێک بخاتە ناومان تاکو ئاگاداریی هەبێت.

لە 1982/2/15 دەستم کرد بە پەیوەندی و خۆ ئامادەکردن کە بە یەکجاری بارەگاکەمان چۆڵ بکەین،ئەوە بوو لە 1982/4/1 ناوزەنگمان بەجێهێشت بە ئاشکرا گواستمانەوە و رۆیشتین.

یەکەم جار چوینە گوندی "شینێ" دوو رۆژ میوانی کوێخا عەبدوڵڵا بوین.ئینجا چوینە ناو خاکی کوردستانی رزگار کراوی رۆژهەڵات،بوین بە دراوسێی بەرێوەبەرایەتی تەشکیلاتی سەردەشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.بەڕاستی پێشوازیێکی گەرمیان لێکردین.نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێر مامۆستا سەعید کوێستانی خزمەتگوزار، یارمەتیێکی زۆری داین لە گوندی"وردەو بنە و خەلیف" بوین.

یەکەم هەنگاوی سیاسی سەردانی حیزبی شیوعی عێراقمان کرد.

دووەم هەنگاو بە هۆی مامۆستا سەعید کوێستانی سەردانی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانمان کرد،ئەوکاتە بارەگاکەیان لە بێتوش بوو.

بازیان و نادرم ناردە راژان،نوسراوێکم ئاراستەی کاک مەسعود بارزانی کرد. جەماڵم نارد بۆ سلێمانی و کەلار،جەلالم نارد بۆ رانیە و کۆیە،مەریوانم نارد بۆ شاری قەڵادزێ.

تەنها بەندە و موختار ماینەوە و وەڵامی نامەکانم دەدایەوە و پێشوازیم لە میوانە ئازیزەکان دەکرد.لەسەعات 4ی ئێوارە 1982/5/2 بەندە و موختار دووبەدوو گفتوگۆمان دەکرد،لە پڕا ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی یەکێتی میلی کلاشنیکۆفیان هێنایەوە و کوژران تەسلیم بن.یەک سەردەستیان بەستین و چەکیان کردین.ئینجا دەستیان بە تاڵان کردن کرد.چواردەوری گوندەکەیان گرتبو.

ئێمەیان خستە ناو خۆیان بەرەو بارەگای مام جەلال بردیانین،لەناوەزەنگ،لە هەر بارەگایەکی پێشمەرگە سێ یان کۆکردبوەوە.هەر هەمویانم دەناسی و میوانداریم کردبوون.بە چاو ئیشارەیان بۆ کردم کە بارودۆخەکە خەتەرناکە،زۆرینەیان خۆشحاڵ نەبوون،تەنها "ئەلی شامار" خۆشحاڵ بوو لە گرتن و کوشتنم.

مختار پرسیاری کرد ئەوپێشمەرگانە دەڵێن چی؟ وتم : دەمان کوژن.مختار وتی: بەرامبەر بە من دەم کوژن،مام جەلال بڕیاری کوشتنی داوم.چوار مانگ پێش ئیستا لە بارەگای تۆ بووم،ئەوە بوو کاک نوەمەر عەبدوڵڵا هاتە لات سەردانی کردی،بە منت گوت دەستی ماچ کە،کاک نوەمەر وتی: هەتاکو لای کاک رەفیق بێت ناتکوژین. موختار وتی لەیەکەم رۆژەوە وتت من جەلال باش ئەناسم،با ئەوانەی ئامادەن پێوەندیمان پێوە بکەن،خەتای ئێمە بوو کە وا بە سانایی دەستگیرکراین،ئەگەر بەقسەی تۆمان کردبایە 50 پێشمەرگەت لابایە،دەستگیر نەدەکراین.کوشتار و زامدار و دیلیان دەبوو.

وتم : ئەگەر تۆشم رەوانەکردبایە،ئێستا خۆشحاڵ دەبووم، بەڵام گریانم بۆتۆ دێت.ئیستاکە دەکوژرێین.بەڵام رۆژێک دێت مێژوو راستیەکەی بڵاو دەکاتەوە و حەق حەقە و راستی ناشارێتەوە.هەردووکمان گەردنی یەکترمان ئازاد کرد،لێکیان جیا کردینەوە.

منیان برده سەرووی بارەگاکەی مام جەلال بۆ ئەوەی چاودێریم بکات،بە ئازاردان و ئەشکەنجە کردن.لەخانوێکی چۆڵ و بەتاڵیان دانام و چاویان بەستم و دەستەکانیشم بەسترابوومەوە. ئەوە بوو کتوپڕ مختاریان شەهید کرد بە بەهەشتی بەرین شاد بێت.رادیوکەیان لەبەر ژوورەکەم دایان نابوو بڵاویان کردەوە،کە بەندەش ئاگادار بم.

ئینجا لێکۆڵینەوە و ئازار و ئەشکەنجە دەستی پێکرد،روتوقوتیان کردمەوە،سوکایەتییەکی زۆریان پێکردم.لەماوەی 72 سەعات سێ جار منیان برد بۆ ئەوەی بمکوژن ، خۆشم ئاواتە خواز بووم کە بمکوژن و رزگارم بێت ،ئەوەندە سوکایەتیان پێدەکردم.

هەموو لەو پرسیارانەی ئاراستەیان دەکردم،یەکە یەکە اەڵامم دەدایەوە زۆر جار لە وەڵامدا دەم گوت،وەڵامی پرسیارەکانت لای مام جەلالە.

گەیشتمە ئەو باوەڕە کە مام جەلال پرسیارەکان ئامادە دەکات ،وە ئەو ئازار و ئەشکەنجەیە وسوکایەتییەی روو بە روو بە بێ شەرمان لە گەڵمدا دەکەن هەر هەمووی بە فەرمانی مام جەلال خۆیەتی،بڕیاری لەناوبردنی داوم،بە تاوانی جیابونەوەم نییە بەڵکو نهێنی زۆر گرنگی لای شەخسی من هەیە.

هەرچەندە ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکردم فەرمانەکانی مام جەلال 100% هەر هەمووی بەبەرابەر دوو سەد زیاتر ئەنجامیدەدا،بەڵام ئەویش گەیشتە ئەو باوەڕە کە دوژمنایەتییەکە لەجەلالە.

سێهەم رۆژی گرتنم،دەرگایان کردەوە ئەو میوانە ئازیزە و خۆشەویستانەم،دایکم و روباری کچم ورەمەزی کوڕم و قادری برام> هاتنە لام .لە جیاتی خۆشحال بم و دەست بە پێکەنین بکەم،دەستم کرد بەگریانێک کە ژێر
نەدەبوومەوە،هەردەگریام،چونکی رابردوی خۆم هاتەوە بیر کە ئەم دایکە کڵۆڵەم لە چەند زەمان و گرتوخانە و بەندیخانە سەردانی کردووم.

1/ لە زەمانی پادشایی ماوەی 7 رۆژ لە گرتوخانە بووم،دایکم هات بۆ لام. 2 / لە زەمانی حوکمی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی 1961 ماوەی 45 رۆژ گیرام لە " خلفِ السده" ئەنجا گوازرامەوە بۆ " رمادی – الانبار" دایکم هات بۆ لام. 3 – لەزەمانی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی 1962 پێشمەرگە بووم بە دیل گیرام،ئەوە بوو عەبدولسەلام عارف هاتە سەر حوکم،گرتوخانەی کفری و کەرکوک و خانەقین ،معتقل عەسکەری کەرکوک و هەولێر و موسل و ... دایکم هاتوە و لەهەموویان سەردانی کردووم.4 – لە 1976/9/14 بە فەرمانی سەدام حوسەین گیرام ،داوای لێکردم جەلال تاڵەبانی تیرور بکەم. 20 مانگی یەکەمی کە لە هەوالگری تایبەتی سەدام بووم،لەژێر لێکۆڵینەوە،روباری کچم تەلەفون بۆ سەدام حوسەین دەکات،دایکم دیداری کردم .سێ جار لە ژورێکی تایبەتی ئاسایشی گشتی لە بەغداد.

ئەوە بوو دادگای بەعس حوکمی لە سێدارەدانی دام و شەفیقی برام بە 15 ساڵ، سەدام وتبوی پیاوی ئازا نابێت لە سێدارە بدرێت.بە فەرمانی سەدام حوسەین حوکمەکە بو بە بیست ساڵ.شەفیقیش بو بە پێنج ساڵ و 15 رۆژ. ئینجا گواسترامەوە بۆ بەندیخانەی ئەبو غەریب.ئەوماوەیە بەدەوام دایکم سەردانی دەکردم.

5- دواجار ئەوەی رۆژێک لە رۆژان چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد،ئەگەر کورد دەسەڵات بەسەر کوردستاندا بگرێت بەتەواوەتی لەدەست کۆنەپەرەست و نەژادپەرەستی فارس و تورک وعەرەب رزگاری بکات.بەندە لە لایەن کوردەوە رەوانەی گرتوخانە دەکرێم،بەفەرمانی تەیبەتی مام جەلال دەستگیر دەکرێم و یەکێک لە هەڤاڵەکانم ترۆر دەکرێت.

ئەیا چۆن نەگریم ،دایکم باشم دەناسێ من ترسنۆك نیم و ناترسم و ناپارێمەوە.لەهەموو بەندیخانە و گرتوخانەکان هاتوە بۆ لام، بەردەوام پێدەکەنیم .ئەمە یەکەم جارە دایکم سردانم بکات و بگریێم.قسەم بۆ نەدەکرا ،ئەوەندە دڵ تەنگ بووم.بەتایبەتی بۆ هەڤاڵی قارەمان و نەترس شەهید مختار عەبدوڵڵەی حاجی غەریب.

لەژێر چاودێری پێشمەرگەکان زۆر بە توندی لەو گوندە بۆ ئەو گوند لە بارەگاکانی پێشمەرگە یان لە گرتوخانەکانی گشتی پێشمەرگە،چوار مانگ بەم جۆرە زۆر بە ناجۆری لەگەڵمدا جوڵانەوە.دواجار لەسەر گەڵو لە بارەگایەکی پێشمەرگە دەستبەسەر بووم.

لەمانگی 9ی ساڵی 1982 هەڤاڵانی بەڕێز کاک نوەمر عەبدوڵلە و کاک مستەفا چاوڕەش،دیداریان کردم و وتیان: ئێستا لەمروەوە ئازاد و سەربەستی بۆ هەر شوێنێک دەچیت،شۆڕش ئامادەیە بەرامبەر ئەو زۆرتر و زیانەی دراویت مقدارێک پارەت بداتێ و پارمەتیت بدات کە بچیتە دەرەوەی وڵات.

وتـ: ناچمە دەرێ،پارەشم ناوێت،ڕۆژێک دەبێت گرتنی خۆم بنوسم و بڵاوی بکەمەوە.

ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی گرتنم لە 8 خاڵدا لە خوارەوە ئاماژەم پێداوە. یەکەم : بەفەرمانی خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی لە بەرواری 1982/5/2 بەندە و هەڤاڵ مختار عەبدوڵلە حاجی عەزیف دەستگیر کراین،ئەوە بوو کتوپڕ مختاریان ترۆر کرد.

دووەم : لەسەرەتای گرتنم پروپاگەندەی بڵاو کردەوە کە هۆی گیرانی رەفیق ئەوەیە کە سیخوڕی بێگانەیە،پیاو کوژە،دزە،بەرتیل خۆرە،تێکدەرە،ئەمخشە و پیلانی دووبەرەکی بخاتە ناو یەکێتی.وە لەسەرەتاوە ئازار و ئەشکەنجە و سوکایەتیان پێدەکردم بە فەرمانەکانیان 100% ئەنجامیان دەدا.

سێهەم: فەرمانی دا ئازاد کرام،ئەمخشە و پیلانی ئەوە بوو ڕووبکەمە هەندەران. چوارەم: خۆڕاگرم،لەگوندی سەرگەڵو مامەوە،جەلال هاتە سەرگەڵو داوایان لێکردم پێشوازی لێبکەم.وتم: بۆچی دەستی ماچ کەم و داوای لێبوردنی لێبکەم.ڕوونمکردەوە بۆ زۆرینەی هاوڵاتیان کە بەندە بە ناحەق گیرابووم.پێنجەم : هاتمەوە ریزی یەکێتی،بوم بە نوێنەری سەرکردایەتی،لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بارزانی و کۆماری ئیسلامی ئێران گفتوگۆم کرد،هەروەها لەگەڵ سەرۆک جاشەکان.

شەشەم : داوام لێکرد داوای لێبوردن لە بنەماڵیی عەبدوڵلەی حاجی غەریب بکات بە بۆنەی شەهید کردنی مختار،ئەوە بوو هەڤاڵی نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ کاک مستەفا چاوڕەووش ئەو ئەرکەی بە جێ هێنا و لە رادیو بڵاویان کرایەوە. حەوتەم : هەموو ئەو ئازار و ئەشکەنجە و سوکایەتیەی پێیان کردم ،هەر هەمووم لە بیر و فکری خۆم بردەوە،چونکی هەر هەموی بە فەرمانی جەلال بوو.

هەشتەم : دوای ئازاد بوونم بە چەند مانگێک بەدور و درێژی ئەم داستانەیان بۆ گێڕامەوە،بە بریاری هەمومان نەهێڵین بە هیچ جۆرێک بڵاو بێتەوە بە تایبەتی لەناو خانەوادەی خۆمان،چونکی هەر هەمومان دۆستی دێرینی یەکێتین و زۆرینەیان ئەندامی یەکێتین بە تایبەتی لاوەکانمان.

کورتەیەک دەربارەی ئەو داستانە شاراوەیە کە لە 1982/5/6 ڕوویدا وا دەقی خۆی بە کورتی ئاماژە پێدەدەم.سەرکردایەتی یەکێتی دوو جۆرە را و بریار و بۆچونیان دەبێت دەربارەی تیرۆر کردنی من.

یەکەم: مام جەلال دەڵێت کە دەستگیرمان کرد یەک سەر تیرەبارانی بکەین. دووەم : دەڵێن ناسراوە،ماوەیەکە لێرەیە جێی خۆی کردوەتەوە،ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری دەکەین،ناچاری دەکەین دان بەو تاوانانە بنێت،ئەوکاتە تیرەبارانی دەکەین. مام جەلال دەڵێت ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەی لە مخابراتی عێراقی کردیان دانی بە تاوانەکانی نەنا ،هەرگیز لێرەش دان نانێت.

لەکۆتایی بریار لەسەر دووەم دەدەن،کە لە ڕێگای ئازار و ئەشکەنجە لەناوم بەرن.! مەریوان ی خوارزام دەستگیر ناکرێت،مامۆستا سەعید کوێستانی رزگاری دەکات.دوای 18 سەعات دەگاتە ماڵی کەماڵی برام لە سلێمانی. یەک سەر جەماڵی برام دەڵێت مەریوان کاکە رفێقمیان گرت؟ ئەڵێت بەڵێ.

بەکری مام رەزای پورزام دەڵێت فریای کەون هەتاکو مام جەلال تیرۆری نەکردوە.کەماڵی برامنوسراوەیەک ئاراستەی مام جەلال دەکات،ناوەرۆکی نامەکە کورانی حاجی مامە، دۆستی دێرینی یەکێتی هەتاکو ئەم سەعاتە،باش بزانە رەفیق برامان بکوژرێت ڕێگای دوژمنایەتی دەگرینە بەر و یەکسەر شێخ جنگی برات تیرۆر دەکەین، ،ڕێکخراوی ناوخۆی یەکێتی شاری سلێمانی هەر هەمووی دەزانم،200 کەستان لێ بەگرتن دەدەم و بە لەسێدارەدانیان دەدەم.کورانی حاجی مامە "کەماڵ،حەسەن،حاجی،جەماڵ و قادر، نامەکە ئیمزا دەکەن لە 1982/5/6.

لەناو خۆیاندا (کەماڵ وحەسەن و حاجی و جەماڵ و قادر)گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەنکە کێ بچێتە لای و نوسراوەکەی بداتێ.

حەسەن و حاجی و جەماڵ دەڵێن ئێمە دەچین،بەڵام قادر لێرە بێت،چونکی مامجەلال قادری خۆش ناوێت،با کێشەمان بۆ دروست نەبێت.کەماڵ دەڵێت دایکم و قادر دەچنە لای،قادر با نوسراوەکە لە ڕێگای مولازم عومەر عەبدوڵشوە بگات بە دەستی مام جەلال باشترە،بۆ ئەوەی ناچار بێت تەماشای ناوەڕۆکەکەی بکات با بزانێ چیمان بۆ نوسیوە.کەماڵ دەڵێت قادر هەروەکو مام جەلالت خۆش ناوێت لە یەکەم ڕۆژ کە دیدارتان کرد زۆر باش قادر هەڵوێستی مام جەلالی هەڵسەنگاند بەرامبەر کاک ڕەفیقم ، لەو ڕۆژەوە قادر ڕەخنە و توانجی لێدەگرێت بە ئاشکرا و ڕاشکاوی لە مام جەلال.

حەتمەن مام جەلال ئەوەی بیستوە و ڕای بەرامبەری ڕەشبینە و تۆی خۆش ناوێت.جا ناردنی تۆ ئیشارەیە،هەڕەشەیە لە مام جەلال دەکەین. کەماڵ و قادر دوو بە دوو وتووێژ دەکەن.کەماڵ دەڵێت قادر مەترسە ناتوانێت لەوە زیاتر بکات بەرامبەرمان کە ڕەخنە و هێرش هێنایە سەر کاکم یەکە یەکە وەڵامی بدەوە.

ڕووبار و ڕەوەز دەپاڕێنەوە لە مامە،کەماڵ و قادر کە بێن یەکەم چاویان بە مام جەلال بکەوێت چونکی ئێمە ی زۆر خۆش دەوێت.ئینجا چاومان بە باوکمان بکەوێت.کەماڵ وەڵامیان دەداتەوە : ڕاست دەکەن ئێوەی خۆش دەوێت،من ئەو شەهادەتە ئەدەم،ئەوکاتە ئیشوکاری بە باوکتان بوو پێویستی پێی بوو.بەڵام ئێستا پێویستی بە باوکت نییە چونکی لە ناوشاخە ئەوکاتە کە باوکتان لەناو جەرگەی حکومەت بوو باوکتان نیشتمان پەروەر و شۆڕشگێڕ بوو،ئێستا بە قسەی شەخسی مام جەلال تاوانبارە .. وە جێی باوەڕ نییە،دەسەڵاتی هەبایە باوکتانی دەکوشت،قادر لەگەڵ خۆتدا بیانبە با چاویان بە باوکیان بکەوێت.

دایکم و قادر و ڕووبار و ڕەوەز ئێوارەکەی دەگەنە ناوەزەنگ ئاگاداری مام جەلال دەکەن،دوای 24 سەعات ئەنجا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکات. یەکسەر ڕودەکات قادر بە دەنگێکی بەرز دەشبرێنێت :قادر تۆ بۆ هاتیت.قادر زۆر عاقڵ و ئازایانە یەکە یەکە وەڵامی تاوانەکانی کە ئاراستەی کاکە ڕەفیقی دەکات ،دەیداتەوە.مام جەلال ناچار دەکات کۆتایی بە قسەکانی بێنێت.

ئینجا لەگەڵ دایکم گفتوگۆ دەکات.دایکم دەڵێت،کەم نمەکی منت کردوە جەلال! ؟ چۆن دڵت هات ڕەفیق بگریت،ڕەفیق شێت و تۆش هەڵەی.

مام جەلال دەڵێت لەبەر خاتری تۆ ئەوە عەفوم کرد نای کوژم.

شک و گومانم زۆرتر پەیدا کرد بەرامبەر شەخسی جەلال ،دوای ئەو گفتوگۆیەی لە گەڵ سەدام کردی و سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.بۆ نمونە : 1- پێش ئەوەی گفتوگۆ دەست پێ بکات لە نێوان جەلا و سەدام،ئاگادارم کردبوون،سەرەتا لە هەموو چین و توێژەکان سەردانی دەکەن،بەڵام کە شەر دەستی پێکردەوە هیچ یەکێک لەخەڵکەکان سەردانی ناکات.2- بەڕێز کاک نەوشیروان وتی کاکە سەردانی مام جەلال بکە،چونکی بە تەنهایە ،کەس هاتوچۆی ناکات و زۆر بێتاقەتە.ئەوە بوو سەردانم کرد لە ناوێژە.3- لە ساڵی 1984 لەگوندی مەرگە لە بارەگای تایبەتی خۆی گفتوگۆمان دەکرد لەگەڵ نەوشیروان.بەندە و هەڤاڵ ئازادی عوسمان ئەفەندی.پرسیارێکم ئاراستە کاک نەوشیروان مستەفا کرد،وتم: شک و گومانت نییە لە شەخسی مام جەلال،ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ناوت بەرێت؟

زۆرینەی بنەماڵەکان لە ریزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان خەباتیان دەکرد،بەتایبەتی بەندە دوای گرتنم سەد ئەوەندەی جاران زیاتر پەیوەندی و فیداکاریم بە هێزتر بوو بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان.فەرمان و بڕیارەکانی سەرکردایەتیەکەی ئەنجامم دەدا.بەڵام بەرامبەر مامجەلال شک و گومانم بەرەو زیادی دەڕۆیشت لە هەڵوێست و نەخشە و پیلانەکانی کە ڕاستگۆ نییە.شەهادەتی درۆم بۆ ئەدا و ڕاستیەکانم دەگوت. بۆ نمونە : 1- لە ساڵی 1985 لە ڕاژان لەیەکەم کۆبونەوەم کە ئەوکاتە نوێنەری شەخسی مام جەلال لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بووم،کە دەستمان کرد بە لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ،وتم کاک مەسعود، مامۆستا عەلی عەبدوڵڵە باوەڕتان بە قسەکانی من هەبێت،بەڵام من کەفیلی مام جەلال ناکەم ،کێ دەڵێت ڕاست دەکات.

2- کاک مەسعود لە کاتێکدا کە پرسیاری لێکردم ،مامۆستا حەلی عەبدوڵڵا ئامادە بوو وتی کاک ڕەفیق،نەوشیروان ناناسم ڕای شەخسی خۆت چۆنە بۆم هەڵسەنگێنە.وەڵامی پرسیارەکەم ئدەوە.

وتم : مرۆڤێکی راستگۆیە،شەفافە،کین و قینی نییە،بەدەگمەن مرۆڤی وا هەڵدەکەوێت،شایانی باسکردنە لە هەموو رووێکەوە.ئامادەگی تێدایە گیانی خۆی بەخت بکات لەپێناوکورد و کوردستان،ئازا و نەترسە.3 - جەنابی شێخ محەمەدی شێخ ئەحمەد بارزانی لە هەمان مانگ و ساڵدا لە تەهران- کەرەج دیدارم کرد.ئەم پرسیارانەی ئاراستە کردم کە لە خاڵی یەک و دوو ئاماژەم پێداوە،وەڵامم دایەوە ،بەرێز ئێچیرڤان ئامادە بوو.بەڵام ئەوکاتە کوردی نەدەزانی! زمانی نەبوو قسە بکات.

سێهەم: ئەم مرۆڤە مێژوێکی پاک و پرشانازی هەیە بۆچی وای لەخۆ کرد ؟

وەڵام: لە ساڵی 2002 لە لەندەن لە کۆبونەوەیەکی ئۆپۆزسیونی عێراقدا، بەرێز زاڵمای خەلیلزاد، ئاگاداری جەلال تاڵەبانی کرد کە ئەمریکا تۆی دیاری کردوە بۆ ئایندە ببیتە سەرۆک کۆماری عێراق.

ئینجا لە کۆبونەوەیەکی دوو قۆڵی داخراو بەرێز زاڵمای خەلیلزاد بەراشکاوی نەخشە و پیلان و پرۆگرام و ستراتیژیەتی ئەمریکا و ئینگلیزی بۆ شی دەکاتەوە بابەت بە بابەت،یەکە یەکە دەیخاتە بەردەستی.

لەپێناو سەروەت و سامان و پلە و بەرژەوەندی تایبەتی شەخسی خودی خۆی یەکسەر هەر هەمووی بگەن دەکات و تەسلیم بە ئیرادەیان بوو.بڕیار و فەرمانەکانیانی بە گشتی لە سەرەتای روخانی سەدام حوسەین، وردە وردە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی.ئەگەر ئەو تاوان و خەیانەتانەی کە دژی گەلی کورد ئەنجامیدا لەسەرتاسەری کوردستانی گەورە بە هەزارەها نوسەر و مامۆستای دانا کۆ ناکرێنەوە و تۆمار ناکرێت.

چەند خەیانەتێکی کە زۆر زەقە ئاماژەی پێدەدەم: 1 - هەرێمی کوردستانی تەسلیم بەبنەماڵەی شێخانی بارزانی کرد. 2- یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کردە سێ باڵ. جاران یەک دزو و سیخور هەبوو،فەرەیدون عەبدولقادە، و سەعدی پیرە و بەهرۆز گەلالی فایلیان هەبو.ئیستا ئەگەر لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە دەست بە کار بکات لە ناو ئەندامانی یەکێتی بە رێبەرایەتی بەرێزان حەمە تۆفێق رەحیم و نەوشیروان و عومەر سەید عەلی پرسیار و لێکۆڵینەوە لە بەین ئەوانەی ئەو سێ تاوانەی تێدا نەبێت (دز،سیخور،ناموس)؟

3 – گەندڵی ،ژێرخانی کوردستانیان تاڵان کرد.

4- شفامی کوردی خەفەکرد لە سەرانسەری کوردستان، ئەوەی شای ئێران و ئاخوندەکان،مستەفا کەماڵ و نەجمەدین ئوروغان،عەبولسەلام عارف و سەدام حوسەین،حافز ئەسەد و بەشار ئەسەد،هەر هەموویان نەیانتوانی ئەنجامی بدەن دژی گەلی کورد لە سەران سەری کوردستانی گەورە ساڵهای ساڵە،لە هەوڵانە بۆ ئەنجامدانی بە تایبەتی دژی پارتی کرێکارانی کوردستان و حزبی دیموکراتی کوردستانئێران،کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان) جەلال و مەسعود) ئەوەبوو ئەنجامیاندا.

5- نابێت هێزی چەکداری لەسەرانسەری کوردستانی گەورە بمێنێت.

6- جگرافیای هەرێمی کوردستانی باشور بریتیە لە دهۆک و هەولێر و سلێمانی.

7- ناوچە دابڕاوەکان کۆتایی پێ هاتوە لە 13/12 کانونی دووەمی ساڵی 1970 مام جەلال بەشدارە و ئاگادار کراوەتەوە.

پرسیاری چوارەم: جیاوازی لەنێوان کەسایەتی مام جەلال و بارزانی چییە،بە پێی ئەوەی هەردووکیان زۆر باش دەناسی و کارت لە گەڵدا کردوە؟

جەلال؛ نهێنی نییە،دۆست و دوژمنی نییە وبە پێی رۆژە.کە خەڵکی بۆ تیرۆر کەی یان سیخوری بۆ بکەی ، کارەکەت ئەنجامدا ئینجا یان پشتت لێدەکات یان بە کوشتنت دەدات.

مەسعود: نهێنی ئاشکرا ناکات،حسابی تایبەتی هەیە بۆ دۆستی و دوژمن،کە فەرمانەکانجێبەجێ بکەیت وەکو تیرور کردن و سیخوری،پشتگیر و پاریمەتیت دەدا هەتا هەتایە.

بۆ نمونە 1- کەماڵ کەرکوکی بەفەرمانی ئەو ئەلی عەسکەری تیرور کرا،ئیمڕۆ پلە و ڕێزی تایبەتی هەیە. 2- جوئنگی جەلال کوردستانی باشور و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تەسلیم بە بنەماڵەی بارزانی کرد،ئیمڕۆ جەلال ئەوەندە لاوازە بەرەو نەمان دەڕوات.بەڵام مەسعود لەهەموو بوارێکەوە یارمەتی و پشتگیری دەکات.

بەڕێزان جەلال و مەسعود هیچ جیاوزێکیان لە نێواندا نییە،100% نەفس نزم و بێگانە پەرست ،دیکتاتۆر،دژی ئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤ،مرۆڤ کوژ،درۆزن،تێکدەر ،ژێرخانی کوردستانیان تاڵان کرد.

حکومەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا،ئەوەی ساڵەهایە هەموو توانایەکی خۆیان بەکار هێنا بۆ لەناوبردنی کورد و کوردستانی گەورە،بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

لەدوای ڕوخانی دسەدام حوسەین ئەوەبوو مەسعود و جەلال لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و ڕەزامەندی عەرەب و فارس و تورک،نەخشە و پیلانەکانی میتی تورکی و ئیتلاعاتی ئێران و موسادی ئیسرائیلی وCIA و هەواڵگری ئینگلیزی و KGB ، بەهەمو توانایەکیانەوە و هەموو ڕێگایێکیان گرتوەتە بەر بۆ لەناو بردنی کوردستانی گەورە،هێزی چەکداری ئەمێنێت بە تایبەتی گریلای پارتی کرێکارانی کوردستان و ڕێکخراوەکانی کوردستان "پارتی کرێکارانی کوردستان،حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵە"هەرسیان پێبهێنێت.

مەسعود و جەلال نیشانەی خەیانەتکارانەیان بە سینگیانەوە هەڵواسی،شەرەفیان بە داگیرکەرانی کوردستانی گەورە فرۆشتوە.

پرسیاری پێنجەم:کەی و چۆن مام جەلال پەیوەندی بە ڕژێمی ئێرانەوە کرد؟ جۆری ئەم پەیوەندیە؟ئایا لە خزمەت کێشەی کورد ە هاوڵاتیان بوو؟

وەڵام: بە پێی زانیاری و ئاگاداری خۆم چیم دیبێت،کە لە لەندەن بوو لە بەرواری 1981/1/9 بە هۆی هەڤاڵی تێکۆشەر و بەڕێز د.لەتیف ڕشید لەگەڵ مام جەلال گفتوگۆم کرد .ئەو کاتە لە لیبیا بوو.دوای چەند مانگێک ئینجا باڵوێزخانەی ئێرانی لە لیبیا ڤیزایان دایە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان.ئەوەبوو لە لەندەن یەکترمان دیی پێش گەڕانەوەی،سەرۆک کۆماری لیبیا دۆستی دێرینی گەلی کورد کاک موعەممەر قەزافی چەکێکی قورس و سوک و زەخیرەیەکی زۆری پێشکەش بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان کرد بوو.ئەوە بوو کۆماری ئیسلامی ئێران دەستی بەسەر هەموویداگرت.

لەساڵی 1982 پێشمەرگەکانی یەکێتی شان بە شانی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران جەنگیان کرد دژی سوپای پاسداران،چەندها پاسدار کەوتنە دەست پێشمەرگەکانی یەکێتی.

لەساڵی 1985 بە فەرمانی ڕێزداران عەلی عەبدوڵڵا و ئیدریس و مەسعود لە گەڵ دوژمنی کورد و کوردستان حاجی مستەفەوی بەرێوە بەری ئازەربایجانی غەربی ،کۆبومەوە لە شاری ورمێ،دەربارەی چۆنیەتی باوەڕیان پێبهێنم کە پارتی و یەکێتی ڕێک بکەون لە بەرژەوەندی گەلی کوردە و بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران سودێکی گەورەی دەبێت.کە گەڕامەوە بۆ لای مام جەلا بە دورودرێژی بۆم باس کرد.

مام جەلالم ئاگادار کرد؛ حاجی مستەفەوی وتی: سەفەری تاران بکە سەردانی ئاغای ڕەفسەنجانی بکە،دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت و وتووێژت لەگەڵدا بکات،دەربارەی ئەو بارودۆخەی کە هاتوەتە ئاراوە لە نێوان یەکێتی و ئێمە(ئێران). منیش وەڵامم دایەوە ناتوانم ئەو سەفەرە بکەم و چاوپێکەتنە لەگەڵ ئاغای ڕەفسەنجانی ئەنجام بدەم،تاکو پرسیاری مام جەلال نەکەم و فەرمانم بداتێ ئینجا ئەوکارە ئەنجام بدەم.

یەک سەر مام جەلال وتی چۆن شتی وەها گرینگ لەدەستی خۆت دەدەی.ئینجا وتی تۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئێران دووکاری گرینگ هەیە،گرینگ و گرینگتر،یەکەم سەردانی جەنابی حاجی مستەفەوی دەکەی و وتووێژی لەگەڵدا دەکەی دەربارەی نزیکبونەوەی یەکێتی و کۆماری ئیسلامی، ئینجا سەردانی کوڕانی مەلا مستەفا بکە.

کە گەڕامەوە بۆ ئێران،یەکسەر لە ڕاژان سەردانی بارەگای سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانم کرد.

لەگەڵ مامۆستا ئەلی عەبدوڵڵا سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان کۆبوومەوە،ئاگادارم کرد کە بەراستم نەزانی بڕیارەکەی مام جەلال ئەنجام بدەم.

مامۆستای بەڕێز ئەلی عەبدوڵڵا هەڵوێستەکەی بەندەی پەسەند کرد،بەڵام تکایە با ئەمە لەنێوان خۆم و خۆتدا بێت.

ئینجا کۆبوومەوە لەگەڵ حاجی مستەفەوی بەڕێوەبەری ئازەربایجانی غەربی،لێرەوە پەیوەندی لە نێوان شەخسی جەلال تاڵەبانی و کۆماری ئیسلامی وردە وردە بەرەوپێشەوە دەڕۆیشت.

بەڵام بە هۆی ئەوەی ڕێگەگرێکی ئەوەندە بەتوانا و گەورە هەبوو بەرامبەری راوەستا بوو کە توانای ئەوەی نەبوو کە بەراشکاوی و بەکەیفی خۆی نزیک بێتەوە لە دەزگای سیخوڕی ئیتلاعات و پاسداران و قەرارگای رەمەزان.مەترسیەکەیشی تەنها لە شەخسی دوکتور قاسملو بوو.

ئەوە بوو لەساڵی 1989 لە وڵاتی نەمسا – ئوتریش" تیروریستەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران " محمد جعفر سحرارودی و جوادی و بزرگان" لە ماڵی فازڵ رەسوڵ دوکتور قاسملویان شەهید کرد و لە ساڵی 1992 دوکتور شەرەفکەندی شەهید کرا.

ئەو روداوە دڵتەزێنە زیانێکی گەورەی لەگەڵی کورد دا بە گشتی و بۆشاییەکی گەورەی دروست کرد لە سەرانسەری کوردستانی گەورە بە تایبەتی لە کوردستانی رۆژهەڵات و زۆر ئاستەمە کە لەم کاتەدا کە دەسەڵات لەدەست جەلال و مەسعود دایە جێگەی پڕبێتەوە.سودمەندی سەرەکی لەشەهیدکردنی قاسملو ،کۆماری ئیسلامی ئێران و بنەماڵەی شێخانی بارزانی و بەتایبەتی شەخسی جەلال تاڵەبانی بوون.

پرسیارێک دێتە پێشی،حەتمەن دوکتور قاسملو لەدەفتەری رۆژانەی خودی خۆیدا ئاماژەی بەوە داوە کە ئەوانە کێن کە ئەو سیناریویان ڕێکخست، شک و گومان هەیە کە مام جەلال دەستێکی باڵای هەبووە.ئەو تیروریستە " جعفری" کرا بە فەرماندەی قەرارگای رەمەزان و بەرپرسی پەیوەندی گرتنی لەگەڵ حیزبە سیاسیە کوردستانییەکانی باشور.دوای شەهید بونی دوکتور قاسملو.

جۆری ئەم پەیوەندیەی مام جەلال لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران یەکسەر و راستەوخۆ بە ئیتلاعات و پاسداران و قەرارگای رەمەزان بەستراو ،نەخشە و پیلانەکانیانی دەقی خۆی لەلایەن مام جەلال ئەنجامیدەدا.پرۆسەی دەست بەسەرداگرتنیان بەسەرکوردستانی رۆژهەڵات بەتایبەتی لەناو حیزبە سیاسیەکان ،توانیان ناکۆکی و دووبەرەکی و لەتکردن بخەنە ناو ئەو دوو حیزبە سەرەکیەی رۆژهەلات و دروستکردنی چەن باڵ.

1- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران: هاوڕێی بەڕێز و تێکۆشەر کاک مستەفا هیجری ،سکرتێری گشتی.
2- حیزبی دیموکراتی کوردستان: هاوڕێی بەڕێز و تێکۆشەر ،مامۆستا عەبدوڵڵە حەسەنزادە ،سکرتێری گشتی.
3- کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران: هاوڕێی بەڕێز و تێکۆشەر کاک عەبدوڵڵە موهتەدی،سکرتێری گشتی.
4- کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان: هاوڕێی بەڕێز و تێکۆشەر عومەر ئێلخانیزادە،سکرتێری گشتی.

سەرنج راکێشان بۆ چەند ئاگاداری و زانیارییەک:

تاوان و خەیانەتەکانی بنەماڵەی شێخانی بارزانی کە لە ساڵی 1959وە تاکو ئێستا ساڵی 2009 لە خزمەتی کۆنەپەرست و شۆڤینی و نەژادپەرستەکانی فارس دان لە دژی کوردستانی رۆژهەڵات خەبات دەکەن و هەروەها تاوان و خەیانەتەکانی شەخسی جەلال تاڵەبانی کە لە ساڵی 1992 وە تا کو ئێستای ساڵی 2009 لە خزمەتی کۆنەپەرست و شۆڤینی و نەژادپەرستەکانی فارس دان لە دژی کوردستانی رۆژهەڵات خەبات دەکەن.بۆ تواندنەوەی دوانزە ملیون هاوڵاتی کورد لەناو فارسدا.

بەڵام دوای رووخانی رژێمی سەدام حوسەین کە کوردستانی باشور بە تەواوەتی کەوتە ژێر بڕیار و فەرمانی بەڕێزان تاڵەبانی و مەسعود بارزانی،ئەوە بوو ئەو خزمەتگوزاریە و فیداکاریەی کە چاوەڕوانکراو بوو ئەو ڕێزدارانە پێشکەش بە کۆماری ئیسلامی ئێرانیان کرد.بەتایبەتی شەخسی جەلال تاڵەبانی.بەرامبەر ئەو فیداکاریە کە ئەو بەڕێزانە پێشکەشی بە

نەتەوەی فارسیان کرد،خامنەیی و رەفسەنجانی بڕیار و فەرمانیاندا تەرمەکەی جەلال و مەسعود لە بەهەشتی زەهرا بنێژرێت.بەڵام مەرجە تەرمەکانیان لە عێراقەوە بە فرۆکە بگوزرێتەوە بۆ تاران.چونکی لەرێی پیادە رێی بە ناو کوردستانی رۆژهەڵات بە رێگا بکەوێت ،هاولاتی کورد بە گشتی سوکایەتی بە تەرمەکانیان دەکەن.چونکی لە کۆی ژمارەی 12 ملیون کورد ،تەنها 1000 هاولاتی پێشوازی لە تەرمەکانیان دەکەن.

پرسیاری شەشەم : بە هەمان شێوە بە رژێمی تورکیا چۆن و کەی دەستی پێکرد و لە چ رادەیەکدایە؟

وەڵام: لە ساڵی 1976 لە بەیروت لە کۆبونەوەیەکی دوو قۆڵی پرسیارم لە مام جەلال کرد ئایا ئایندەی نزیک هەڵویستی حکومەتی تورکیا چۆن دەبینێت لە گەڵ یەکێتی و بنەماڵەی بارزانی؟

وتی: پەیوەندی راستەوخۆم هەیە لەگەڵ شەخسی ئەجاوید،و دوانامەی کە ئاراستەی کردووم،کە شۆرشی چەکداریتان دەستی پێکرد یەک سەر پەیوەندیمان بە بنەماڵەی شێخانی بارزانی دەبەستین.پەیوەندی حکومەتی تورکیا بە ئێوەوە دەبێت.لە سەرەتا کە یەکێتی شەری پارتیزانی دەستپێکرد تاکو مانگی 8ی ساڵی 2008 ئەگەر بە وردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەیت،بەفەرمانی جەلال و مەسعود نزیکەی 60 هەزار زیاتر هاولاتی کوژراون.

مام جەلال لە جەولەیەکی دیبلوماسی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و ئوروپا و تورکیا لە 2002/9/7 گەیشتە زاخۆ.

مەسعود بارزانی لە هەمان رۆژ لە نزیک شەقلاوە پێشوازی لێکرد.

بەڵام بەلای منەوە ئەمە شتێکە هەرگیز چاوەروانم نەکردوە، کەوتمە لێکۆڵینەوە: چی پاڵی بە کاک مەسعود بارزانی نا کە بۆخۆی چو بۆ شەقڵاوە لە بەردەم پێشوایکەراندا وتی ئەمە رۆژێکی مێژووییە و مام جەلال بەم سەردانەی زۆر خۆشحالی کردین.

کاک مەسعود لە بارودۆخێکی سیاسی شڕدا بوو،سەردانەکەی مام جەلالیش بۆ ئەمریکا ترسێکی گەورەی خستە دڵیەوە کە بەرەکەی لە ژێر پێ دەربێنێت و مام جەلال و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەست بەسەر هەموو کوردستاندا بگرن. لەسەر ئەم بنەمایە ئەمریکا بریاریدا بوو ماسەڵەی لەگەڵ گەلی کوردستاندا لە رێی مام جەلالەوە بێت لە پێناو روخانی سەدام حوسەین.

کە واتە هۆی سەرەکی کە وای کرد ئەمریکا سیاسەتی خۆی بەرامبەر بنەماڵەی بارزانی بگۆرێت ئەوە بوو کە بەدرێژایی ساڵانی رابردو مام جەلال کە دوژمنی خوێن خۆریان بووە و ئەوانیش دوو بەرامبەر هەوڵدەدات لەدووری مێژی دیاریکردنی چارەنوسی گەلی کوردستان جێیان بکاتەوە.ئەمە هۆی سەرەکی بوو کە وای لە بنەماڵیی بارزانی کرد بڕوای تەواو بە مام جەلال بکەن لە بارەی هەوڵدانی بۆ چاککردنی بنەماڵەکەیان و رایانکێشێتەوە ناو کەناڵەکانی سیاسەتی پاشە رۆژی عێراقەوە.

تورکیا: سەبارەت بە هەڵوێستی حکومەتی تورکیا دەربارەی بنەماڵەی بارزانی،دوای ئەو هەموو یارمەتییانەی کە جەنراڵەکانی تورکیا پێشکەش بە بنەماڵەی بارزانییان کرد،بۆ بەرنگار بوونەوەی هێرشی پارتی کرێکارانی کوردستان " پ.ک.ک " کە ئەگەر هاوکاریی سوپای تورک بە تانک و زرێپۆش و هێزی ئاسمانییەوە نەبوایە ئەوە پارتی کرێکارانی کوردستان زۆربەی ناوچەکانی دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی کونترۆڵ دەکرد.

ئینجا جارێکی تریش هێزی سەربازی تورکیا پشتگیری بنەماڵەی کرد لە شەری دژی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە ئەگەر دەستێوەردانی تورکیا نەبوایە ئەوە هێزەکانی بنەماڵەی بارزانی بە دەسی هێزەکانی یەکێتی شپرزە دەبوون.

تورکەکان لە ئەمریکایەکان زیاتر رق بەرامبەر بنەماڵەی بارزانی خۆشبکەن و دەستیان پێکرد.بە تاوتوێکردنی چۆنیەتی کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتیان و دورخستنەوەیان بە یەکجاری لە گۆرەپانی سیاسی.

مام جەلال چوو بۆ ئەمریکا بۆ دیدەنی سەرکردە تورکەکان و بە پێچەوانەی ئەوەی لەسەری رێککەوتبوون پاساوی بۆ هەڵوێستی دوژمنکارانەی بنەماڵەی بارزانی لەدژی تورک هێنایەوە.

مامجەلال پەیمانی بە تورکەکان دابوو گۆڕانی ڕیشەیی بنەماڵەی بارزانی و کەفالەتی ئەوەشی کردن کە پشتگیری سیاسەتی ئەمریکا بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی عێراقی و ڕێککەوتنی مەبدەئییان لەگەڵ هێزە کوردستانییەکانی عێراق کە ئاشتی بۆ ناوچەکە بگەڕێننەوە زیان بە تورکیا نەگات.

ئینجا دەگەڕێمەوە بۆ باسەکەمان دەربارەی ئەوەی کە پاڵییان بە مەسعود بارزانییەوە نا دوور لە بارەگاکەی خۆی بچێت بۆ شەقڵاوە بە پیرەوەپیری مام جەلال،دوژمنی خوێنە خۆری،بەگەرمییەکی چاوەڕوان نەکراو دیداری پێشوازیکرد کەوا مەسعود بارزانی دەڵێت: برای بەڕێزمان مام جەلال بەو سەردانەی دڵخۆشی کردین.

سەرنج بۆ چەند ئاگادارییەک: مام جەلال پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەست لەگەڵ میتی تورکی لە مانگی 9ی ساڵی 2002ی وە هەتاکو ئێستاکەی ساڵی 2009دا.

تاوان و خەیانەتەکانی جەلال تاڵەبانی کە لە خزمەتی کۆنەپەرست و شۆڤێنی و نەژاد پەرستەکانی تورانیەکان کە دژی کوردستانی باکور ئەنجامی دا،هەر وەها تاوان و خەیانەتەکانی بنەماڵەت شێخانی بارزانی لە ساڵی 1960 تاکو ئێستای ساڵی 2009 لە خزمەتی کۆنەپەرست و شۆڤێنی و نژادپەرستەکانی تورانیەکان دژی کوردستانی باکور ئەنجامیانداوە جەلال و مەسعود بۆ تواندنەوەی 22 ملیون هاوڵاتی کورد لەناو تورانیەکاندا.

بەڵام دوای ڕوخانیرژێمی سەدام حوسەین کە کوردستانی باشور بە تەواوەتی کەوتە دەست بڕیار و فەرمانی بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی ،ئەوە بوو ئەو خزمەتگوزارییە و فیداکارییەی کە چاوەڕوانکراو بوو ئەو ڕێزدارانە پێشکەش بە حکومەتی تورکیایان کرد بە تایبەتی شەخسی جەلال تاڵەبانی.

بەرامبەر ئەو فیداکارییەی کە ئەو بەڕێزانە پێشکەش بە نەتەوەی تورکیان کرد،زۆرینەی پەرلەمانتارانی تورک بڕیار دەدەن تەرمەکانی مەسعود و جەلال لەتەک مستەفا کەمال بنێژرێت یان لە تەک گۆڕەکەی ئەجاوید بنێژرێت .

بەڵام مەرجە تەرمەکەیان لە عێراقەوە بە فڕۆکە بگوازرێتەوە بۆ ئەنقەرە،چونکی لە ڕێی پیادە ڕێیەوە بە ناو کوردستانی باکور،هاوڵاتی کورد سوکایەتی بە تەرمەکانیان دەکەن.چونکی لە کۆی بیست و نۆ ملیون هاوڵاتی تورک،تەنها دوو هەزار هاوڵاتی کورد پێشوازی لە تەرمەکانیان دەکەن.

پرسیاری حەوتەم : جیاوازی لە نێوان کەسایەتی مام جەلال و مەسعود بارزانی و سەدام حوسەین چییە؟ بە پێی ئەوەی هەرسێکیان باش دەناسی و کارت لە گەڵیاندا کردوە.

وەڵام: ئەگەر مەسعود و جەلال بەراوەردیان بکەیت لەگەڵ شەخسی سەدام حوسەین، لەو بابەتەی خوارەوە کە ئاماژەم پێداوە دەربارەی ماهیەتی سەدام حوسەین و مەسعود و جەلال جیاوازی لەنێوانان دا نییە.لێک دەکەن بە پێی شارەزایی و ئاگاداری خۆم لە خاڵی یەکەم واللە ثم واللە 100% سەدام حوسەینی دیکتاتۆر،زاڵم،مرۆڤ کوژ،دژی ئازادی و دیموکراتی،مافی مرۆڤی پێشێل دەکرد.دیالۆگ ئازاد و سەربەست نەبوو.شەقامی عێراقی خەفە کردبوو.گرتوخانە و بەندیخانە و دوورخستنەوە و دەربەدەری بەردەوام بوو.هەر هەمووی بە ئاگاداری خودی خۆی بوو،خۆی بە گەورەترین مرۆڤ دەزانی ،مێژوویێکی درۆیینی بۆ خانەوادەکەی دارشت.هیچ حسابێکی بۆ کەسوکار و هاوڕێ نەدەکرد،ئەوەی شک وگومانی لێکردبایە لەناوی دەبرد،ئێنجا دوای تیرۆر کردنی لەدوای جەنازەکەی دەرۆیشی یان پاساوی بۆ خانەوادەکەی دەهێنایەوە.گرنگی هەرگەورەی بەوە ئەدا کە زۆرینەی گەلی عێراقی لە ڕێکخراوی بەعس دا بێت.بەتایبەتی لەدەزگای سیخوڕی هەواڵگرەکانی (ئاسایشی گشتی،هەواڵگری گشتی)هەواڵگری سوپا،ئینجا گەورەترین سوپای هەبێت لە جیهانی عەرەبی بە چەک و ژمارەش.خەڵکانێکی دەوڵەمەند دەکرد و خەڵکانێکی برسی کرد.نەخشە و پیلانی ئەوە بوو کە گەلی عێراقی بارودۆخی لاواز بێت بۆ ئەوەی بەردەوام فکر لە ژیانی ڕۆژانەی بکاتەوە،بودجەی عێراقی بەم شێوەیە دابەش کردبوو کە 33 لە 100 بۆ کۆشکی کۆماری ئەی بۆ خودی خۆی،33 بۆ وەزارەتی بەرگری،34 بۆ گەلی عێراق بەگشتی .دەستگای سیخوڕی هەواڵگری سوپای عێراقی و هەواڵگری عێراقی گشتی.

چەند نمونەیەک : 1- مەسعود بارزانی و ئیدریس : دەستێکی باڵایان هەبوو لەدەستگیر کردنی عوبەیدوڵڵە و لوقمان و سابیر و گواستنەوەی بارزانیەکان لە قوشتەپە و بارزان.

2- جەلال و مەسعود لە دەستگیرکردنی عەبدوڵڵە ئۆجەلان دورێکی نهێنیان هەبوو.

3- بەفەرمانی مام جەلال شەفیق ئەحمەد ئاغای ناسراو بە شەفیق لاین ونوری حەمە عەلی و عەبدول سوران وئیبراهیم حەمە خورشە لە ساڵی 1981 تیرور کران و مامۆستای نیشتمان پەروەر و شۆڕشگێر فایەقە رەش زامدار کرد. برای بەڕێز و شۆڕشگێر مولازم عومەر عەبدوڵڵە سەردانی خانەوادەی خوالێخۆشبو ئیبراهیم حەمە خورشەی کرد.بەناوی مام جەلال پاساوی بۆهێناتەوە.

4-بەفەرمانی مام جەلال پێشمەرگەی ئازا موختار عەبدوڵڵەی حاجی غەریب تیرەباران کرد،برای بەڕێز و شۆڕشگێر مستەفا چاورەش سەردانی خانەوادەی خوالێخۆشبو مختاری کرد،بەناوی مامجەلال پاساوی بۆ هێناتەوە.

5-بەفەرمانی مەسعود بارزانی حوسەین ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی سورچی تیرەباران کرا.ئەوە بوو بە شەخسی خودی خۆی مەسعود بارزانی پاساوی بۆ ئومەر ئاغا و جەوهەر سورچی هێنایەوە.

6-سەدام حوسەین ئەگەر بەراوەرد بکەیت لەگەڵ جەلال و مەسعود لەسەر ئەو بابەتانەی خوارەوە کە ئاماژەم پێداوە دەربارەی ماهیەتی شەخسی سەدام حوسەین لە گەڵ ئەو خۆفرۆشانە،جیاوازی لە نێوانیاندا 100% هەیە.بۆ روونکردنەوە لە جیاوازیەکانیانسەدام دوژمنی سەرەکی و مەترسی گەورەی لە ئێران،فارس و سەهیونیەت و ئەمریکاەو بڵاو بونەوەی مادەی بێهۆشی دەکرد.ئەوە بوو بەکردەوە هەتاکو لە ژیاندا مابوو بە هەموو توانایکیەوە بەربەرەکانێی ئێران و سەهیونیست و ئەمریکای دەکرد و رێگای حکومەتی تورکیای نەدا رۆژێک لەرۆژاندا لە کەناڵەکانیدا یان لە دیالۆگەکانیدا بە راشکاوی یان بە نهێنی پروپاگەندە بکەن و بڵێن کە تورکمان لە عێراقدا هەیە.دەستگای سیخوری میتی تورکی جێی قاچی خۆیان نەکردەوە هەتاکو سەدام مابوو.هەروەها بەربەرەکانێی مادە بێهۆشکەرەکانی دەکرد و رێگای نەدا بڵاو بکرێتەوە و بڵاوبێتەوە.سەرچاوەی مادە بێهۆشیەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بوو.

7-مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بە راشکاوی پەیوەندی راستەوخۆیان بە ئەمریکاوە هەیە،ئەم پەیوەندیە جێی پرسیار نیە.چونکی بارودۆخێک لە ئارادایە ناچارن.بەڵام لەگەڵ دەستگای سیخورێئەمریکی CIA هەیانە،تەنها لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆیانە.هەرێمی کوردستان بەتەواوەتی لەهەموو بوارێکەوە دەربارەی سیاسەتی دەرەوە و ناوەوە و بازرگانی بە بریار و فەرمانی کۆماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا بەڕێوە دەچێت.ئیتلاعات و پاسداران و قەرارگای رەمەزان و دەستگای سیخوری میتی تورکی و ژنراڵەکانی تورکیا بە هاوکاری دەزگای پاراستن و سیخوری بەڕێوە دەچێت.

دەربارەی مادەی بێهۆشی: کۆماری ئسلامی ئێران بە راشکاوی ئەو ڤایرۆزە ترسناکە لە ناو نێر و می لە گەنجەکان بڵاویان کردەوە.

چەند ئاگاداری و تێبینێک :

1/ سەدام حوسەین : زۆرینەی دانیشتوانی سەرانسەری جیهان بە چاو لە کەناڵەکانی تەلەفزیون وێنەی لە سێدارەدانی سەدامیان دیت.کە ئەو مرۆڤە چەندە خۆڕاگر و ئازا و قارەمان و نەترس بوو، بە زەردە خەنەیەکەوە بەرامبەر پەتی قەنارە راوەستا و ئەو بە مردنی گوت دەرامەکە.داستانێکی مێژوویی بۆ خودی خۆی تۆمار کرد کە ئازاترین و خۆڕاگرترین مرۆڤ سەدام حوسەین بوو،وێنەی نەبوو و لە مێژووی رابردودا هەتاکو ئەو رۆژەی کە لە سێدارە درا.

ئەوە بوو بەکرێگیراوانی کۆماری ئیسلامی ئێران،پێش لەسێدارە دانی بە چەند چرکەیەک سوکایەتییان بەو مرۆڤە مەزنە کرد.لە کاتێکدا لە نێوان سەدام و پەتی قەنارە یەک متر مابووەلە وەڵامدا سەدام وتی ئەوە ئازایەتی نییە کە هەتانە.(هذا مو مرجلە)

مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی : حەتمەن شەقامی کوردی لە ساڵانی نزیک دەستگیریان دەکات،دوای لێکۆڵینەوە رەوانەی دادگایشۆرشیان دەکەن و حوکمی لە سێدارە دانییان دەردەکات.پرسیارێک دێتە پێشێ ئایا جەلال و مەسعود وەکو سەدام حوسەین خۆڕاگر دەبن بەرامبەر پەتی سێدارە؟

وەڵام: بەندە لە نزیکەوە شارەزاییەکی تەواوم هەیە زۆر زۆر ترسنۆکن.رۆژێک لە رۆژان تەقەیان لە دوژمن نەکردوە،بەلام بە بڕیار و فەرمانییان بونەتە هۆی کوشتنیزیاد لە سەدو پەنجا هەزار هاوڵاتی ، و تیرۆر کردنی چەندەها هاوڵاتی رەوشەنبیر و نیشتمان پەروەر،هەر لەبەر ئەوەی بیر و بۆ چونیان نەگونجاوە.بونەتە دەربەدەری هەندەران لە هەموو چین و توێژەکان.ژمارەی پەنابەران کە لە ئەروپا ژیان دەبەنە سەر،کە شەخسی جەلال و مەسعود سەبەبکارن ، دەگاتە نزیکەی 20هەزار مرۆڤ.

جەلال و مەسعود: ئەوەندە ئازا و قارەمان نین وەکو شەخسی سەدام حوسەین بەرامبەر بەرێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوە دادگا و پەتی قەنارە راوەستن؟

ئەو دوو تاوانبار و خۆفرۆش و خائینەی دوژمنی کورد و کوردستانی گەورە،ئەوەندە ترسنۆک و نەفس نزم و بێ شەرم و بێ شەرەفن،پێش ئەوەی شقامی کوردی دەستگیریان بکات ،رادەکەن،بە یەکجاری دەچنە باوشی ئاغاکانییان که دوژمنی سەرەکی کوردن(فارس و تورک ) بەڵگەم هەیە لە ساڵی 2010 یان 2011 .

پرسیاری هەشتەم : ئایا هەر یەک لە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و سەدام حوسەین، شەخسەن هەڵوێست و بیر و بۆچون و دڵسۆزی و وەفایان چۆن بووە بەرامبەرت< هەر وەها بەرامبەر بە خانەوادەت؟

وڵام: چەندها هاوڵاتی کورد و عەرەب و فارس و باینی ئەم پرسیارانەیان ئاراستە کردووم بە تایبەتی دەربارەی شەخسی سەدام حوسەین. لەو چوار کتێبەی کە بڵاوم کردوەتەوە کورتە باسێکم لەسەر بنەماڵەی شێخانی بارزانی و جەلال تالەبانی نامژەم پێدا بوو.بەڵام لەم کتێبەی شەشەم کە لە بەردەستدایە95% نهێنییەکانم بە راشکاوی ئاماژە پێدەدەم و باقی پێنج لە سەدەکەی انشاءالله لە کەناڵەکانی جیهانی روون دەکەمەوە بۆ هاوڵاتیانی کورد و عەرەب،کە جەلال و مەسعوود و سەدام لە هەندێک بابەت دەربارەی چارەسەرکردنی کورد هەرسێکیان وەکو یەک تاوانبارن.

بەندە خزمەتکاری کورد و کوردستان تەمەنم هەشتا ساڵە و تەندروستیم باش نییە و بەرەو گۆڕەپان دەڕۆم.ئینجا بارودۆخێک بۆ بەندە لە ئارادایە کە ئەم راستیانە بۆ مێژوو بڵاوە بکەمەوە.سەدام لە جێی حەقە و نەماوە تاکو جەلال و مەسعود لە کەناڵەکانییان بلاویکەنەوە و بڵێن رەفیق پشدەری پروپاگەندە دەکات بۆ سەدام.

جەلال تاڵەبانی و بنەماڵەی شێخانی بارزانی: ئەوەندەی بەندە بە نان و بەرگی شەخسی خۆم لە هەموو بوارێکەوە خزمەتم کردن. وەڵلە ئم وەڵلە ئەوەندە خزمەتی خوشک و براو کوڕ و کچەکەم نەکرد.ئەو رێزدارانەش سەد جار زیاتر خراپەیان لە گەڵدا کردم.لە ئازارو ئەشکەنجە و هەوڵی تیرور کردنیان داوم.دواجار لە 2008/12/7 ،ئەنجا دەربارەی نان بڕین،نە خۆم نە کوڕم خاوەن یەک دولار و مترێک زەوی نین لە سەرانسەری جیهاندا.

بۆ نمونە:1 – بازیانی کوڕم چوو زەوی وەرگرێت (فڵان) وتی کاک بازیانباش ئەزانم کە تۆ پێشمەرگە بویت،بەڵام بۆ ئێوە کوڕی رەفیق پشدەری زەوی نییە.

2/ هەرێمی کوردستان بڕیار و فەرمانی قەرەبوی زەرەرمەندانی راپەڕینی ساڵی 1991 دەردەکات بۆ هاوڵاتیانی زەرەرمەند.

روونکردنەوەیەک: بە قەرز و یارمەتی کەس و کار و هاورێیانم پرۆژەیەکی تەواوی مریشکم دامەزراند لە " کانی قرژاڵە لە سنوری هەولێر" تەواوم کرد و راپەڕینی بەسەرداهات.تاڵان کرا ، بازیان سکاڵایەک ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی سەروەت و سامان و ئاژەڵی هەولێر دەکات،رەوانەی بەڕێوەبەری کشاوەرزی هەولێر.ئینجا بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشاوەرز و ئەنجا بەرزکردنەوە بۆ وەزیری کشاوەرز و رەوانەی ئەنجومەنی وەزیران دەکرێت،دواجار رەوانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستاندەکرێت.وەزیری کشاوەرز بە بازیان دەڵێت هەموو پرۆژەکەتان تەواو و زەرەرمەندن،بەڵام هەوڵێکی دەوێت بۆ لای جەنابی سەرۆک بۆ ئەوەی زوو پارەکە وەرگرن.بازیان ئاگاداری کردم کە نوسراوە ئاراستەی مەسعود بارزانی دەکات کە لوتف بفەرموێت فەرمان بدات قەرەبوی پرۆژەکە وەرگرێت.

ئاگاداری بازیان دەکەن کە سەردانی لێپرسراوانی پاراستن بکات دەربارەی ئەو نوسراوەی ئاراستەی مەسعود بارزانی کردوە بۆ وڵامەکەی.

بازیان بە دڵخۆشیەوە پەیوەندی پێوە کردم وتی بەڕێوەبەرێکی پاراستن ئاگاداری کردم کە سەرۆک بڕیاری داوە کە پارەکە تەسلیم بە من بکەن.

وتم کە پارەکەت وەرگرت یەک سەر قەرزاری هاوڵاتیانم،بەنرخی ڕۆژ تەسلیمیان کەوە.باقی خاتوتان نییە.بەڵام تۆ نوسراوەت ئاراستەی مەسعود کرد کە زەرەرەکەت وەرگریتەوە چ پێوەندییەکی هەیە کە پاراستن داوات دەکەن؟ کوڕم ئەو ڕۆژەی کە مەسعود بە بەندەی وت تۆ وەزیری دەستەڕاستمی،وتم ئەبم بە فەڕاش نابم بە وەزیر. ئەگەر ڕازی بامایە لە جیاتی دوو ملیون دولار ئیستاکە دوازدە ملیون دولاریان بە زیادەوە تەسلیم دەکردی.

بازیان پێوەندی پێوە کردم و پرسیاری کرد حەوت ڕۆژ پێش ئێستاکە لە چ ماڵێک بوی؟

وڵامم دایەوە 2008/8/5 سەردانی شۆڕشگێڕێکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتم کرد بوو لە گەڵ ئێران خان.

وتی لە سەرداواکردنی لێپرسراوێکی پاراستن ڕۆیشتم دیدارم کرد بە خۆشحاڵیەوە بەرەو دەزگای سیخوڕی پاراستن دەچێت لە هەولێر،ئەنجا لێپرسراوێکی (زل) چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکات.

جەنابی لێپرسراوەکە بەگرژییەوە دەڵێت: بازیان ئەتەوێت قەرەبوی زەرەرەکانتان سەرۆک ئەو گژمە پارەتان بداتێ ! لە کاتێکدا باوکت کتێبێکی تازە دەنوسێت لە سەر سەرۆک.هێرشمان دەکاتە سەر،خراپەمان دەکات.ئەخێر چاوەڕوانی ئەوە مەبە.

مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان قەرەبوی زەرەرمەندانی ڕاپەڕینی ساڵی 1991 ی هەر هەموو هاوڵاتیانی بە زیادە دولاریان دانێ،تەنها هی من ئەبێت. وە بە بڕیاری شەخسی خۆی پرۆژەکەیان بە تەواوەتی تێکوپێک دا و زەویەکەی خستە سەر سنوری شارەوانی هەولێر.

بازیان ی کوڕم پەیوەندی پێوە کردم ،دیار بوو لە باروذۆخێکی زۆر نارەحەتدا بوو کە ژیان بە سەختی دەباتە سەر ، ماندون،چوار منداڵ،دوانیان دانشگایی و لە خانوی کرێیی دام.

وتم بازیان تەنها تۆ نیت کە ماندویت و خراپەت لەگەڵدا کراوە، 85% کوردستانی باشور بەم جۆرە ژیان دەباتە سەر بەدەست جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانییەوە. بازیان کە ئاگادارت کردم کە ئەو گژمە دولارە وەردەگریت لە مەسعود بارزانی،من پێکەنینم پێ هات،کە ڕەوانەی پاراستنیان کردیت بۆ ئەوەی ببیت بە سیخور.وەختێک منیان تیرۆر کردبایە ئەوکات تۆ دولارەکانی وەر دەگرت.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کە ئەو گژمە پارەیان نەدایتێ،چونکی لە کەناڵەکانیان پروپاگەندەیان پێوە دەکرد زۆر لەسەرمان دەکەوت.هەرچەندە مافی خۆمانە ئەو زەرەرە وەرگرین ،ماف کۆن دەبێت بەڵام حەق حەقە و نافەوتێت.کە مەسعود ئەما ئێنجا .

بازیان: مام جەلالیش هەمان هەوڵی لەگەڵدایت کە دوورتان کات لە من و ببێتە زانیاری تایبەتی.

لە 17.01.2009 لەگەڵ هاوسەرەکەم سەردانی خانەوادەی کاک جەمیل سەبری بەگمان کرد لە شارۆچکەی ترۆلیتان.
دوای سڵاو و گفت و گۆ دەربارەی نووسراوەکەی کە ئاراستەی کردبووم وێنەیەک لە پرسیار و وڵامەکانم خستە بەردەستی.
دوای ئەوەی دوو جاری خوێندەوە وتی ئەم هەموو زانیارییەت هەبوو لەسەر ئەو بەڕێزانە هۆی چی بوو هەتاکوو ئێستاکە وسکووت بوویی. وتم لەو کتێبە هەموو نهێنییەکانیان ئاماژە پێدەدەم بەڵام ئەی بەڕێز چەندەها ساڵە لە خزمەت جەلال تاڵەبانیت کوانێ بەرهەمەکانت.

هەستا لە ئەرشیفەکەی ئەو نووسراوەی کە ئاراستە تاڵەبانی کردبوو لە ساڵی 2000 خستیە بەردەستم. بە بێ ئاگاداری ئەو بەڕێزە نووسراوەکەم خستە گیرفانم و لە پاشکۆی کتێبی ژمارە هەشت ئاماژەم پێداوە بەڵام دوایی کە ئاگادارم کردەوە وتی کتێبەکەت ناوەڕۆکەکەی ئەوەندە گرینگە کە سەرنجی ڕاکێشام، ئەگەر تەندرووستیم باش بێ پێشەکی لەسەر ئەنووسم.

لەو چوار کتێبەی کە لە ساڵی 1999وە دەستم کرد بە بڵاو کردنەوەی دەربارەی جەلال تاڵەبانی چەندەها بابەتم ئاماژە پێداوە کە پێویست بە روونکردنەوە دەکات.

1. له بەرگی یەکەم ل 25 حوسێن شیروانی:
هاوسەرەکەی لەگەڵ براکەی هاتنە لام بۆ ماڵەوە و وتیان حوسێن لە بەندیخانەیە لە کۆشکی مردن یان قەسر نیهایە. بە فەرمانی نازم کەزار گیراوە. بەڵکوو هەندی شتمان هەیە وابکەی بەدەستی بگات. وتم هەموو شتەکان بخەنە ناو ئەو ساکە و بیکەن بە لیستە، وادەکەم بگات بە دەستی و ئیمزاشی بکات. ئەوە بوو حوسێن شیروانی شەهید کرا، خانەوادەی توانجیان تێگرتم کە بەندە دەسەڵاتم ئەوەندە هەبوو کە رزگاری بکەم. جەلال تاڵەبانی خائین و خۆفرۆش رووەوبەڕوو بە نازم کزاری وت حوسێن شیروانی ئاگاداری کردم کە لە دانیشگای ئەمریکییەکان مرۆڤێکی ئەمریکی ئەناسم دەیەوێ جەلال دیدارت بکات. دوای چەند رۆژێک حوسێن شیروانی لە ژێر ئازار و ئەشکەنجە بە شەهادەت دانی جەلال تاڵەبانی شەهید کرا.

2. لەبەرگی یەک لە کتێبەکەم باسم کردووە کە حەوت رۆژ پێش کودەتاکەی نازم کزار ئەوە بوو کە جەلال تاڵەبانی تەلەفۆنی بۆ کردم و داوای لێکردم بە پەلە بگەمە قاهیرە، بە خانەوادەوە بە سەلامەتی گەیشتینە قاهیرە و ماوەی 15 رۆژ میوانی بووین. کاتی خۆی سوپاسم کرد کە ئەوەندە بایەخ بە بەندە دەدات، ئێستاکە بۆم روون بۆتەوە کە هۆی چییە جەلال تاڵەبانی ئاگاداری کردووم. چوونکی میقداری 15 هەزار دۆلاریلای من بوو بە ئەمانەت دایناوبوو، ئەگەر تیرۆر کرابامایە دۆلارەکانی دەکەوتە ناو دەریا.

3. له بەرگی یەک ل 34 هاتووە: دوای 13 رۆژ کە لە ماڵی تاڵەبانی بووین لە قاهیرە ئاگاداری کردم ئیمرۆ میوانێکی عەرەبی میسریم دێت، بە تەنها دانیشتبوون بانگی منی کرد ئەم زاتە بناسم، ئەمە عەمید فلآنە سەرۆکی یاوەرانی ئەنوەر ساداتە، بەو بەرێزەی وت ئەوە رەفیق پشدەرییە، ناوبراو تەکانی برد سێ جار لە سەر یەک وتی ئەوەیە رەفیق پشدەری؟ جەلال تاڵەبانی وتی ئەنوەر سادات ناردوویەتی کە بە من بڵێ کە رەفیق پشدەری هاتووە بمکوژێ! بەندەش وتم جەلال تاڵەبانی ئەو کاتە هیچ پلە و پایەیەکی نەبوو و کەسایەتییەکی عیراقی پەنابەر بوو نەبوو ئاسایش و شورتەی میسری ئاگاداری کردباوە نەک ئەنوەر سادات ئەمە هۆیەکە کە تاڵەبانی تەسلیم بە ئیرادەی میسرییەکان بووبوو، یەعنی سیخوڕ بوو.

4. له بەرگی یەکەم ل 34 و 35 نووسیومە کە تاڵەبانی و ساڵح مەهدی عەمماش قسەیان بۆ کردووم. سەرکردایەتی بەعس بەکر و سەدام و عەمماش رایان بەرانبەر بە تاڵەبانی ئەوە بوو کە سیخوڕی ئینگلیز و میسر و رووسیایە. بەندە و زۆرینەی گەلی کورد باوەڕی بەو هەڵسەنگاندنەی بەعس نەبوو چوونکی دوژمنی سەرەکی کورد بوون و تاڵەبانی جێی باوەڕی کورد بوو، بەڵام ئێستاکە روون و ئاشکرایە کە سیخوڕ و خائینی جیهانییە لە پێناو بەرژەوەندی خۆی و داگیرکەرانی کوردستان هەتا هەتایە. وە تەسلیم بە ئیرادەی شەخسی جەمال عەبدلناسر ببو.
ساڵح مەهدی عەمماش ئەم داستانەی بۆ گێرامەوە: لە چلەی جەمال عەبدولناسردا نێردراوی سەرۆکی عیراق بووم لە بەردەمی میوانخانەی هێلتون لە قاهیرە راوەستابووم کە ئوتومۆبیلم بۆ بێ بۆ شوێنی تایبەتی، کە سەرنجم دا تاڵەبانی لە تەنیشتم راوەستاوە، پاش سڵاو گوتم وەرە لەگەڵم سوار بە، بەڕاستی ئەگەر ئەمەم بە چاوی خۆم نەدیبایە بڕوام نەدەکرد، بەندەش بە راپۆرت وەکوو خۆی ئاراستە سەرۆکی عیراق ئەحمەد حەسەن بەکرم کرد کە تاڵەبانی رێزی سەرۆک نوێنەریان لێنابوو، لە میوانخانەی هێلتون لە ژوورێک دایاننابوو لە نێوان ژووری قەزافی و پاشای مەغریب هەر وەکوو چۆن بەرانبەر بە من حکومەتی میسری رەفتاریان دەکرد ئاوەهاش بەرانبەر جەلال دەیانکرد.
تێبینی: ئەو کاتە و ئێستاش حکومەتی میسری داوای حکومەتی کوردی نەکردووە تەنها قەزافی نەبێ، ئەگەر جەلال تەسلیم بەوان نەبووبێ چۆن ئەوەیان دەکرد.

یەکێتی سۆڤیەت و جەلال تاڵەبانی:

جەلال تاڵەبانی دەڵێت روسەکان داوایان لێکردم حزبێکی تازە دانێم،مرۆڤ شک و گومان پەیدا دەکات لە جەلال،لەکاتێکدا یەکێتی سۆڤیەت بەرانبەر کێشەی گەلی کورد هیچ هەڵوێستێکی گەشبینیان نەبوە.ئەگەر جەلال تاڵەبانی سیخوڕیان نەبێت چۆن نەخشە و پیلانەکانیان جێبەجێ دەکات.

5. له بەرگی یەک ل 86 هاتووە:
ساڵی 1976 تاڵەبانی لە بەیرووت ئاگاداری کردم کە گەڕشتمەوە بەغداد ئەو دوو کارە ئەنجام بدەم، یەکەم بەو هەڤاڵانە بڵێم(عەلی عەسکەری، د. خالید حەمە سەعید، عومەر دەبابە، مەسعود جەلیزادە، محمد حاجی تاهیر، عەلی مام رەزا) کە جەلال تاڵەبانی حیزبێکی سیاسی داناوە بە ناوی یەکیەتی نیشتمانی، دووهەم ئەم پەیامە بە سەددام حسین رابگەیەنم کە سوورییەکان پیلانیان ئامادە کردووە کە چۆن فڕۆکەکەی سەدام بنیشێننەوە و دەسگیری بکەن. لە کتێبەکە نووسیومە

"فڵانی" بەڵام ئەو فڵانییە خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی خائین و خۆفرۆش بوو. لە داهاتوو لە کەناڵێک بە دوور و درێژی باسی لێوە دەکەم، شاهیدەکەش نووری فەیسەڵ شاهینە کە لە ژیاندا ماوە.

6. لە بەرگی یەک ل 99 هاتووە: کە چاوپێکەوتنم لەگەڵ شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر کرد لە بەندیخانەی ئەبو غرێب لە ژووری لەسێدارەدان، ئاگادارم کردن کە مام جەلال حیزبێکی سیاسی داناوە. رۆشنبیر و شۆڕشگێڕ خالید دلێر برای شەهید جەعفەر هەتاکوو ئێستاکە سێ جار پرسیاری لێکردووم کە جەعفەر بە نهێن ی چی پێ وتی؟ ئەم وتەیە هەروەها شەهابیش تەئیدی کرد، جەعفەر وتی  کە جەلال لە مەلا مستەفا دیکتاتۆرتر و زاڵمتر دەبێ.

7. لەبەرگی سێیەم لە ل 257 تا 262 لە کتێبەکەمدا هاتوە.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە ساڵی 1981 لە لەندەن لە ماڵی خۆیان وتووێژمان دەکرد. وتی: ناخۆشترین گوند لە کوردستان کە هاتبێتە بەرچاوم تەنها بۆ یەک شەو بێت، رەفیق پێت وایە رۆژێک دابێت کوردستان سەربەخۆ بێت وە ماڵی ئێمە لەو گوندە بێت.

وتم مانەوەی تۆ لە لەندەن گومت دەکات،جێگای شیاوی تۆ شاخەبەرزەکانی کوردستانە.

هەر بۆیە کە گەیشتمە بارەگای سەرکردایەتی لە ساڵی 1982 بە ناوی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئاگاداری مام جەلالم کرد.

وەڵامەکەی مام جەلالم گەیاندە مامۆستا ئیبراهیم لە رێگای شازاد سائیب کە جەلال دەڵێت ژیان لێرە زۆر سەختە بۆ مامۆستا ئیبراهیم.لە نوسینەکانی ناتوانێتبەردەوم بێت.

جەلال تاڵەبانی لە سەرەتاوە کە حیزبی داناوە،بۆ ئەوەی کە سەرکردایەتی بکات نەیویستوە برایم ئەحمەد بگەڕێتەوە.

8 . لە بەرگی یەک ل 86 لە کتێبەکەمدا هاتوە.

لە مانگی تەموزی ساڵی 1976 رۆیشتمە بەیروت بە ناوی گەشت و گوزار.دیداری جەلال تاڵەبانیم کرد و دوو جار کۆبووینەوە.

مام جەلال وتی کە گەیشتیتە بەغداد دوو کاری زۆر گرینگت لەبەردەست دایە ئەنجامیان بدەیت.لەگەڵم هات تاکو فرۆکە خانە.

یەکەم چاوت بەو هەڤاڵە بەڕێزانە بکەوێت"عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری،دوکتور خالید موحەممەد سەعید وە پرۆفسۆر مەسعود موحەممەد  جەلیزادە،موحەممەد حاجی تاهیر و عەلی مام رەزا" .مام جەلال وتی ئاگادارتان بکەم حزبێکم داناوە بە ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.لە کوردە رەوشەنبیر و نیشتمانپەروەرانەی کە باوڕیان بە تەهران و ئەنقەرە و تەلئەبیب و هەواڵگری ئەمریکی نیە هەمو هێز و توانایەکمان لەخۆمان دەبێت،شەڕی پارتیزانی دەکەین.ئێستاش مەشق لەسەر چەکی سوک و راهێنانی سەربازی دەکەین،بۆ ئامادەبوون و گەڕاننە وە بۆ وڵات.دوای ئەنجام دانی کاری یەکەم،دە رۆژ سەرقاڵی ئەوە بووم خۆم ئامادەکەم تاکو لەگەڵ سەدام حوسەین کۆ ببمەوە،بە شێوەیەکی داڕێژراو وتوێژی لە گەڵدا بکەم.

دووەم: جەلال تاڵیبانی ئاگاداری کردم کە ئەم پەیامەت پێ رابگەیێنم کە سورپاکان پیلانێکیان ئامازە کردوە بۆ چۆنییەتی فرۆکەکەت ناچار بکەن بنیشێتەوە و دەسگیرت کەن.

تێبینی :1 . لە کتێبەکەم ناوی جەلالم بە "فڵان " هێناو کە ئێستا دوای سیوسێ ساڵ ئەو نهێنیە بڵاو دەکەمەوە. 2. ئەم کۆبونەوەیە کە لەگەڵ سەدام حوسەین ئەنجامم دا دوو سەعاتی خایەند.زۆر گرینگە بۆ گەلی کورد و عەرەب لە داهاتودا لە کەناڵێکی بیانی باسی لێوە دەکەم.سکرتێرەکەی نوری فەیسەڵ شاهین ئامدە بوو کە ئێستا لە ژیاندا ماوە.

9 . لە مانگی تەموزی ساڵی 1976 لە بەیروت لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کۆبوینەوە،گەڕامۆ بەغدادەوە بوو دەقی فەرمانەکانی جەلالم لە 99% ئەنجامدا،تەنها ئەمە نەبێت ئاگاداری عومەردەبابە مەکە نامەوێت پەیوەندیمان پێوە بکات،چونکلی هاتنی شۆڕشەکەمان لێتێکدەدات.ئەم بڕیارەی جەلالم بە راست نەزانی وپێشەکی ئاگاداری عوومەر دەبابەم

کرد.لە ساڵی 1981 کە لەماڵی مامە ئیبراهیم ئەحمەد لە لەندەن مام جەلالم دیت.جەلال وتی ئەچم سەرێکی مێتی کاکان ئەدەم.کاک رەفیق ئێمە هەر هەموومان قەرزداری ئەو شۆڕگێڕەین.مەبەستی لە عومەر دەبابە بوو.

10 . پەیوەندیم بە خوشکی رەوشەنبیر سورەیا جەلیزادە هاوسەری شۆڕشگێڕ عومەر دەبابە گرت و وتم هەرچەندە 33 ساڵ تێپەڕیوە بەڵام ئەم نهێنییە ئاشکرا دەکەم. لە ل 106 خاڵی 9 لەو کتێبە ئاماژەم پێداوە.

11 . لە 14.2.2009 پێوەندیم بە دوکتور کارۆخ کوری شەهید خالید سەعید کرد و وتم پەیامێکم هەیە بۆ خانەوادەی ئێوە و عەلی عەسکەری.داوای لێبوردنتان لێدەکەم کاتی خۆی تاوانێکی گەورەم ئەنجام دا کە ئەو پەیامەی مام جەلال کە ئاراستەی ئەو دوو شەهیدەی کردبوو کە رووبکەنە شاخەکان،ئەوەبوو شۆڕشیان بەرپا کرد.لە رووداوەکەی حەکاری بە فەرمانی بنەماڵەی شێخانی بارزان،بە یارمەتی هەوڵگری تورکیا و ئێران و عێراق،شەهید کران.سێ جار کارۆخ د.خالید پرسیاری لێکردم: بە باوڕی تۆ مام جەلال خائینە؟ئەمە تاوانێکی گەورەیە.وەلامم دایەوە وتم جەلال تاڵەبانی خائینە.

12 . لە 21.2.2007 کاتمان دانا لەگەڵ کاک هەلۆ ئیبراهیم ئەحمەد لە ستۆکهۆلم.بەگەرمەوە پێشوازی و بەخێرهاتنی کردم.بەدوور و درێژی گفت و گۆمان کرد دەربارەی باروددۆخەکە.هەریەک بە بۆچوونی خۆی ئێستا و ئایندەی روون کردەوە.

هەلۆ ئیبراهیم ئەحمەد وتی،ئەم جۆرە گەندەڵی بڵاو بوەتەوە لە فەسادی ئیداری و ماڵی وئەخلاقی و خێڵەکی،هەتاکو لەناو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتیش پەیدا بووە.ماوەیەکە بە نوسین دەربارەی ئەو بارودۆخی گەندەڵیە زۆر شت بڵاو دەکەمەوە.وای لێکردم باوڕم پێ هێنا وهەمبانەکەم بۆ کردەوە،بەڵام زۆر زوو دەرکەوت کە برای هاوسەری جەلال تاڵەبانیە،هەموو توانایەکی بەکار ئەهێنێت لە پێناو مانەوەی جەلال و کومپانییەکەی.

ئینجا باسی ئەو هێرشەی کرد کە ویستیان ترۆرم کەن.وتی سێ کەس بوون کە کارەکەیان ئەنجام داوە.شۆفێرەکە دانی بە تاوانەکەدا نا،کە نەیزانی ئەودوانە ئیشێکی وایان بەدەستەوەیە.هەردووکیان لەدەستگای پاراستنن،بەڵام لەناو یەکێتی کاردەکەن.سپاس بۆ یەوزدانی مەزن و خالیدی خولە سوری دراوسێمان کە شک دەکاتە سەر ئەو ئوتومبیلە و تەقەیان لێدەکات و ناێڵێت بە تەواوەتی کارەکەیان بکەن.

13 . لە بەرگی 3 ل 177 هاتوە : دەربارەی روداوەکانی ساڵی 1966 ،شەوێک لەپڕا حلمی عەلی شەریف و عەلی مام رەزا،سەردانیان کردم.جێی سەرسوڕمان بوو کە حیلمی وتی ئێمە لە ناوچەی دۆڵە رەقە کە سەر بە عەباسی مامەند ئاغایە رامان کرد لەدەس مەلا مستەفای بارزانی،چونکی بریاری کوشتنی دابووین. مام جەلال لێرەیە چاوم پێی کەوت وتی بۆیە بە نهێنی رووماتکردوەتە لای تۆ چاوت بەسەرۆک عەبدولرەحمان عارف بکەوێت کە ئێمە لە چنگ بارزانی رامان کردوە.هەڵوێستی ئێمەی بۆ شی بکەرەوە.بەندە ئەو کاتە باوڕم بە شەخسی جەلال هەبوو کە کێەی گەلی کورد چارسەر دەکات.ئەوەبوو لە سەعاتی یەکەمەوە هەموو توانایەکی خۆم بەکار هێنا و فەرمانەکانیم 100% جێبەجێ کرد.بەداخەوە دوای ماوەیەکی زۆر ئەو نەفس نزم و خاینەم بۆ رون و ئاشکرا بوو.ئەوەی ئێستا دەزانم لە سەر جەلال ،ئەگەر ئەوکاتە بمزانیبایە نەمدەهێشت ئەم تەمەنە درێژە بباتە سەر لە ساڵی 1906 هەتاکو ئێستا هەزاران هاوڵاتی بە کوشت داو دەربەدەر کران.

سەدام حوسەین : بەندە هەتاکو توانیم هەمو رێگایەکم گرتە بەر بەراشکاوی و نهێنی ،درۆ و فرت و فێڵیشم لێکرد و بەشداریم کرد لە کودەتاکەی ناظم کەزار،شەخسی خودی جەلال داوای لێکردم کە سەدام حوسەین تیرۆر بکەم. ئەوە بوو گفتم پێدا ئەو کارە ئەنجام بدەم و رەنگە هەوڵمدابێت. هەرهەمووی لە پێناوی ئەو رێزدارانە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی: ئەم دوو بەرێزە مرۆڤێکی سانایی نین بەڵکو فریشتەن لە ئاسمانەوە هاتونەتە خوارێ لە خزمەتی مافی مرۆڤ ە ئازادی دیموکراتی و کوردستانی گەورە دادەمزرێنن.

خانەوادەمان بە گشتی، بە تایبەتی بەندە و برا و خوشک و برازا و خوارزاکانم 100% بریار و فەرمانی جەلال و بارزانیمان جێبەجێ کرد.پاداشتی ئەوەی ئەنجامماندا لە پێناو ئەو بەرێزانە و خانەوادەیان،بە دوورو درێژی لەو کتێبە ئاماژەم پێداوە بۆ مێژوو و ئێستا.

ئەوە بوو لە بەرواری 1976/9/14 بە فەرمانی سەدام حوسەین گیرام،دەقی خۆی بەدوور و درێژی لە کتێبەکانم 100% ئاماژەم پێداوە،وا چەند بابەتێک لەم کتێبە تکرار دەکەمەوە.

بەڕێوەبەرایەتی دادوەرانی هەواڵگری گشتی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵمدا کرد،بە ڕۆحێکی ڕێبازی و جوانمێرانە و ڕێزێکی زۆریان لێگرتم.دوای چەند مانگێک کە بە یەکجاری لێکۆڵینەوەکە تەواو بوو،ڕۆژێکیان گوتیان : بۆمان دەرکەوت کە پەیوەندیت بە هیچ وڵاتێکی بێگانە نییە و هەموو ئەو تاوانانەی کە ئەنجامت داوە بە فەرمانی جەلال و بارزانی دژی عێراق بە تایبەتی دژی شەخسی سەدام حوسەین،دێکۆمێنت و بەڵگە 100% تاوانەکانت هەر هەمووی ئاشکرا بوو.

جا لەبەر ئەوەی تۆ و هاوڕێی شەخسی سەدام حوسەین بوی،تکایە دان بە تاوانەکانت دا بنێ،ناچارمان مەکە ڕێگای ئازار و ئەشکەنجە بگرینە بەر لە پێناو ئەوەی دان بە تاوانەکانتدا بنێیت.

وتم: هەمو ئەو تاوانانەی بەرەو رووی منتان کرد هیچ یەکێکیان ڕاست نییە،ناتوانم بە درۆ بڵێم ئەوە ڕاستە.ئینجا بردمیان بۆ ژوری لەناو بردن.چواردە ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجەیان دام،قاچ و دەستم توانای جوڵاندنەوە و هاتو چۆی نەما.وەکو منداڵێکی ساوای دوورۆژم لێهات.قاچەکانم ئاوسا بوو،خوێنیشیان لێدەهات.خوێن و میز و پیسایی تێکەڵ یەک ببو.تەنها سەرم ساغ بوو.لە قسەکردن ڕەفیق پشدەری بووم.پزشکەکە وتی خەریکە بمریت،دەستیان لەسەر هەڵگرتم،مرۆڤ کە تەوافی کرد شەیتان دەستی لەسەر هەڵدەگرێت.

دوای چەند مانگێک بەتەواوەتی چاکیان کردمەوە،ئینجا بەندە و کاک شەفیقم ڕەوانەی دادگای شۆڕشی بەعسیان کردینلە ساڵی 1977.شاهید ئامادە بوو ڕوودبەڕووم بە ڕاشکاوی لە بەرچاوی ئامادەبووان شەهادەتی خۆی دا لە سەر بەندە و کاکە شەفیقم ،ڕاستگۆیانە قسەکانی گوت،بەڵام بەندە گوتم ڕاست ناکات درۆ دەکات.

دووەم جار ئێمەیان بردەوە بۆ دادگای شۆڕشی بەعس.تاوانەکانی شی کردمەوە لەسەر حەوت بابەت بە بەڵگە و شاهید،داوای لە سێدارەدان و سەروەت و سامانم دەستی بەسەردا بگیرێت و شەفیق 15 ساڵ حەبس.ئێمەیان گەڕاندەوە شوێنی خۆمان، دوای یەک سەعات فریشتەیەک دەرگاکەی کردەوە و هاتە ژورێ و وتی: بۆ ئاگاداری بە ئیمزای سەدام حوسەین فەرمانێک ئاراستەی دادگا کراوە و وێنەیەک بۆ ئێمە نێردراوە،بڕیاری حوکم لەسەر تۆ سێدارە دانت و شەفیق 15 ساڵ زیندانی دوای یەک مانگی کە ڕەوانەی دادگا دەکرێتەوە،سەرۆکی دادگا ئاگادارت دەکات.

وتم راکەم،خۆم بکوژم؟ وتی من دەڵێم ڕاکە خۆت بکوژە،تۆ مرۆڤێکی عاقڵی خۆت ڕزگار کە.کە فریشتەکە ڕۆیشت خودا شاهیدە سێ ڕۆژ سوجدەم دەبرد و قورئانەکەم بەرز دەکرد و دەستم بە دوعا و هاوار و پاڕانەوە کرد و پەنام بۆ یەزدانی مەزن دەبرد.خوایە بەندەت بە کوردی هێناوەتە جیهان،لە پێناو نیشتمانەکەم خۆم توشی ئەوڕێگا ترسناکە کرد.لە پێناو پارە و پلە نەبوو،کەسم تیرۆر نەکردوە و کەسیشم بە تیرۆر کردن نەداوە.کۆمەکێکی زۆری هاوڵاتیانم کردوە،خودای مەزن کۆمەکم کە، یارمەتیم بدە ڕێگام پێ پیشاندە ڕزگارم کە بە سلامەتیبچمەوە ناو کەسوکارم بەتایبەتی لە خزمەت دایکم بگەمەوە.

بە قوربانی ئەو خودایە بم،لە پڕا خاڵە لاوازەکەی سەدام حوسەینم هاتەوە یاد و بیر و هۆش. جارێکیان بارودۆخی کێشەی کوردم بۆ هەڵدەسەنگاند،دیار بوو قسەکانی بەندەی بە دڵ نەبوو.

سەدام داوای لێکردم کە کۆتایی بە قسەکانم بهێنم،کاتێکی کە داوای دیدارم دەکات،بەندە هەر بەردەوام بووم.

سەدام حوسەین بۆجاری سێهەم وتی: هەڵسە بڕۆ دەرێ لێرە.

بەندەش وتم: ئەتۆ و سوپای عێراق و بەعس توانای ئەوەیان نییە لەم ژورە دەرم کات تاکو وتووێژەکەم تەواو دەکەم.ئەوە بوو دوو سەعات و چارەکێک ئینجا کۆتاییم پێ هێنا و هەڵسام.

سەدام پرسیاری کرد، کتوپڕ بۆ هەڵسایت؟بۆ چ شوێنێک دەچیت؟

وتم: ئەچم بۆ شرطەی وشاش یان شرطەی منصور،ئەڵێم هاتووم بەندم بە فەرمانی سەدام حوسەین.

سەدام وتی:بۆ من وتم تۆ بەندی؟

وتم: تۆ وتت برۆ دەرێ لێرە.

سەدام وتی: دانیشە پرسیارم هەیە،تۆ چی بابەکر ئاغای؟

وتم: هیچ.

وتی: بابەکر مەحمود ئاغا،بابەکر میراودەلی،بابەکر ئاغای پشدەری.

وتم: من شانازی بە جەنابی بابەکر ئاغا دەکەم،هاورێیەکی دێرینەمە وکو برا و زیاترین.من خەڵکی کۆی م ،باپیرم 150 ساڵە هاتونەتە پشدەر ،من کورە ئاغا نیم،باوکم کاسب بو.ئێمە لە خانەوادەیەک سوک نین،بەڵام ناسراوین.ژمارەی خانەوادەمان زیاد لەسەد خێزانە،بەندە بە ئازایەتی خۆم بووم بە ئامر بەتالیون ئەک بارزانی.لەسەر داواکردنی شەخسی خۆت کار و باری سیاسیت لەگەڵدا دەکەم.من سکاڵام پێشکەش نەکردبویت.

سەدام وتی: منیش لە خانەوادەیەکی سوک نیم،باوکم پولیس بوو ،بەدەستی خۆم پێگەیشتم،من و تۆ لێک دەکەین.تۆ مرۆڤێکی ئازای،منیش ئازام.تۆ مرۆڤێکی زانای ، منیش زانام،من و تۆ لەیەک دایک و باوک هاتوینەتە جیهان.هەڵسا، ئەملاو ئەولای یەکترمان ماچ کرد.

خاڵی لاوازی سەدام حوسەین ئەوەیە کە روو بەرووی راوەستیت،مرۆڤی ئازای خۆش دەویست،ڕق و کینی لە مرۆڤی ترسنۆکبوو.

بەناوی خودای بەخشەندەی جیهانەوە،27 رۆژ جاری سێ جار کە لە کۆبونەوەکانم وتو وێژم لەگەڵ شەخسی بەکر و سەدام و لێپرسراوانی سەرکردایەتی کردوە،راپۆرتەکانم ئاراستە کردون لە پێناو چارە سەرکردنی کێشەی کورد و دامەزراندنی حکومەتی کوردی،تاکە رێگایە بۆ رزگار کردنی شاری ئەسکەندەرون لە دەست تورک و رزگار کردنی شاری ئەهواز لە دەست فارس دا.

کە زانیم بەکرد و سەدام دڵسۆز و راستگۆ نین بۆ گەلی عێراق و نەتەوایەتی جیهانی عەرەبی کە دەڵێن ،یەکگرتوی جیهانی عەرەبی و ئازادی و سەربەخۆ دەستیان بەسەر عێراقدا گرتوە و بەس.بەندەش گۆڕام بەرامبەریان. تاوانباری گەورە،بەکر و سەدام حوسەینن،ئەوان دەبێت رەوانەی دادگا بکرێن. ئەک بەندەی دڵسۆزی عێراق،ئایا ئەزانی لەسەر داواکردنی سەدام حوسەین رۆژی 1976/9/11 دیدارم کرد . هەڵسا و بە پیرمەوە هات و وتی دڵم لات بوو،کە داوای لێکردم جەلال تاڵەبانی تیرۆر کەم.وەڵامم داوە ئەمە رەوشت و کاری من نییە. من ئەمزانی دەستگیر دەکرێم.هەروەکو ناظم کزار کودەتاکەی کرد و رامکرد،ئەوە بوو گەڕامەوە.ئەستوانی راکەم،ئەوە بوو لە 1976/9/14 گیرام.ئەوەی بە منیان کرد هەر هەمووی بەفەرمانی سەدام حوسەین ئەنجامدرا. ئەم بابەتە 70 لاپەرەیە وا بەکورتی کۆتایی پێدەهێنم.سوپاس بۆ یوزدانی مەزن و ئەبو ئەلی کە سەرکەوتنم بەدەست هێنا،لە ماوەی شەش سەعات لە یەک رۆژ سێ جار رووبەرووی حاکم ئامدە بوین.جاری یەکەم بڕیاری دا رەفیق لە سێدارە و شەفیق 15 ساڵ زیندانی.دوای چوار سەعات بڕیاری دا رەفیق 20 ساڵ زیندانی و شەفیق 10 ساڵ.لە مێژوی سەدام حوسەین کە حوکمی عێراقی کرد ئەمە یەکەم جارە لە بڕیاری خۆی پاشگەز بێتەوە.مرۆڤی ئازای وەکو رەفیق لە سێدارە نادرێت.

هەڵوێسەکانی سەدام حوسەین کە بەرامبەر بەندە ئانجامیدا کە چەند بابەتێک ئاماژە پێدەدەم.

1/ دوای کودەتاکەی ناظم کەزار، بەندە بە چەند مانگێک گەڕامەوە بەغداد،ئەوە بوو دیداری سەدام حوسەینم کرد.وتی : ئەمە لێکۆڵینەوە نییە،تەنها مەبەستم بۆ ئەوەیە دڵم ئاسودە بێت.

یەکە یەکە وەڵامی پرسیارەکانم دایەوە.سەدام وتی : کارێکی باشت کرد کە راتکرد،دەستگیر دەکرای ئێمەش بڕیاری لەسێدارەدانمان دەدای.

بەشداریم کردبوو لە کودەتاکەی ناظم کەزار ،رامکرد.بە دوورودرێژی لە کتێبەکانم روونکردوەتەوە.

2/ یەکەم رۆژ2/ یەکەم رۆژێ کە دەستگیر کرام و گواسترامەوە بۆ بەشی دەزگای لێکۆڵینەوە و ئازار و ئەشکەنجە،بەرپرسە بەرایەتیەکەی وتی: تۆ بە فەرمانی شەخصی سەدام حوسەین دەستگیر کراویت،لەشوێنێک ئەسڵێت کە هیچ مرۆڤێک توانای ئەوەی نییە چاکە و خراپەت لەگەڵدا بکات.بڕیار و فەرمانەکانی 100% بەرامبەرت ئەنجامدەدەین.

یەکەم رۆژی ئەو خواردنەی بۆیان هێنام نەگۆڕا،لەماڵی خۆمدا جار جار جۆری ئەو خواردنەم ئەخوارد.ماوەی بیست مانگ لە ژوورێکی تەنهایی بووم.سوکایەتیم پێ نەکرد.

3/ دوای چەند رۆژێکی ئازار و ئەشکەنجە دانم،یەکێک لە پیاوکوژەکان وتی: ناچارت کردین کە روباری کچت بهێنین تاکو دان بە تاوانەکان بنێت.ئەڵێی چی قسە بکە و وەڵام بدەرەوە.

وتم دەسەڵات بە دەست خۆتانە.

ڕووباری کچم دەهێنن و لە بەر چاوی منەوە سووکایەتی پێدەکەن، بۆ ئەوەی دان بە تاوانەکانما بنێم و ماڵی چەندین هاوولاتی ڕەش بکەمەوە. هیچ بڕیارێکم نەدابوو کام ڕێگا دەگرمە بەر. تەنیا چاوەڕێی ڕەحمەتی خودای گەورە بووم، پێم خۆش بوو زووتر بمرم و ڕووبار بەو حاڵەتە نەبینم.

خستمیانە ناو پەتوویەک و دوو کەسی هەڵیان گرتم و لە ژووری ئازار و ئەشکەنجە گواستمیانەوە بۆ جێگایەکی کش و مات و لە سەر قەنەفەیەک دایاننام. کاتێک پەردەکەیان لە سەر چاوم لابرد، تەماشام کرد ئەوە بارزان تکریتی بەرپرسەبەری هاولگری گشتی بوو، گوتی:" ئەبو بازیان! تۆ باش سەیری خۆتت کردووە؟ هەموو گیانت بووەتە شیلاڵی خوێن، دان بە تاوانەکانت بنێ و زوو خۆت ڕزگار بکە. دوای چاک بوونەوەت، ئازادت دەکەم و ڕەوانەی لای دایکت و منداڵەکانت دەکەمەوە." گوتم : گرینگ ئەوەیە کە تۆ منت بەم حاڵە بینی، من هیچ نهێنییەکم نییە دانی پێدا بنێم. "

بە دەم ڕۆیشتنەوە بە بەرپرسی زیندانەکەی گوت: ئێوە کارەکانتان ئەنجام بدەن. لە شێوەی قسەکانی دا دیار بوو کە خۆشحاڵ و رازی نەبووە، چوونکە یەکترمان باش دەناسی.

خوێنەری بەڕێز !

ئەوەی لە بەردەستاندایە و دەیخوێننەوە ڕەنگە دلۆپێک لە دەریای ئەو ڕاستیانە بێت کە هاوڵاتیانی کورد سەبارەت بە گەندەڵی و خیانەتی دوو کۆمپانیەکەی پارتی و یەکێتی، دەیزانێت و ڕۆژانە ڕوو بەڕووی بووەتەوە. بەڵام من لەم ئاخری تەمەنەوە، ئاشکرای دەکەم و دەینووسم و ترسم جگە لە خودای مەزن لە هیچ کەس نییە. من لێرەدا پرسیارێک دێنمە ئاراوە کە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی بە پێی هەڵبژاردنێکی دیموکراتیک بە دەسەڵات گەیشتوون؟ وەڵامی ئەو پرسیارە ئاشکرایە و هەموو کەس دەزانێت کە ئەو دوو کەسە و کومپانیەکەیان، لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بە دەسەڵات نەگەیشتوون، چوونکو ئەوان لە دوو زەمەنی تایبەتدا یانی دوای شەڕی کەنداو و هەر وەها دوای ڕوخانی سەدام، ئەوانە کەوتنە سەر دەسەڵاتی حازر و ئامادەوە. ماوەی دەسەڵاتداریتی ئەو دوو حیزبە، کە 18 ساڵە، نیشانی داوە کە نە تەنیا نەیانتوانیوە لە بەرژەوەندی ویست و خواستی خەڵکی کوردستان هەنگاو هەڵبگرن، بەڵکوو کۆمەڵێک مرۆڤی ترسنۆک و نەفس نزم و پارەپەرستیان پەروەردە کردوە کە لە گەل ئەو ئامانجانەی کە خەڵکی کوردستان هەزاران شەهیدیان پێشکەش کردووە، زۆر جیاوازە.

ئەگەر بمانەوێ لەو بوارەدا نموونە بهێنمەوە، هەڵبژاردنی ساڵی 2009 گەورەترین بەڵگەیە بۆ قسەکانم. ئەوە بوو کە لە هەڵبژاردنەکەی ساڵی 2009دا ، ناڕەزایەتی و تووڕەیی خەڵکی کوردستان بە دەس گەندەڵیەکانی جەلال و مەسعود بوو بە هۆی سەر هەڵدانی بزووتنەوەیەکی مەزن بە ناو گۆڕان. بزووتنەوەی گۆڕان لە ماوەی کەمتر لە سێ مانگ توانی زۆرینەی شەقامی کوردی دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. یانی توانی زۆربەی هەرە زۆری ناڕازییەکانی کوردستان دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. دەبینین کە کەسایەتیەک بە ناو کەمال میراودەلی لە بەرانبەر مەسعود بارزانی کە کاندیدی هەر دوو دەسەڵاتە خائینەکە بوو، زۆرینەی دەنگەکان بە دەس دەهێنێ. لێرەدا دەمەوێ ئەوە باس بکەم کە لەو هەڵبژاردنەدا نە تەنیا تەزویرێکی زۆریان کرد بەڵکوو، ئەو دوو خائینە دەیانویست لە ڕێگای هەلیکۆپتەرەوە، سەرکردایەتی بزووتنەوەی شۆرش وەک بەڕێز نوشیروان موستەفا و هاوڕێکانی دەستبەسەر بکەن و لە ئاکامدا بیانکوژن. بەڵام بە هۆی ئەمریکایەکانەوە کە رازی بەو پیلانە نەبوون، نەیانتوانی بیانکوژن بەڵام لە ڕێگای تەزویرەوە، نەیانهێشت بزووتنەوەی

گۆڕان بە مەبەستە سەرەکییەکانی بگات. بۆ نموونە لە شاری بەغدا کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دوو حیزبەدا نەبوو، لە ناو 1،5. ملیۆن کوردی فەیلیدا تەنیا 25000 دەنگیان هێناوەتەوە.

ڕەنگە هاوڵاتیان پرسیاری ئەوەم لێبکەن کە بەندە ڕەفیق پشدەری کە خاوەنی ئەو هەموو زانیاریانە بووم، بۆچی دوای 39 ساڵ بڵاوی دەکەمەوە. من تەنیا ئەوە دەڵێم بە پێی ویژدانی شەخسی خۆم زانیاری و نهێنییەکانم لە کاتی خۆیدا بە شوێنی پێویست گەیاندووە. بۆ نموونە بەر لە بۆردمانکردنی شاری قەڵادزێ لە 24 ی نیسانی 1974 ، من هەواڵی ئەو تراژیدیەم 48 سەعات دوای بڕیارەکە بە شەخسی مەسعود بارزانی ڕاگەیاندبوو، هەر وەها سێ مانگ پێش ڕێکەوتنەکەی الجزایر لە نێوان شای ئێران و سەدام حوسێن دا، ئاکام و بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیم بە مەسعود بارزانی ڕاگەیاندبوو کە بە داخەوە هیچ کام لە ئاگاداریەکانی منیان ڕەچاو نەکرد!! کە نازم کزار بەڕیوەبەری ئاسایشی گشتی دەربارەی ڕێکەوتنەکەی دوو قۆڵی نێوان، بارزانی و سەدام بە تەواوەتی ئاگاداری کردم کە ناوەڕۆکەکە11 ی ئازاری 1970 تەنها بریتییە لە پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆک. تەنها سەرۆک "ئەحمەد حسن بکر و سەدام حسین و من کە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم" ئەوە دەزانین، ئینجا مەرجێکی لەسەر دانام کە: لە کاتێکدا ئەم نهێنییە ئاشکرا کەی بە دەستی خۆم ئەتکوژم. کە نازم کەزار قسەکەی تەواو کرد یەکسەر لە بیری خۆم بردەوە بە تەواوەتی.

گەلی کورد بە گشتی 11ی ئازاری ساڵی 1970ی بەم جۆرە هەڵسەنگاند:

ئەمە گەورەترین ڕووداو و سەرکەوتنە لە مێژووی کورد لە دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد و شەهید کردنی پێشەوا قازی محەممەد و هەڤاڵانی.

ئەوە بوو کە پاش 11ی ئازاری 1970 دەسەڵاتی سیاسی یەکسەر کەوتە دەست مەلا مستەفا بارزانی. بە هۆی بارو دۆخی ئەو کاتە، بەندە و خەڵکانێکی زۆر ناچار بووین تەسلیمی ئیرادەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بین. بەندە بە ناوی نهێنی "بەیروت مارتینز" پێوەندیم بە بەڕێز کاک مەسعود بارزانی بەڕێوەبەری دەزگای پاراستنی پارتییەوە هەبوو بە شێوەیەکی بەردەوام هەموو تواناییەکی خۆم و خانەوادەم بۆ پارتی بەکار هێنا و هاوکاریم کردن تاکوو مەلا مستەفا ئاشبەتاڵی بە شۆڕشی ئەیلوول کرد لە ساڵی 1975.

لە 15.05.1985 لەگەڵ بازیانی کوڕم گەیشتمە گوندی ڕاژانی کوردستانی ڕۆژهەڵات. بەندە نوێنەری خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی بووم بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی و ئاسایش لە نێوان یەکیەتی و پارتیدا. ئەوە بوو سەردانی سەرکردایەتی پارتیم کرد کە کاک مەسعود ئاگادار بوو بە هۆی بارەگایەکی پارتی.

یەکسەر چوومە ژووری کۆبوونەوە. ئامادەبوان ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لێژنەی مەرکەزیلەوێ بوون بەڵام کاک ئیدریس لە ئەورووپا بوو. پێشوازییەکی سارديان لێکردم. هۆی ئەو سارديیەش ئەوە بوو کە: دەبوو چاوەڕوانی کاک مەسعود بکەن کە چۆن چۆنی گفتوگۆم لەگەڵدا بکات، ئینجا من نوێنەری دوژمنی هەرە گەورەیان بووم کە خودی شەخسی جەلال تاڵەبانییە. لە ناو پارتیش جەتمەن ئەو پڕوپاگەندەش کرابوو کە من سیخوڕ و پیاوی سەدام حسێنم. ئەو بوو کە ناوچەوانیان زۆر گرژ بوو بۆیە چەند ڕابردوویەکی بنەماڵەی شێخانی بارزانیم هاتەوە یاد:

ساڵی 1964 سکاڵام تۆمار کرد لە سەر مەلا مستەفا بارزانی لە لای برا گەورەکەی شێخ ئەحمەد بارزانی کە مەلا مستەفا دووبەرەکی درووست دەکا لە ناو شۆڕش و ئەم هەڵوێست و ئەنخشەی خزمەت بە گەلی کورد ناکات و لە بەرژەوەندی گشتی هۆزی بارزانیدا نییە. کە گەڕامەوە لای بارزانی ڕووبەڕوو سووکایەتی پێکردم و وتی: سەگباب، دایکت دەگێم!

ئینجا هەڕەشەی کوشتنی لێکردم. بارزانی ناوچە دابڕاوەکانی فرۆشت بە سەدام حسین لە 13-12 کانوونی دووەمی ساڵی 1975 و لە ساڵی 1975 یش ئاشبەتاڵی بە شۆڕش کرد. بەندەش بڕیارم دا کە کاک مەسعود هاتە ژووری سووکایەتی پێبکەم لەبەر ئەوەی ئامادەبوان باش من بناسن و بزانن کە لە زۆرینەیان دڵسۆزتر و فیداکارترم لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان و نوێنەری خودی شەخسی مام جەلالم.

کە کاک مەسعود هاتە ژووری هەر هەموویان ڕاوەستان و هەناسەیان لە خۆیان بڕی، ئینجا دانیشتن، دوای ئەوەی بەخێر هاتنی کردم وتم: کاک مەسعود تۆ و مام جەلال دایکی میللەتی کوردتان گا، ئایا بۆچی خۆتان خانەنشین ناکەن؟ ئەو کاتە گەلی کورد ئازاد و سەربەست دەبێت کە خودی خۆی ئامانجەکانی کە ساڵەهای ساڵە خەونی پێوە دەبینێ جێبەجێ بکات

کە ئێوە نەبن.
ئینجا قەڵەم و کاغەزم خستە بەر دەستی.
ئامادە بوان هەر هەموویان گرژ بوون و تەماشای کاک مەسعودیان کرد کە بزانن هەڵوێستی چۆن دەبێت بەرامبەر بەندە و چ دەکات. وەکوو باوکی چرکەیەک راوەستا و پشووی خواردەوە.
مەسعود بارزانی وتی: کە ئاگادارم دەکردن کوردێکمان هەیە لەناو قووڵایی سەرکردایەتی حیزبی بەعس و بە هۆی ئەو هەڵاڵەوە نەخشە و پلانەکانی بەعس دەزانین، ئەو کوردە ئەم کاک رەفیقەیە کە لە ناومان دانیشووە.
کە مەسعود بارزانی بەم جۆرە بەندەی هەڵسەنگاند دانیشتنەکە بە پلەی 180 دەرەجە گۆرا، هەر هەموویان گرینگییان بە بەندە دا.

وتم: کە تۆ لە یادتە سکاڵم تۆمار کرد لەسەر بارزانی لە لای شێخ ئەحمەد و کە گەڕامەوە لای بارزانی چۆن هێرشێکی گەورەی کردە سەرم. بەڵام تۆ و کاک ئیدریس پارێزگاریتان کردم، مەبەستم ئەوە بوو کە من خۆڕاگرم و پشتم لە شۆڕش نەکرد. ئەوە بوو کە بووم بە ئامیر بەتالیۆنی 9ی قەرەداخ، پێشمەرگە قارەمانەکان بەندیان هەڵبژارد نەک بارزانی؟

کاک مەسعود وتی: کە حەبیب محەمەد کەریم فەیلی ئامادە بوو لە دادگای شۆرشی بەعس و روو بە روو شەهادەتی دا کە تۆ پێوەندیت بە شۆرش هەیە، چۆن وڵامت دایەوە و چیت وت؟

وتم: جەنابی سەرۆکی دادگا، بەرێز! راست ناکات و درۆ دەکات چوونکی لە نێوانماندا دوژمنایەتی هەیە.
سەرۆکی دادگا وتی: دوژمنایەتییەکەتان چییە؟
وتم: چوونکی بەندە و مەلا مستەفا دەمانزانی کە حەبیب پێوەندی سێکسی هەیە لەگەڵ براژنەکەی کە هاوسەری یاسینی برایەتی بۆیە دەیەوێ لە ناوم بەرێ.
حەبیب داوای لە دادگا کرد کە پارێزگاری لێبکات لە دەستی بەندە.
وتم: جەنابی سەرۆک نێوانی بەندە و پەتی سێدارە یەک میترە، حەبیب لە سێبەرەکەم دەترسێت چوونکی دەزانێت پێش ئەوەی من لە ناو ببا من ئەو لە ناو دەبەم.

کاک مەسعود خۆشحاڵ بوو و دەستی کرد بە پێکەنین کە بەمجۆرە سووکایەتیم بە کۆنە سکرتێرەکەی پارتی کردووە، کە شۆرشی بە جێهێشت و تەسلیم بە بەعس بوو.

بۆ ئاگاداری: بە فەرمانی خودی شەخسی مەسعود بارزانی لە ساڵی 1994 حەبیب محەمەد کەریم بوو بە ئەندام بەڕێوەبەرایەتی لێژنەی چاودێری پارتی دیموکراتی کوردستان.

خوێنەری هێژا!
وا دەگەرێمەوە سەر بابەتە سەرەکییەکە کە دەربارەی ناوچە دابراوەکانە(خانقین، کەرکووک، مخمور، دووبز، شێخان، سنجار، تەلعەفەر)

رووداوە رەشەکەی 31ی ئابی 1996 خودی مەسعود بارزانی دەورێکی سەرەکی هەبوو کە بە راشکاوی ئەو خیانەتە گەورەیەی کرد و پایتەختی هەرێمی کوردستانیان تەسلیم بە سەدام حسین کرد و پۆستاڵەکانی گاردی کۆماری پەرلەمانی کوردستانیان پێشێل کرد.

ئەو بار و دۆخەی کە هاتە ئاراوە ئاکامی ئەوە بوو کە شەقامی کوردی بە راشکاوی خیانەتی خستە پاڵ بنەماڵەی شێخانی بارزانی.

بەندەش لەو بار و دۆخە سوودم وەرگرت، ئەوە بوو کە بیرەوەرییەکانم و بەشێک لەو نهێنییانەی زانیاری تەواوم هەبوو لە چوار کتێبدا بڵاوم کردەوە. ئینجا دەستم کرد بە نووسینی کتێبی پێنجەم کە لەبەر چەند هۆیەک بڵاوم نەکردەوە کە لە خوارەوە ئاماژەی پێدەدەم:

هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستان دوا خرا، ئەوە بوو خودی شەخسی جەلال تاڵەبانی جارێکی کە بنەماڵەی شێخانی بارزانی هێناوە سەر گۆرەپانی سیاسی کوردستان و بەشداریانی کردەوە لە چارەنووسی کورد و وردە وردە جەلال

تاڵەبانی تەسلیم بە ئیرادەی بنەماڵەی شێخانی بارزانی بوو. لە دوای رووخانی رژێمی سەدام حسێنلە 2003 ئاگاداری خەڵکانێکی زۆرم کرد تاکوو 7.11.2005 کە لە شاری سلێمانی رامکرد و گەیشتمە ئەورووپا. چەند ژمارەیەکم لێ ئیستینساخ کرد و ئاراستەی چەند هەڤاڵێکی نیشتمانپەروەر و سیاسەتمەدار کرد کە ناوی سێ لەو بەڕێزانە ئاماژە پێدەدەم:

1. نەوشیروان مستەفا کە وتی: کتێبەکەی تۆ بۆ کاتی هەڵبژاردن بایەخێکی زۆری دەبێت و ئەو دیکۆمێنتانەی کە ئاماژەت پێداوە کەمتر نییە لەو چەند ملیۆن دیکۆمێنتانەی کە ئێمە دەستمان کەوتووە لە دەزگاکانی حیزبی بەعس کە پێوەندی بە بنەماڵەی شێخانی بارزانییەوە هەیە.

2. جەلال تاڵەبانی: بە هۆی ئەو پێوەندییە ئاشکرا و نهێنییەی کە بە بەریتانیا و ئەمریکاوە هەیبووە ئاگاداری هەموو ئەو رێکەوتننانەی مەلا مستەفا و سەدام بووە و لە سەر بەندە نهێنییەکانی شارەزایە ( لە کاتێکدا کە دوای رووخانی رژێمی بەعس جەماوەر توانی بە ماوەی 48 کاتژمێر ناوچە دابڕاوەکان رزگار بکات، کێشە سەرەکییەکە بە هەڵواسراوی مایەوە و ناوچەکان نەخرانەوە سەر کوردستان، هۆی ئەوە بوو جەلال تاڵەبانی دەقی بڕیار و فەرمانەکەی بەریتانیا و ئەمریکای جێبەجێ کرد، بۆیە ئەوەی روویدا روویدا و هەمووشی دەوری چەپەڵ و پیسی تاڵەبانی بوو کە ئەو خیانەتەی بەرامبەر بە گەلی کورد و بە تایبەت ناوچە دابڕاوەکان کرد.)

3. دکتۆر بەرهەم ساڵح: هەڤاڵ محمود مەلا عزەت سەردانی کردم و وتی کە دکتۆر کتێبی 5ی دەوێ بۆیە خۆم تەسلیم بە پرسگەی ئەنجومەنی وەزیرانم کرد.(لە یەکەم رۆژی کە گەڕایەوە کوردستان ئەو هانی هانییەی لە سەر بوو کە پاڵێوراوی بەریتانیا و ئەمریکایە و مەرجە لە سەر جەلال تاڵەبانی کە پلە و پایەیەکی گەورە و گونجاوی هەبێت و دوا رۆژ ئەبێت بە جێگری خۆی. زۆرینەی هاووڵاتیان پەسەندیان کرد و خۆشحاڵ بوون چوونکی ماهییەتی ئەو بەڕێزە لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، هەڤاڵێکی زیرەک و زانایە و لێهاتووە و هەڵوێستی نەتەوایەتی زۆر و بەرز و بەتێنە و ئەتوانێت خزمەتێکی کورد و کوردستان بکات بە تایبەتی کوردستانی باکوور بە هۆی هاوکاری و نزیکایەتی لەگەڵ ئەمریکا و بەریتانیا. ئەو ئەتوانێ هەڵوێستی ئەمریکا و بەریتانیا بگۆڕێت و گەش بین بێت بەرامبەر پارتی کرێکارانی کوردستان و کۆمەک و یارمەتی حیزبە سیاسیەکانی کوردستانی رۆژئاوا بدات.

بەداخەوە ئەوە بوو رۆژگار زۆر زوو ماهیەت و هەڵوێستی ئاشکرا بوو لە دەقی نەخشە و پلان و پرۆگرامە ستراتیژیەکەی ئەمریکا و بەریتانیا ئەنجامدراوە.دەورێکی رەش بین هەبو بەرامبەر کوردستانی باکور و رۆژهەڵات و رۆژئاوا بە تایبەتی دەربارەی ناوچە دابڕاوەکان هەڵوێستێکی خەیانەتانەی ئەنجامدا،ئەمەش بەڵگەیەکە کە لە خوارەوە ئاماژەم پێداوە.

بەڕێز دوکتور ئیبراهیم جەعفەری پەردەی لەسەر ماهیەتی "بەرهەم" هەڵدایەوە دەربارەی ناوچە دابڕاوەکان. ئەمە قسەی ئیبراهیم جەعفەریە کە وتی: لە کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران کە لێکۆڵینەوە و گفتوگۆمان دەکرد لەسەر چۆنیەتی چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوک.رۆژێک لە رۆژان دەربارەی کەرکوک بە هیچ جۆرێک "بەرهەم" قسەی تێدا نەکرد.

لە لایەن بەریتانیا و ئەمریکا وە ئاگاداری "بەرهەم"یان کرد بوو کە ئەوە بڕیار و فەرمانە، لێکۆڵینەوە و قسە لەسەر کردن دەربارەی ناوچە دابڕاوەکان "کەرکوک"،خەتی سورە.

ئیمڕۆ زۆرینەی شەقامی کوردی ماهیەتی دوکتور بەرهەم ساڵح بەم جۆرە هەڵدەسەنگێنێت کە دەوری جیانەتکارانەی لە خودی شەخسی جەلال کەمتر نییە.مانەوەی لە گۆڕەپانی کوردستان بە پلەی ئێستاوە گەلی کورد بە گشتی لە سەران سەری کوردستانی گەورە دەورێکی رەش بینی دەبێت و زیانێکی گەورەی دەبێت لە ئێستاوە.

4/بنەماڵەی شێخانی بارزانی:

بەڕێز مەسعود بارزانی ئاگاداری و زانیاری تەواوی هەیە دەربارەی کۆبونەوەی دوو قۆڵییە داخراوە نهێنییەکەی نێوان مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حسێن کە لە 12-13ی کانوونی دووهەمی ساڵی 1970 رێکەوتن و ئەوە بوو بەیانی 11ی ئازاری لێکەوتەوە.

دوای 5 ساڵ بە سەر رووخانی دیکتاتۆر سەدام حسێن ئەوە بوو سەردانی شاری کەرکووکی کرد. ئەمە دواجارە خیانەتەکەی 31ی ئابی ساڵی 1996 کە سەردانی کەرکووکی کرد بە هێلکە و تەماتە پێشوازییان لێکرد.

ئینجا کە لە ساڵی 2008 سەردانی شاری کەرکوکم کرد بە تەواوەتی دڵنیا بوو و گەیشتە ئەو باوەرە کە لە سەران سەری جیهاندا هیچ ئاگاداری و زانیاری و دیکومێنتێک نییە دەربارەی رێکەوتنە دووقۆڵییەکەی مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حوسەین نییە.

خوشک و برا ئازیزەکانم: خودای مەزن هەرگیز زوڵم و ناحەق قەبوڵ ناکات وپەتی درەوو کورتە هەر ئەبێت راستیەکان ئاشکرا بێت زوو یا درەنگ.هەڤاڵی دڵسوز و هاورێی منداڵی کاکە جەمیلی سەبری بەگ، تەلەفونی بو کردم وتی: ئەم هەواڵە گرنگە بنوسە ." بە پێی دیکومێنتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە لە 1970/12/12 نوسراوە لە لایەنباڵوێزخانەی بەریتانیا لە تاران بو وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی ناردوە،مەلا مستەفا بارزانی لە بەرامبەر رێکەوتنامەی 11 ئازاردا پارەیەکی زوری وەرگرتوە و دەستبەرداری ئاڵا و داهاتی کوردستان لە بەشی نەوتی عێراق بووە.ژمارەی دیکومێنتەکە( 17/1236 )یە.

هەروەها بە پێی بەڵگەنامەکەی یەکێتی سوڤیەت هاتوە: بو رازیکردنی بارزانی بەم رێکەوتنامەیە پارەیەکی زوری دراوە بە بارزانی...

ئەم دیکومێنتە لە ساڵی 2009 وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و زورینەی روژنامەکانی جیهانی بڵاویان کردەوە.

ئەم بەڵگەیە ئەوەندە بە نرخ و گرنگە لە کرین نایە و نرخی نییە چونکی ماهیەتی بنەماڵەی بارزانی بە تەواوەتی ئاشکرا و روندەکاتەوە کە ئەوانە کێن.(لە پاشکوی ژمارە 9 )

هیچ هەڵوێستێکی نەتەوایەتیان نییە،خودفروش و سوک و نزم و بێ شەرمن و دوژمنی کورد و کوردستانن،هاوکاریتان کرد شان بە شانی سوپای داگیرکەران هەریەک لە کوماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا و حکومەتی سەدام حوسەین،دژی دامەزراندی حکومەتی کوردین.لەپێناو سەروەت و سامان و بەرژەوەندی تایبەتی خودی خوتان،ئاڵا و ژێرخانی گەنجینەی کوردستان بفروشن بە هەریەک لە حکومەتی بەریتانیا و حکومەتی سەدام حوسەین،بەدەستی خوتان گورتان بو خوتان هەڵکەند بە پێی هەموو یاسایەکی جیهانی چونکی سزای ئاڵا و نیشتمان فروشتن لە سێدارەدانە.

عوبەید و لوقمانی مەلا مستەفای بارزانی و خانەوادەیان لە شاری بەغداد ئەوە ناونیشانیان بوو " بەغداد- اعظمیە-راغبە خاتون" دراوسێ بوین و پەیوەندی خانەوادەیی و هاتوچوی یەکتری بەردەوامان هەبوو کە بارزانی گەرایەوە پەیوەندیەکەمان بە هێزتر بوو.

وە لاکاتی خوی ئەو دوو بەرێزانە " عوبەیدوڵە و لوقمان ئاگادایان کردم کە کاتێک دەست بەسەر بوون لە زەمانی حوکمی پادشای هەریەک لە خانەوادەی مەلا مستەفا بارزانی موچەی مانگانەیان مقداری حەوت دینار و 500 فلس بوو.موچەی مانگانەی پولیس یان فەراشی حاکمیش ئەومقدارە بوو.یەکێک لەو خانەوادەیە هاوسەری بارزانی دووەم،بەرێز حمایل خانی دایکی مەسعود بارزانی سەروکی هەرێمی کوردستان موچەی خانەنشینی (دیقەت دیقەت) مقداری 108 دەفتەر دولار مانگانە وەردەگرێت، کە دەکاتە یاک ملیون و هەشتاد هەزار دولار. مانگانەی بەندە سەدوهەشتاد دولار بوو.بەداخەوە مام جەلال ئەوشی بری.ئەگەر مابایە دەم خستە سەر حسابی حمایل خان موچەکەی سێ جار لە مانگانەی سەروک ئوباما زورترە ساڵانە.بەرێز بایز تاڵەبانی وەزیری دارایی هەرێمی کوردستان دەڵێت : من نازانم مانگانەی سەروک هەرێمی کوردستان چەندە؟ جێی سەرسورمان نییە چونکی موچەی هەموو هەرێمی کوردستان لە بانکەکانی جیهانی دایانناوە،کە راپەرینە کە دەستی پێکرد و رایان کرد ئەوکاتە بازرگانیەتی پێوە دەکەن.هەروەکو راپەرینەکەی ساڵی 1991،لەم ماوەیە ئاشکرا بوو،موچەی مانگانەی مەسعود بارزانی مقداری 400 هەزار دولارە.

وەزیری نەوت و گاز بەرێز ئاشتی هەورامی دەڵێت: من هیچ ئاگادارێکم نییە لەو کرین و فروشتنانە و گرێبەستانەی کە نەوچیروان ئیدریس بارزانی لە گەڵ کومپانیەکانی جیهانی کرویانە.

راست ناکات درودەکات ئەو گەندەڵیە ئاشکرا کە لەگەڵ کومپانیەکانی نەرویجی بەناوی D.N.O کردویانە.

بەندەش دەڵێم بەرێز وەزیری نەوتی هەرێمی کوردستان بنەماڵەی شێخانی بارزانی چەندە ساڵ هەموو رێگاێکیان گرتوتە بەر کە چلون سەروەت و سامان کو بکەنەوە.لە بانکەکانی سویسرا و ئەمریکا و تورکیا و هتد.

ئینجا کە لە ساڵی 2008 سەردانی شاری کەرکوکم کرد بە تەواوەتی دڵنیا بوو و گەیشتە ئەو باوەڕە کە لە سەران سەری جیهاندا هیچ ئاگاداری و زانیاری و دیکومێنتێک نییە دەربارەی ڕێکەوتنە دووقۆڵییەکەی مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حوسەین نییە.

خوشک و برا ئازیزەکانم: خودای مەزن هەرگیز زوڵم و ناهەق قەبوڵ ناکات وپەتی درووی کورتە هەر ئەبێت ڕاستیەکان ئاشکرا بێت زوو یا درەنگ.هەڤاڵی دڵسۆز و هاوڕێی منداڵی کاکە جەمیلی سەبری بەگ، تەلەفونی بۆ کردم وتی: ئەم هەواڵە گرنگە بنوسە ." بە پێی دیکومێنتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە لە 1970/12/12 نوسراوە لە لایەنباڵوێزخانەی بەریتانیا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی ناردوە،مەلا مستەفا بارزانی لە بەرامبەر ڕێکەوتنامەی 11 ئازاردا پارەیەکی زۆری وەرگرتوە و دەستبەرداری ئاڵا و داهاتی کوردستان لە بەشی نەوتی عێراق بووە.ژمارەی دیکومێنتەکە( 17/1236 )یە.

هەروەها بە پێی بەڵگەنامەکەی یەکێتی سوڤیات هاتوە: بۆ ڕازیکردنی بارزانی بەم ڕێکەوتنامەیە پارەیەکی زۆری دراوە بە بارزانی...

ئەم دیکومێنتە لە ساڵی 2009 وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و زۆربەی ڕۆژنامەکانی جیهانی بڵاویان کردەوە.

ئەم بەڵگەیە ئەوەندە بە نرخ و گرنگە لە کڕین نایە و نرخی نییە چونکی ماهیەتی بنەماڵەی بارزانی بە تەواوەتی ئاشکرا و ڕوندەکاتەوە کە ئەوانە کێن.(لە پاشکۆی ژمارە 9 )

هیچ هەڵوێستێکی نەتەوایەتیان نییە،خودفرۆش و سوک و نزم و بێ شەرمن و دوژمنی کورد و کوردستانن،هاوکاریتان کرد شان بە شانی سوپای داگیرکەران هەریەک لە کوماری ئیسلامی ئێران و حکومەتی تورکیا و حکومەتی سەدام حوسەین،دژی دامەزراندی حکومەتی کوردین.لەپێناو سەروەت و سامان و بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆتان،ئاڵا و ژێرخانی گەنجینەی کوردستان بفرۆشن بە هەریەک لە حکومەتی بەریتانیا و حکومەتی سەدام حوسەین،بەدەستی خۆتان گۆرتان بۆ خۆتان هەڵکەند بە پێی هەموو یاسایەکی جیهانی جونکی سزای ئاڵا و نیشتمان فرۆشتن لە سێدارەدانە.

عوبەید و لوقمانی مەلا مستەفای بارزانی و خانەوادەیان لە شاری بەغداد ئەوە ناونیشانیان بوو " بەغداد- اعظمیە-راغبە خاتون" دراوسێ بوین و پەیوەندی خانەوادەیی و هاتوچۆی یەکتری بەردەوامان هەبوو کە بارزانی گەڕایەوە پەیوەندیەکەمان بە هێزتر بوو.

وە لاکاتی خۆی ئەو دوو بەڕێزانە " عوبەیدوڵڵا و لوقمان ئاگاداریان کردم کە کاتێک دەست بەسەر بوون لە زەمانی حوکمی پادشای هەریەک لە خانەوادەی مەلا مستەفا بارزانی موچەی مانگانەیان مقداری حەوت دینار و 500 فلس بوو.موچەی مانگانەی پۆلیس یان فەراشی حاکمیش ئەوەمقدارە بوو.یەکێک لەو خانەوادەیە هاوسەری بارزانی دووەم،بەڕێز حمایل خانی دایکی مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان موچەی خانەنشینی (دیقەت دیقەت) مقداری 108 دەفتەر دولار مانگانە وەردەگرێت، کە دەکاتە یاک ملیون و هەشتاد هەزار دولار. مانگانەی بەندە سەدوهەشتاد دولار بوو.بەداخەوە مام جەلال ئەوەشی بڕی.ئەگەر مایەیە دەم خستە سەر حسابی حمایل خان موچەکەی سێ جار لە مانگانەی سەرۆک ئوباما زورترە ساڵانە.بەڕێز بایز تاڵەبانی وەزیری دارایی هەرێمی کوردستان دەڵێت : من نازانم مانگانەی سەرۆک هەرێمی کوردستان چەندە؟ جێی سەرسوڕمان نییە چونکی موچەی هەموو هەرێمی کوردستان لە بانکەکانی جیهانی دایانناوە،کە ڕاپەڕینە کە دەستی پێکرد و ڕایان کرد ئەوکاتە بازرگانیەتی پێوە دەکەن.هەروەکو ڕاپەڕینەکەی ساڵی 1991،لەم ماوەیە ئاشکرا بوو،موچەی مانگانەی مەسعود بارزانی مقداری 400 هەزار دولارە.

وەزیری نەوت و گاز بەڕێز ئاشتی هەورامی دەڵێت: من هیچ ئاگادارێکم نییە لەو کڕین و فرۆشتنانە و گرێبەستانەی کە نەوچیروان ئیدریس بارزانی لە گەڵ کومپانیەکانی جیهانی کرویانە.

ڕاست ناکات درۆدەکات ئەو گەندەڵیە ئاشکرا کە لەگەڵ کومپانیەکانی نەرویجی بەناوی D.N.O کردویانە.

بەندەش دەڵێم بەڕێز وەزیری نەوتی هەرێمی کوردستان بنەماڵەی شێخانی بارزانی چەندە ساڵ هەموو ڕێگایێکیان گرتوەتە بەر کە چلۆن سەروەت و سامان کۆ بکەنەوە.لە بانکەکانی سویسرا و ئەمریکا و تورکیا و هتد.

برای بەڕێز فەرمیدون دانیشوەر فەیزوڵڵە بیگی ڕەوشنبیر و نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەداری ناسراو جەنابی زانیاری و شارەزایەکی زۆری هەیە دەربارەی نەوت و گاز.بەردەوام دەربارەی نەوت و گازی کوردستان لە پێناو بەرژەوەندی سەروەت و سامانی کورد و کوردستان بەشێکی زۆر لەو گەندەڵیەی کە هەرێمی کوردستان بە ڕاشکاوی ئەنجامیدەدا بڵاوی دەکاتەوە.

هەڤاڵی بەڕێز دەربارەی نەوت و گاز ئەمەی بۆ ئاراستە کردووم لەبەر گرنگی دەقی خۆی لە پاشکۆی کتێبەکەم ئاماژەم پێداوە کە بەم ناونیشانە بڵاوی کردوەتەوە.(مافی بەرهەم هێنانی نەوت و گازی کوردستان،کام سەربەستی؟) بۆ ئاگاداری دەقی ئامۆژگاریەکانی کاک فەرمیدون دانیشوەر لە پاشکۆی کتێبەکە ژمارە ( 3 ) ئەخوێننەوە.

خوێنەری هێژا!

کە دەستت بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە کرد ڕەنگە توانجم تێبگریت، وا هەست دەکەیت کە دوای ئەوەی هاتمە وڵاتی سوید پاڵم داوەتەوە و لە کەش و هەوایەکی ئازاد و دیمۆکراتیدا ئینجا دەستم بە نووسینی کتێبی شەشەم کردووە کە لەبەردەستایە.

بەندە ڕەفیق پشدەری خزمەتکاری کورد و کوردستان دوای ڕووخانی ڕژێم بە ماوەیەکی کورت کەوتمە شک و گومان بەرانبەر بە بەڕێزان تاڵەبانی و مەسعوود بارزانی کە کەمتەرخەمییان کرد . هیچ هەنگاوێکیان نەنا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد ، ئەوە بوو وردەوردە شەقامی کوردییان خەفەکرد گەیشتمە ئەوەی ڕەشبینبم بەرامبەریان!

لەسەرەتای ساڵی 2004 هەڵوێست و بیرو بۆ چونی خۆم . ئەوە بوو سەفەری بەغدادم کرد ، سەردانی هەریەک لە کەناڵی ( جزیرە ) و ( العربیە ) و کەناڵێکی لوبنانی کرد هەر یەکێکیان بۆ ماوەی چەند دەقیەیەک چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کردن وە هەر چوار کتێبەکەم لە بەردەست دانان کاتی چاو پێکەوتنیان بۆ دانام کە گەڕامەوە لایان وتیان ئامادەنین لە گەڵتا وتو وێژ بکەین چونکە ئەم بابەتانە ترسناکن و لە گەڵ سیاسەتی عرەب و عێراق ناگونجێ دوا جار کەناڵە لوبنانییەکە لە بەرچاوی خۆم پەیوەندی بە بەڕێوەبەرایەتیەکەیانەوە کرد هەوڵێکی زۆری دا بەداخەوە ڕازی نەبوون پرسیارم لێکرد بەڕێزتان ناوتان چییە ئەوەندە هەوڵ دەدەن لە گەڵ من ئەم دیدارەم لەگەڵ بکەن وتی : ناوم ئیبراهیمە ..وتم تۆ کام ئیبراهیمی جولەکە و عەرەب و کورد هەر یەک دەڵێن ئیبراهم لە ئێمەیە ، وتی من لە کوردەکەم وەحەز بەدیداری ( بێتواتە ) زۆر دەکەم ئەم کتێبەی تۆ دوجارم خوێندەوە زۆرم بە دڵ بوو سەرنجی ڕاکێشام .

بەندە بە هۆی هاوڕێیەکی مەسیحی خاوەن میوان خانەی ( گەرمە ) لە گەڵ کەناڵێکی ئەمریکی دیدارم کرد ، ئەوە بوو سێ جار کۆبونەوەمان کرد ڕێککەوتین کە بگوزرێمەوە بۆ میوان خانەکە چەند ڕۆژێک بمێنمەوە.

بە ڕێکەوت چاوم بە کەسایەتییەکی کوردی نیشتمان پەروەر مامۆستا ( کەماڵ محێدین ) کەوت بەدوور و درێژی بۆ گێڕایەوە ؛

بەڕێوەبەری کەناڵەکە میستەر (مایکڵ ) سەری سوڕما لە من وتی من بەشی هەرە زۆری سەرکردەکانی عێراق چاوپێکەتتم لە گەڵدا کردون لە کورد و عەرەب ، هەڵوێست و بیرو بۆ چونی تۆ جیاوازییەکی زۆری هەیە بە تایبەتی لە گەڵ تاڵەبانی و بەرزانی وە چۆنیەتی چارسەر کردنی کێشەی کورد ، وتی من مرۆڤێکی ئەمریکیم ناوم مایکڵە ئەمە یەکەم جارە ڕوو بە ڕوو کوردێکی عێراق باوەڕم پێبێنی کە ئەمریکا سەکەوتنی بەدەست نەهێنا وەک و تۆ بەڵگەکانت ننشان دا من ئەو بەڵگانەم لانەبو بە پێویستی دەزانم ئێمە دیدارێکی تەلەفزیۆنی بکەین یەکێکیان خودی خۆم یەکێکیان عەرەبێکی عێراقی.

مامۆستا کەماڵ محێدین وتی : مام جەلال بە هیچ جۆرێک ڕازی نییە ئەو چاوپێکەوتنە بکەیت نەبێت یەکسەر بگەڕێتەوە سلیمانی لەبەر بێدەسەڵاتی ناچار بووم فەرمانەکەی مام جەلال جێبەجێبکەم ئینجا لەسلێمانی لە گەڵ دووسەر نووسەری ڕۆژنامە هەر یەک بەتەنها وتووێژم لەگەڵدا کردن دەربارەی بارو دۆخی ئەو ڕۆژە هیچ یەکێکیان ئامادەگییان تێدا نەبوو کە هەڵوێست و بیر و بۆ چونی من بڵاو بکەنەوە . هەرچەندە ئێستاکە دەورێکی سەرەکییان هەیە دەربارەی ئەوبارودۆخە بە ڕاشکاوی باس ئەو گەندەڵیە دەکەن،وتوشی گەلێک کێشە هاتوون بە تایبەتی لەگەڵ خودی جەلال تاڵەبانی. ئنجا ویستم سکاڵا تۆمارکەم لەسەر ( سەدام حسێن ) ، لەشاری سلێمانی نووسینگەیەکی تایبەتی کرابووە بۆ هەر مرۆڤێکی سکاڵا تۆماربکات دژی ڕژێمی بەعس و سەدام حسین ..دوای پانزە ڕۆژ کەزانیم نایانەوێت من سکاڵا تۆمار بکەم لەسەر سەدام

حسێن ، چوونکی مام جەلال رازی نەبوو. ئەوە بو سەفەری بەغدام کرد لە بەرواری 2005/2/1 بە هۆی هەڵاڵێکی نیشتمان پەروەر ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کە لە ساڵی 1978 لە بەندیخانەی ئەبوغرێب بووین ..بەرێزپەرویزجاف ئێستاکە دادوەرە لە بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی تاوانباران رژێمی بەعس و سەدام ...

ئەم هەڤاڵە کارەکانی زۆر بۆ ئاسان کردم ئاگاداری کردم کە بەڕێوەبەری دادوەران کاتیان بۆ داناویت لە 2005/2/5

لەبەرئەوەی هاسان نییە بگەیتە ناوچەی سەوز (حي خضراء ) ناوت لە پرسگا ئامازە پێدراوە من خۆشم دێم لە شوێنی دیاری کراو هەڵت دەگرم بە یەکەوە دەچین ..

لە بەرواری 2/5/ 2005 چاوم کەوت بە دادوەرانی لێکۆڵینەوە چوار دادوەر دانیشتبوون پێشەکی ناوت، ووتم ،رەفیق مامە سادق ناسراوم بە رەفیق پشدەری ماوەی نیو سەعات یەکێک لەو دادوەرانە هەر تەماشای کۆمپیتەری دەکرد ئەوجا تەماشای یەکتریان کرد و ووتی ؛ ( و الله حليب ابيض ) ..ووتیان سکاڵایەک بە دەست و خەتی خۆت بنووسە بۆمان بنوسە.

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ دادگای توانبارانی تایبەتی سەدام حسین

بابەت / سکاڵا

بەندە کە لە خوارەوە ئیمزام کردووە ناوم رەفیق مامە سادق کە ناسراوم بە رەفیق پشدەری کێشەکەم داستانێکە لە گەڵ خودی سەدام حسێن دا سیاسییە بەفەرمانی لە 1976/9/14گیرام .بە شێوەیەک ئازارو ئەشکەنجە درام تەنها ئاژەڵ بەم جۆرە رەفتاری لە گەڵ دەکەن.

لەگەڵ رێزدا

هاووڵاتی / رەفیق مامە سادق

2005/2/5

یەکەم ناسیاویم
لە 17 / 7 /1968چومە کۆشکی کۆماری داوام کرد دیداری سەرۆک کۆمار ( احمد حسن بكر ) بکەم ، وتیان ناتوانی چونکە کۆبوونەوەیان هەیە ، ووتم نوسراوێکم پێیە لە مامۆستا ( ئیبراهیم ئەحمەد ) وە ، ووتیان نامەکەمان پێبدە ووتم نامەکە شەفاییە ووتیان چییە ! ووتم : ئێوە هاتوون بە ئاگر و ئاسن کێشەی کورد چارسەر بکەن یا بە ئەقڵ و حیکمەت کێشەی کورد یەک لاییبکەنەوە ووتی ؛ تۆ کێیت ..وتم من رەفیق پشدەریم کادرێکی باڵی مەکتەبی سیاسیم، جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد. وتی منیش رائد ( تەها رەمەزانم ) .. لە ساڵی 1973 ئاگاداریان کردم کە جێگری سەرۆک کۆمار سەدام حسێن کاتی بۆ داناوم بۆ چاو پێکەوتن ...

لە بەرگی ل ئامازە پێداوە.

لە 1976/9/11دیداری سەدامم کرد لە سەعات 10ی بەیانی، لە سەر داواکردنی خۆی .. دیسان ئەمەشم لە بەرگی 1 ل 101 ئامازەی پێدراوە

لە 1976/9/14بەڕێوەبەری ئاسایش کەرتی 3 داوای لێکردم بەڕێوە بەری ئاسایشی گشتی داوات دەکات کە چووم دەستگیریان کردم لە سەعات 11:40 بەیانی.ئەمەش دووبارە لە بەرگی 1 ل 102 ئامازەی پێدراوە ...

لە شەوی 1977/1/3/4گواسترامەوە بۆ نووسینگەیەکی هەواڵگری گشتی لە ناوچەی بە تاوین ..بڕوانە بەرگی 1 ل 119

دوای شەش مانگ 4 دادوەری لێکۆڵینەوەی هەواڵگری کە لە کۆبوونەوەکە تەواو بوو وتیان : تۆ بە فەرمانی خودی جێگری سەرۆک گیراوی شاهید و بەڵگە لە سەر تۆ هەیە ، جوان نییە لە گەڵ تۆ رێگای ئازار و ئەشکەنجە بگرین(بەرگی یەک لاپەرە 116 ) ، تکایە دان بە تاوانەکانتا بنێ وتم ؛ من تاوان بارنیم . (لە لاپەرەکانی دواتردا لەسەر ئەم باسە دەدوێم )

لە مانگی نیسانی 1978ئێمەیان برد بۆ دادگایی شۆرشی بەعس(بەرگی یەک ل 119) پرسیاریان لێکردین ناوتان چییە ؟ وەڵاممان دانەوە ، رەفیق مامە سادق شەفیق مامە سادق ...

ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ گرتوخانەی هەواڵگری .

لە مانگی مایسی 1978 ئێمەیان بردەوە بۆ هەمان دادگایی شاهید هات شەهادەتی لە سەرمان دا کەمن پەیوەندی راستە وخۆم بەبەرەگای بەرزانییەوە هە بووە بە شەخسی ( مەسعود بەرزانی ) وە شەفیقی برام دولامەی بە دەستی خۆی بردووە بۆ مەسعود بەرزانی شاهیدەکە ناوی ( حەبیب عبدالکریم فەیلی ) . سەرۆکی دادگا پرسیاری لێکردم ئەمە راستە وەڵامم دایەوە راست ناکات ، ئێمە یان گەڕاندەوە بۆ هەمان گرتوخانە .

لە پردا کەسێک لە کار بەدەستانی ئەوشوێنە هاتە لام و وتی نوسراوێکمان بۆ هاتووە وە وێنەیەکیش بۆ دادگا لە نوسینگەی شیمالەوە کە سەرۆکەکەی سەدام حسێن ە بۆ بۆ

دیاری کردوون لە سێدارە دانی تۆ وە شەفیقی برات پانزە ساڵ و نیو بەندی ..

وتم ؛ راکەم یا خۆم بکوژم وەڵامی دامەوە وتی من دەڵێم خۆت بکوژە راکە وتی ؛ ئەڵێم تۆ عاقڵی خۆت رزگارکە من سێ رۆژ لە سەرێەک بیرم کردەوە لە وە چۆن خۆم رزگارکەم قورعانێکم بە دەستەوە بوو لە گەڵیا هاوارم بۆ خوا دەبرد چۆن خۆم رزگار بکەم ، گەیشتمە ئەو باوەڕە خاڵی لاوازی سەدام ئەوەیە کە بەرامبەری راوەستی سکاڵاو پاڕانەوە و داوای لێبوردن نەکەی ..

رۆژێکیان دوو بە دوو لە گەڵ سەدام دا کۆبووینەوە تەنها سکرتێرەکەی ( نوری فەیسەڵ شاهین ) گوێرادێری قسەکانمان بوو ، باسی باروو دۆخی کوردم بۆ کرد وە باسی دیدارێکی خۆم و جەلال تاڵەبانیم بۆ کرد زۆر گرژ و نارەحەت بوو وتی ؛ ئێستا کاتم نییە گوێت لێبگرم من داوات دەکەمەوە من هەر بەردەوام لە قسەکردن وە جاری سێهەم سەدام وتی ؛ بڕۆ دەرێ ...

من وە ڵامم دایەوە لەم ژورە نە بەعس نە سوپای عێراقی نە تۆ ناتوانن لەم ژورە دەرمکەن تا قسەکانم تەواو نەکەم.

دوو سەعات و بیست دەقە من بەردەوام قسەم کرد ، لە سەرەتا سەدام پشتی تێکردم ووردە ووردە ڕوی وەرگێرایە بەرامبەرم دوو پەرداخ شیریخواردەوە تا من قسەکانم تواو کرد ..پاشان هەستام و بڕۆم

سەدام گووتی بۆ وا کتوپڕ دەڕۆی بۆ کوێ دەچی ؟ وتم ؛ دەچم بۆ شورتەی وشاش یا مەنسوور ئەڵێم بەندم بە ئەمری جێگر .

سەدام گوتی ؛ بۆ من دەڵێم بەند بە، وتم تۆ دەڵێی بڕۆ دەرێ وتی فەرموو دانیشە بابەکر ئاغا چی تۆیە ؟ وتم هیچی من نیە ..وتی ؛ بابەکر میراو دەلی ..بابەکر مەحموود ئاغا ..بابەکر پشدەری ...............

وتم ؛ من بە ئەسڵ خەڵکی کۆی سنجاقم باپیرم 150ساڵ پێش ئێستا هاتۆتە پشدەر ئێمە بنەماڵەیەکی کاسبین تەنها من سیاسیم خانەوادەیەکی سوقاقی نین خۆم خۆمم پێگەیاندوە بە ئازایاتی خۆم بوو بە ئامر بەتالێون نەک مەلا مستەفا کردبێتمی ..من سکاڵام پێشکەش بە تۆ نەکردبوو کە داوای کاری سیاسی لە گەڵ تۆ بکەم خۆت داوات کردبووم ببمە موستەساری تۆ ، سەدام وتی ؛ منیش لە بنەماڵەیەکی سوقاقی نیم باوکم پۆلیس بوو منیش خۆم خۆم پێگەیاند بە بازووی خۆم خۆم پێگەیاند ، من تۆ دەڵێی لە دایک و باوکێک بووین .هەڵسا ئەملا و ئەملای ماچ کردم .

من 27 رۆژ، رۆژی سێ جار لە گەڵ خۆمدا خۆم ئامادە دەکرد کە رۆژی دادگا بەرامبەر سەرۆک ئەم قسانە بکەم.

لە مانگی تەمووزی 1978 ئێمەیان بردەوە بۆ دادگای بەعس. سەرۆکی دادگا تاوانەکانی خوێندەوە لەسر حەوت بابەت بریاری لە سێدارەدانمی دەرکرد وە شەفیقی برام پانزە ساڵ و شەش مانگ ..من پەنجەم بەرز کردەوە ووتم حوکمەکەی تۆ سەرۆک کۆمار وجیگر نیمزای لە سەر ناکەن من ئامادەم دان بە هەموو توانەکانما بنیم بە مەرجێک دوای 48سەعاتیکە لە سێدارەم بدەن .نامەوێت کەس ببینم لە کەس و کارم من براکەم هێنایە ژورێکی کە دایان ئابین دوای دوو سەعا ت هێناییانەوە بەرامبەر سەرۆک دادگا راوەستاین. ووتم ؛ ئەم دانیشتنە داخراو بێت چونکە باسی نهێنی سەرکردایەتییەکە دەکەم تکایە تا قسەم تەواو نەبێت قسەم مەبڕە ئەوە بوو دوو سەعات بیست دەقە قسەم کرد سەرۆک دادگا ووتی معاشت لە وەزیر زۆرتر بوو تۆ ئازدار بوویت ئەو منداڵە جوانانەت هەیا بۆ ئەوەت هەڵبژارد بۆ خۆت ووتم چونکی لە ئەرشیفی سەدام مافی کوردی تیا نییە ، ووتی تۆ کادری جەلال و مەسعودی، دەستم خستە سەر چاوی راستم و ووتم ئەوە مەسعودە چاوی چەپیشم جەلالە ..ووتی ؛ ئەزانی حوکمەکەت چییە! ووتم دەزانم ئیعدامە . من شەفیقی برامیان هێنایەوە بۆ ژورێکی کە . ئینجا سێهەم جار ئێمەیان بردەوە ژوری دادگا ..بۆ جاری سێهەم سەرۆکی دادگا جارێکی کە تاوانەکانی خوێندەوە کردییە بیست ساڵ شەفیقی برام کرا بە 5 سال و نیو ئەمە یەکەم جارە لە مێژوی بەعس و سەدام لە یەک رۆژ کەسێک بە دوو شێوەی جیاواز حوکم بدرێت .وە سەدام وتبوی نابێ پیاوی ئازا لە سێدارە بدرێت .... ئەم باسە لە بەرگی 1 ل 120 بە درێژی دەخوێنینەوە لە بەرگی سێهەم..

بەفەرمانی سەدام ئازارو ئەشکەنجەیان دام ئینجا چاکیان کردمەوە رەوانەی دادگا کرام توانەکەی گۆری رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغریب کرام،کە سەدام حوسەین بوو بە سەرۆک کۆمار،دوای دوو رۆژ بە فەرمانی تایبەتی ئەو بەندە و کاکە شەفیقم ئازاد کراین...............

هۆی ئەوەی کە سکاڵام کرد لای ئێوە کاتی خۆی جەلال تاڵەبانی بڵاوی کردەوە کە ئەو مرۆڤەی سەدام ناردی بۆ تیرۆرکردنی من لێرە دەژێ خەڵک دەست بۆ م درێژ دەکا . جەلال راست ناکات درۆ دەڵێت ئەو بە منی ووت ؛ لە سرداواکردنی سوریەکان سەدام تیرۆر بکەم ،وەهەروەها 1976/9/11سەدام داوای لێکردم جەلال تاڵەبانی تیرۆر بکەم وەلامی سەدامم دایەوە کاتێک کە تۆ داوات لێکردم لە گەڵتا کاری سیاسی بکەم دوات لێنەکردم خەڵکت بۆ بکوژم .وەهەروەها ئەو نهێنییەی لە نێوان بەندە و مەسعود بەرزانیدا هە بوو بە ناوی ( بەیروت مارتینس ) تەنها من و ئەو ئەوەمان دەزانی ئەوانەی نامەکانی منیان دەبرد بۆ مەسعود هیچ یەکێک ئەم نهێنیەیان نەدەزانی تەنانەت کەماڵ و شەفیقی براشم . ئەندامانی دادوەرانی لێکۆڵینەوە ووتیان مەسعود دەهێنن ووتم مەسعود دەهێنن؟ دوای ئەوەی پرسیارو وەڵام و لێکۆڵینەوە لە گەڵ ڕێزدارە دادوەرەکان تەواو بوو،گوتیان دەقی قسەکانت کە ئاماژەت پێداوە لێرە ئێمە بە نوسین و کۆمپیوتەر تۆمارمان کردوە،بەڵام مەرجە ئەبێت هەر چوار کتێبەکەت بۆمان بهێنیت تاکو بەراوردیان بکەین،وە کتێبەکانت ئەبێتە دیکۆمێنتێک لێرە دەمێنێتەوە،ئەگەر داوا کرای لە دادگا کردنی سەدام حوسەین،وە کچەکات داوا دەکەین وەکو شاهیدە.ئەوە بوو گەڕامەوە سلێمانی و ئینجا هاتمەوە بەغداد،لە 2005/2/15 کتێبەکانم تەسلیم کردن و لە 2005/2/21 بە دیداریان شاد بومەوە.وتیان ئەوچالاکیە و فیداکارییەی کە ئەنجامت داوە لە پێناوی بەرژەوەندی عێراق، بە تایبەتی گەلی کورد ،بەردەوام ژیانت کەوتوەتە ترسناک.بەم شێوەیەش خۆراگر بویت ،هۆی ئەوەیە دۆست و دوژمن ڕێزیان لێگرتویت، وە بە پلەی 180 دەرەجە گۆرابوون بەرانبەرم...پێیان وتم چیت بۆ بکەین ووتم تەنها ئەو فایلەی کە لە دادگای بەعس قسەکانم تیا تۆمار کراوە بگەڕێتەوە دەستم بۆیە ئەم نوسراوەی لای خوارەوەیان بۆ کردم.....

بسم الله الرحمن الرحيم

المحكمه الجنائيه المختصه

العدد فق /103

التاريخ / 21/ 2 /2005

وێنەی ئەم دیکۆمێنتە لە پاشکۆی ژمارە 2 هەیە کە لە 18 /7 /2001ناردم بۆ سەدام بە ئیمایلی عودەی کوڕیەوە

زۆر خۆشحاڵ بوون بە ناسینم ووتیان دادوەرانی لێکۆڵینەوەی سەدام هەموو حەز بە دیدارت دەکەن کە چووم پێشوازییەکی سەیریان لێکردم تەماشام کردن چوار کوردم ناسی ئەوانیش بەڕێز پەرویز جاف .. ناژم حەویزی ..رووف رشید ..رزگار ئەمین ...

مامۆستای نیشتمانپەروەر کاکەعبدالخالق حەویزی بە کوردی ووتی ؛ کتێبەکانت دەبوو دوای بیست ساڵی تر بڵاوت بکردایەتەوە .

سەرۆکی دادوەران ووتی ؛چوار رۆژە چاوەڕوانی ئەوە دەکەین ئەو کەسایەتییە گفتوگۆی لە گەڵدا بکەین چونکە تۆ ئازاترین کەس بوویت بەرامبەر سادام رابوەستیت گەر چوارکەس بەتەنهایی بچنە بەردەمی سەدام یەکێکیان تۆ دەبیت، ووتم من ئەوەم پێخۆشە ..گەر سەدام بە قسەی منی کردبایە نە ئێوە نە علاوی نە ئەمریکا نە جەلال تاڵەبانی لە بەغدا نە دەبون ..پرسیاری لێکردم گووتی کێ لە بنەماڵەی ئێوە تەمەنی زۆر بووە ووتم باپیرم ووتی چەند ژیا ووتم 107ساڵ ووتی ئینشاالله 1127 ساڵ دەژیت ..

*پەرویز جاف / بەیەکەوە سەردانی د . فواد معسومان کرد کاک فواد پرسی ئەم زاتە کلیە خۆی پێناساند دوای پانزە رۆژ پەروێز تیرۆرکرا . بە ئەمری مەسعود بەرزانی چونکە رزگار ئەمین ئەم خەبەرەی گەیاندبو کە پەروێز منی گەیاندۆتە ئەوێ .

*رووف رشید /نیشتمان پەروەرێکی خۆ راگر بەرامبەر دوژمن راوەستا

* رزگار ئەمین / کەسێکی ترسنۆک ئەوە بوو لەدادگایی سەدام پاشگەزی کرد

خوێنەری هێژا ..

دوای ئەوەی ڕام کرد لە هەولێر ساڵی 1999 هاتمە شاری سلێمانی نشتەجێ بووم بەم جۆرە ژیانم دەبردە سەر ئاگادارییەکی تەواوی خۆم بووم پەیوەندیم لە گەڵ هاووڵاتیان ئەما لە بۆنە خۆش و ناخۆشەکاندا .

بەبۆنەی ئەوەکەم زەردەشت دکتۆر حمە رووف کە چرای جەماڵی حەمەی علی نیشان کردبوو بە خاوو خێزانەوە وە روبار و بازیان و رەوەز بۆ نان خواردنی ئێوارە بانگهێشت کرا بوون ئامادە بووان نۆزدە کەس بووین .( ناوەکان لە پاشکۆی ژمارە 3 هەن )

لەبارو دۆخێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی بە کۆمەڵ بە باوک و کچ و نەوە لە دەوری سفرەیەکی رازاوە دانیشتبووین ..لە ناکاو دووتەقەی دەمانچە و ناڵەیەکی گەورە ماڵەکەی لەرزاند هاڕەی پەنجەرە تێکەڵ بە دووکەڵ و هاتو هاواری ئامادە بووان بوو بار ودۆخی دانیشتنەکە لە وپەڕی شادییەوە گۆڕا بۆ ئەو پەڕی ترس و دڵە راوکێ .

هەر هەموو دراوسێکانمان هاتن بە هاوارمانەوە پاشان ئاسایش وپۆلیس هاتن کاتی روداوەکە سەعات نۆ و نیوی شەوی 2005/6/4بوو.ئەم روداوە لەو رۆژەدابوو کە پەرلەمانی کوردستان کۆبونەوەی هەبوو، بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بەرزانی وە نێچیرفان بەرزانی ووتاریان لە سەر دیمکراتی و فیدراڵ پێشکەش کرد.

لە بەرواری 2005/6/5،6،7 سکاڵای خۆم لە سەر خودی مەسعود ونێچیرفان تۆمار کرد لە لای .

ا/ دادوەری لێکۆلینەوەی ئاسایش لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی سلێمانی پرسیار ولێکۆڵینەوەی زۆریان لە گەڵ کردم بۆم روون کردنەوە کە دیکۆمێنتم هەیە کە ئەمە چوارەم جارە بە فەرمانی بنەماڵەی شێخانی بارزانی هەوڵی تیرۆر کردنم ئەدەن .

( عمید حەسەن نوری ) بەئامادە بوونی چەند لێپرسراوێکی ئاسایش ماوەی دوو سەعات لێکۆڵینەوەی لە گەڵ کردم کە هۆی چییە بنە ماڵەی بەرزانی دەیانەوێ تیرۆرت کەن . وەڵاممدانەوە چوار کتێبم بڵاو کردۆتەوە بە ناوی کورد دژمنی

خۆت بناسە بەشی زۆری خوروقاتی ئەوانم بڵاو کردۆتەوە وەکە لە 2005/2/15سکاڵام تۆمار کرد لە سەر سەدام باسی ئەو هاتە پێشی بەڕێوەبەری دادگای تاوانبارانووتی ؛

مەسعود بەرزانی دێنین بۆ ئێرە .

ب/ دادوەری لێکۆڵینەوەی سلێمانی مامۆستایان ( رزگار و عومەر ) پرسیاریان لێکردم رەفیق دەتەوێت فەرمانی گرتن دەرکەین لە سەر مەلیکی کوردستان .

ج / لە کەرتی پۆلیسی رزگاری لە سلێمانی سکاڵام تۆمار کرد . پاشکۆی ژمارە 4

لە بارودۆخێکی ناهەموار ژیانم دەبردە سەر شەوان لەماڵی خزم و برادەران دەنوستم بە رۆژ دەهاتمە ماڵەوە .

پەیوەندیم لە گەڵ سکرتێرەکەی پاڤێل جەلال تاڵەبانی کرد وتم ئەم پەیامەم پاڤێل بگەیەنێ بە مام ، لە 2005/6/4 بەڕێزان مام و مەسعود لە پەرلەمانی کوردستان وتاریان ئاراستەی گەلی کورد کرد لە سەر دیمکراتی و فیدراڵی شەوەکەی خەڵکیان نارد بۆ تیرۆر کردنی من .

پەیوەندیم بە کاک عادل سکرتێری هێرۆ ی ییراهیم ئەحمەد کرد تکایە ئاگاداری هێرۆ بکەن .

شەوی 2005/6/8 کاک عادل پەیوەندی پێوە کردم ووتی ؛ ئێستا دێین بۆ ماڵەوە

ئەو کاتە لەماڵی حەسەنی برام بووم ووتم دوای ماوەیەکی دی دەگەمەوە ماڵەوە . عادل سەردانی کردم لە سەر بڕیاری هێرۆخان شەش پێشمەرگەی تایبەتی ئاگاداریت دەکەن.

سێژمە خواردنی خۆتان و پێشمەرگەکان دەنێرین .

2005/6/6.ئاژانسی هەواڵ لە کوردستان ئەم هەواڵەی بڵاو کردەوە(پاشکۆی ژمارە 6). رۆژنامەی پارێزگاران ژمارە 97 لە 2005/6/7 بڵاویلکردەوە .(پاشکۆی ژمارە 7)

رۆژنامەی هاوڵاتی. رۆژی چوار شەممە 15 /2005/6 دەنوسێ :شەش پێشمەرگەی سکرتارێتی یەکێتی پاسەوانی ماڵی رەفیق پشدەری دەکەن ..دوای ئەوەی لە لایەن چەند کەسێکی نەناسراوە هێرش کرایە سەرماڵی رەفیق پشدەری(پاشکۆی ژمارە 8) .

لەسەعات پانزەی بەیانی رۆژی 2005/6/7 پەیوەندیم پێوە کرا ووتی دەمەوێت سەردانت بکەم بە تێشێکی تایبەتی بە مەرجێک توشی هیچ کێشەیەک نەبم ،گفتمدایە

دوو بە دوو دانیشتین ووتی سەرۆک بەرزانی بۆ لای تۆ ناردومی ئەم بابەتەت پێرابگەیەنم وویستی نوسراوێکت ئاراستە بکات بەڵام مەترسی ئەوەی بوو دەست جەلال و هێرۆ بکەوێت من روو بەروو ئاگادارت دەکەم بە پیلانی جەلال و هێرۆ کراوە بۆ ئەوەی کاک رەفیق رکی لە ماڵی ئێمە بێتەوە .

وەجاری دووەم هەڤاڵی بەڕێز لە 2005/8/20 هاتەوە لام بۆ ماوەی یەک کات ژمێر بە دوور ودرێژی قسەی کرد بەڵگەی زۆری هێنایەوە کە سەرۆک ئاگادار نییە .

ئەو دووکۆبونەوەیەی کردیان لە گەڵ من بەناوی سەرۆکەوە دەقی قسەکانی ئاگاداری هێرۆ خانم کرد بە نوسراوێک .

ماوەیەکی دوورو درێژ چاوەروانم دەکرد کە مام جەلال پارمەتیم بدات بە ئاسانی بگەمە ئەوروپا .

لە مانگی 2005/9 لە وەڵامدا بەهۆی برادەرێکەوە ئاگاداری کردم رەفیق بچێتە دەرەوە قسە دەکات ئینجا من زانیم دەست بەسەرم هەوڵی هاتنە دەرەوەم دا خەڵکانێک پارمەتیان دام لە 2005/11/9 هاتمە دەرێ لە بەغداد . گەیشتمە عەمان

شۆفێری ئوتۆمبیلەکە منی بردە بەر میوان خانەیەک ووتی ئەوە پێنج ئەستێرەیە جێگەی پیاوانی دەوڵەمەندە ووتم من نووسەرم یەو جل و بەرگەی لە بەرمدایە دیاری خەڵکە من ببە بۆ میوان خانەیەک شەوی لە 50دۆلار زیاتر نەبێت . پەیوەندیم بە هاوسەرەکەم کرد ووتم من بەسەلامەتی گەیشتم ، دوای نیو سەعات ئافرەتێک خۆی تەقاندەوە 70 کەسی کوشت نزیکەی 200 زامدار هەبوو خۆشبەختانە من لە وێ دانەبەزی بووم .

لەمانگی 9ی ساڵی 2005 ئاگاداریان کردم کە لێپرسراوێکی گەورەی ئەمریکی لە ئەمریکاوە هاتووە سەردانم دەکات. بە گەرمییەوە پێشوازی و بەخێرهاتنم کرد، دەربارەی هاتنی حاڵی بووم کە دەیەوێت لە ماهیەتی بەندە لە هەڵوێست و بیر و بۆچوون و نەخشە و پلان و پرۆگرام و ئامۆژگاریم بزانێ و لە چی کە لە هەگبەمدایە ئاگادار بێ و شارەزایی و زانیاری تەواوی هەبێت.

دەقی کۆبوونەوەکە بە کورتی خاڵە گرینگەکان لە خوارەوە ئاماژە پێدەدەم. بەندە بە دوور و درێژی دەربارەی بار و دۆخی دەڤەرەکە بە گشتی بۆم هەڵسەنگاند ئینجا بۆم روون کردەوە دەربارەی چۆنیەتی چارەسەر کردنی هەموو ئەو کێشانەی کە رووبەرووی ئەمریکا بۆتەوە و ئامۆژگارییەکانم پێدا.

بە پلەی یەکەم سەرچاوەی هەموو ئاژاوەکان کە بەرپا بووە بە ئاشکرا و نهێنی کۆماری ئیسلامی ئێرانە.

ئێران بە گشتی پێکهاتووە لەم نەتەوانەی خوارەوە:
فارس، ئازەری، کورد بەلووچ و عەرەب
ئێمڕۆ حوکم و دەسەڵات بە تەواوەتی بەدەست نەتەوەی فارسە. پرۆگرام و ستراتیژییان ئاشکرایە کە دژی ئاشتی، ئاسایش و ئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤە. هەروەکوو رژێمی حیزبی بەعستان رووخاند ئەو هێرشە بۆ سەر کۆماری ئیسلامی ئێران بایە سوود بەخش دەبوو.

ئێمڕۆ بە دەسەڵاتترین حکومەت لە سەرانسەری جیهان "ئەمریکا"یە و توانای ئەوەتان هەیە هەر وڵاتێک بتانەوێ بە ساناییی داگیری بکەن بەڵام لەو وڵاتانەی داگیرتان کردووە لە هیچیان سەرکەوتنتان بەدەست نەهێناوە و جێی خۆتان نەکردۆتەوە لە ناو جەماوەر بۆ نموونە لە عیراق چەند هێزەیەک هەیە. یەکێکتان پێوەندی بە جەماوەر ناکەن، گرێبەست لەسەر مرۆڤ دەبەستن، لە کوردستانی باشوور تەنها دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی دەکەن، شەقامی کوردی بەرانبەر بەمە رەشبینە؟

"وینستۆن شرشل" لە ساڵی 1941 لە کۆبوونەوەیەکی رۆژنامەگەریدا دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا کە ئەنجامی ئەدەن یەکەم جار رێگایەکی هەڵە دەگرنە بەر لە ئەنجامدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، دواجار رێگە راستەکە دەگرنە بەر و سەرکەوتن بەدەسی ئەهێنن.

ئەگەر هەڵبژاردن لە سەرانسەری کوردستانی گەورە بە ئازادی و دیموکراتی و شەفافی بکرێت زۆرینەی هاووڵاتیانی کورد داوای دامەزراندنی حکومەتی کوردی دەکات. جێبەجێکردنی بە پلەی 180 دەرەجە دەڤەرەکە دەگۆڕێ. ئەمن و ئاسایش بەرقەرار دەبێت. ئێران و عیراق و تورکیا و سوریا پارچە پارچە دەبێت وەکوو یوگسلاڤیا.

وتی ئێمە دوو برادەرمان هەیە لە کوردستان، مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی تۆش ئۆپۆزیسیۆنی، لە عیراق وەرە دەرێ رووبکەرە هەر باڵیۆزێکی ئەمریکی ئێمە وەرت دەگرین.

وتم ئەگەر لە هەڵوێست و پرۆگرامتاندا هەیە دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی گەورە، بەندە ئامادەم لە خزمەتی سەرۆک بوشدا بم بە ناوی مستر ئێکس، بەڵام بۆ پەنابەری رووناکەمە ئەمریکا.

کۆبوونەوەکە ماوەی دو سەعات و پازدە خولەکی خایاند، بازیان و رەوەزی کورم لەگەڵ ئەوەکەم باوان بازیان ئامادەی بوون.

تێبینییەک:

ناچارم کرد هێنامە قسە، ئەو هاوڵاتییەی دەیەوێت لەخزمەتیاندا بێت دژی کورد نین، بەڵام دامەزراندنی حکومەتی کوردی لە هەڵوێست و پرۆگرامی ئەمریکادا نییە، دەرکەوت کە مەسعود و جەلال جێی باوەڕن، چەندها ساڵە لە خزمەتی ئەمریکادان.

2لە مانگی دەی ساڵی 2005 هاوڵاتییەکی ئینگلیزی بە ناوی ئۆلیڤەر سەردانی کردمOliver . دەقی ئەو گفت و گۆیەیکە لەگەڵ ئە و لێپرسراوە ئەمریکییە کردبووم دووبارەم کردەوە و ئاگادارم کرد. دوای یەک هەفتە ئۆلیڤەر هاتەوە لام . وتی باوکم باڵیۆزی بەریتانیایە لە تورکیا و ئەڵێت رەفیق پشدەری لە کوردستان بێتە دەری، لە هەر وڵاتێک سەردانی باڵیۆزخانەی ئیگلیزی بکات ڤیزای پێدەدەن، ناوی لە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزی هەیە.

تێبینی:

کە لە ساڵی 1981 لە لەندەن بووم بە بێ ئەوەی داوای ئیقامە و مانەوە بکەم، ئەوە بوو نووسراوێکیان ئاراستە کردبووم، ناوەڕۆکەکەی ئەوە بوو کە خۆشحاڵ دەبن بە مانەوەم و شوناسنامەی ئینگلیزیم پێدەدەن.

لەو برا بەڕێزانەی کە ئاگاداریان هەبوو و ماون لە ژیاندا دۆکتۆر لەتیف رەشیدە. ئەوە بوو لە لەندەنم بەجێ هێشت، نەبووم بە سیخور، ئەمە پێشکەش بە جەلال و مەسعود و کۆمپانیەکەیان بێت.

رۆژی 2005/11/11 گەیشتمە ستۆکهۆڵم ///

کە هاتمە دەرێ هاوسەرەکەم و کاکە بەختیار ئیسماعیل، خوارزام، چاوەڕوانیان دەکردم، دوای پازدە رۆژ پشوودان تەلەفوونم بۆ ئەو هەڤاڵە بەڕێزانەم کرد کە پێش هاتنە دەرەوەم لە کوردستان ئاگاداری بارودۆخی ژیانم بوون، سەفەرم کرد بۆ هۆڵەندا و چەند رۆژێک میوانی ئەو برا بەڕێزانەم بووم بە ناوی دکتۆر جەمیل شەرەف و کاکە کەیهان.

دەقی ئامۆژگارییەکانم ئەنجامدا، کە لە وڵاتی سوید خۆم تەسلیم کەم و هەتاکوو ئیقامە وەرنەگرم جموجۆڵی سیاسی نەکەم.

لە رێکەوتی 30.01.2006 خۆم ناساند بە نووسینگەی پەنابەران لە شاری یۆتۆبۆری:

پرسیار: ناوت؟

وەڵام: رەفیق پشدەری، کوردم ئاینم ئیسلامە، نووسەرم

پرسیار: وەرگێر سۆرانی یان بادینانی بێت؟

وەڵام: عەرەب بێت!

وتی سەعات دەی بەیانی لێرە بیت.

رێکەوتی 01.02.2006 دیداری کردم، پرسیاری کرد تۆ کوردی و هۆی چییە داوای وەرگێری عەرەب ئەکەی؟ وتم: لەدەست مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی رامکردوە.

پرسیار: لە 11.11.2005 گەیشتیتە ستۆکهۆڵم بەڵام دوای دوو مانگ ئینجا خۆت تەسلیم کرد بۆچی؟

وەڵام: لەسەر بڕیاری هەڤاڵانی سیاسیم کە لە ئەورووپا دەژین وڵاتی سویدیم هەڵبژارد.

پرسیار: بار و دۆخی ماڵیت چۆنە؟

وەڵام: بۆ پارە نەهاتوومەتە ئێرە، ئیوەی سویدم بدەنێ لێرە نابم، کەی یاسا حوکمی کرد و مافی مرۆڤ بەرقەرار بوو ئەگەڕێمەوە کوردستان.

پرسیار: پارێزەرت هەیە یان بۆت دیاری بکەین؟

وڵام: پارێزەرم پێویست نییە، ئەگەر کێشەی خۆم چارسەر نەکەم چۆن ئەتوانم خزمەتی گەلی کورد بکەم.

وتی نیشانت دیاری بکە پارێزەر پێوەندیت پێوە دەکا!

پارێزە (Marianne Andersson ماریا ئەندێرسۆن) وتی: چەندەها پرسیار و لێکۆڵینەوە و روونکردنەوەت لەگەڵ دەکەم هیچم لێ نەشارێتەوە، بە تایبەتی ناوەرۆکی کتێبەکان و نهێنییەکانت، تاکوو کارەکەت بۆ سانایی بکەم.

لە مانگی 3 و 4ی 2006 چوار جار کۆبووینەوە و وتو وێژمان کرد. ماریا وتی خۆشحاڵ بووم بە ناسینت، بەردەوام باست ئەکەم. یەکسەر ئیقامە وەردەگریت بەڵام دو ئامۆژگاریم هەیە: ناوی ئەو کوردە مەهێنە کە میقداری چوار هەزار دۆلارت داوەتێ، وەکوو لەگەڵ من بە دوور و درێژی سەداسەد هەموو شتێکت ئاگادار کردم لە چاوپێکەوتن وڵامیان بە کورت بدەو

تێبینی:

ماریا ئەندرسۆن تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵە و بە رەگەز سویدیە و ناسراو و شارەزا و سەرکەوتووترین پارێزەرە لە یۆتۆبۆری لە ئیش و کاری پەنابەران و هاووڵاتی کوردی زۆر خۆش دەوێ.

4/ نووسینگەی پەنابەران لە شاری یۆتۆبۆری:

لە سەعات دەی بەیانی 15.05.2006 دیدار و گفت و گۆ و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردم، ئامادەبوان لێپرسراو یارمەدەری و پارێزەر و وەرگێر بوون.

لێپرسراو وتی: ئەم دانیشتنە داخراو و نهێنییە و ناچێتە دەرێ.

وتم: هیچ شتێکی شاراوەم نییە، شانازی بەوە دەکەم کە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی-گشتی و خودی شەخسی سەدام حسین کار و باری سیاسیم ئەنجام داوە. ئەگەر رێگام بدەن هەموو شتێکتان ئاگادار دەکەم. بەندە سەر بە هیچ گرووپێکی سیاسی نیم و پێوەندیم بە حکومەتەکانی جیهانی نییە، بە تایبەتی دژی داگیرکەرانی کوردستانم.

ئینجا چەند پرسیارێکیان ئاراستە کردم:

1. نیازت هەیە حیزبی سیاسی دابنێیت؟

وتم: ئەگەر حیزبێکی سیاسی دامەزرێنم جەلال و مەسعود رێگا نادەن ئەشو و نوما و سەرکەوتن بەدەست بهێنم، دوو بەرەکی و ئاکۆکی و ئاژاوەم بۆ درووست دەکەن. باشترین رێگا بە تەنها کاری سیاسی ئەکەم.

2. هۆی چی بوو دوای رووخانی سەدام حسین هەوڵی تیرۆریان دای؟

وتم: لەو کتێبە بە دوور و درێژی ئاماژەم پێداوە، پێویست بە دووبارە ناکات.

3. شارەزاییت چییە؟

وتم: سیاسەت، هەواڵگری و پێشبینی.

چەندەها رووداوم بە نموونە بۆ هێنایەوە کە ئەنجامم داوە و لەو کتێبەدا ئاماژەم پێداوە. سیاسەتمەدارانی سویدی دەورێکی دوولایەنەیان بینیوە، توانیوتانە لە جەنگی جیهانی دووهەم وڵاتەکەتان بپارێزن لە جەنگ ئەدۆلف هیتلەر و وینستۆن شرشل، کە ئێوە بێلایەنن و سەربەخۆ.

لە کاتێکدا حکومەتی سویدی کەرەستەی جەنگی بۆ هیتلەر دەنارد.

4. ئەخشە و پرۆگرامت چییە؟

وتم: لە رابردوو بارو و دۆخێک بۆ بەندە هاتە پێشێ، رووبەروو لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان گفت و گۆ و لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کردن، گەیشتمە ئەو باوەڕە هەتا هەتایە حکومەتی تورکیا و کۆماری ئیسلامی ئێران و سوریا دان بە مافی نەتەوایەتی کورددا نانێن.

بە پێی ئاگاداری خۆم ئەمریکا و بریتانیا رەوتی سیاسەتی داگیرکەران پێرەو دەکا، لە ئەرشیفیان دامەزراندنی حکومەتی کوردی نییە؟ مەحاڵە 43 ملیۆن کورد هەر هەمووی تەسلیم بە ئیرادەی داگیرکەران و ئەمریکا و بریتانیا بێت. ئەگەر لە کەش و هەوایەکی ئازاد و دیموکراتیدا هەڵبژاردن لە سەرانسەری کوردستانی گەورە بکرێت زۆرینەی هاوولاتیانی کورد داوای دامەزراندنی حکومەتی کوردی دەکەن. بارو دۆخی ئەمریکا ماهییەتی هاتە خوارێ لە دوای ساڵی 2005ەوە. لە ئێستاوە چین و بازاری یەکگرتووی ئەورووپا ئەشو نوما دەکەن، دوای چەند ساڵێکی کە بەرانبەر ئەمریکا رادەوەستن، دوارۆژی ئەمریکا لە چوارچێوەی سنووری جوغرافیای خۆی تێپەڕ نابێت، وە ئەو دەورە پۆلیسییەی ئێستا هەیەتی کۆتایی پێدێت. وتم بەڕێز بۆ گەشت و گوزار و پشوودان نەهاتووم تکایە وڵامم بدەنەوە ئیقامەم ئەدەنێ یان روو لە وڵاتێکی دیکە بکەم هەر ئێستا.

وتی: شایانی باس کردنی مرۆڤێکی زانا و دانا و عاقڵ و تێگەیشتوو لە شێوەی تۆ تەنها یەک عەرەبی عیراقیم دیوە، وا بڕیارم دا ئیقامەت بدەینێ بە پلەی A و پاسپۆرتی سیاسیت هەبێت بۆ ئەوەی کارەکانت ئەنجام بدەیت.

بە دەستە پیرۆزەکەی خۆی قاوەی پێشکەش کردم و وتی: پارێزەر کاتی نییە ئەگینا هەموو رۆژەکەم لەگەڵ تۆدا دەبردە سەر، ئەوەندە شارەزایت مرۆڤ زۆر سوود لە تۆ وەردەگرێت.

وتم: سپاس بۆ جەنابی Arne Malmcrin "ئارنە مالمکرێن"، نووسینگەی پەنابەرانی سوید و حکومەتی سوید. بۆ ئاگاداری لەو کتێبەی لەبەردەستت دایە سوپاسی حکومەتی سویدم کردووە کە میوانداری هەزارها خانەوادەی ئاوارەی کوردتان کردووە کاتێک کە ئاماژەم پەوە داوە لە ساڵی 2001 ئەمدەزانی بەندە لە ساڵی 2006 داوای ئیقامە دەکەم.

تێبینی:

1. ئاگادارم کردن کە یەکەم سەفەر سەردانی ئیسرائیل دەکەم تاکوو بزانم لە ئەرشیفی ئەوان چی تێدایە بەرانبەر گەلی کورد!

2. ئەو لێپرسراوە ئەوەندە بەڕێز بوو شایستەی ئەوەیە کتێبی لەسەر پڕ کەمەوە.

3. وەگێڕ خوشکە گوڵزار عەلی ئەمین بوو، ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ، کوردێکی نیشتمانپەروەر، یەکەم جار لەبەر ئەوەی ماهییەتی بەندەی ئەدەزانی جار جار گرژ دەبوو، وتی کاکە رەفیق تۆ هاتووی ئیقامە وەرگریت تۆ ناهێڵی ئەوانە قسە بکەن.

5 - بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی پۆتۆپۆری "سی. پی. ئۆ" C.P.O

لە 21.05.2006 کۆبوونەوە و وتو وێژمان کرد، بەشی هەرە زۆری کە لە نووسینگەی پەنابەران دووبارەم کردەوە.

وتی: پرۆگرام و ئەخشەت چییە؟

وتم: دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی گەورە.

وتی: سوودی بۆ ئێمە چییە؟

وتم: ئەگەر بەو شێوەی ئێستا پەنابەرانی کورد روو بکەنە ئەورووپا دوای چەند ساڵێکی کە رێژەی هاوولاتیانی کورد دەگاتە چەند ملیۆن، بەڵام کە حکومەتی کوردی دامەزرا لە سەدا 75ی پەنابەران دەگەڕێنەوە کوردستان.

وتی: لە وڵاتی سوید 70 نەتەوەی بیانی ژیان دەباتە سەر، ئێمە زۆر رازین لە هاووڵاتیانی کورد، نامانەوێت پەنابەرانی کورد دوای دامەزراندنی حکومەتی کوردی بگەڕێنەوە کوردستان چوونکە لە بەرژەوەندی وڵاتی سوید نییە.

بەندە یەکجار خۆشحاڵ بووم کە بەڕێوەبەری هەواڵگری گشتی شاری یۆتۆبۆری بەم شێوەیە هاووڵاتیانی کوردی هەڵسەنگاند کە لە ناو 70 نەتەوەی بیانی جێگای خۆیان کردۆتەوە. ئاگادارم کردەوە کە پاسەپۆرتی سیاسییان دامێ سەردانی ئیسرائیل دەکەم، ئایا بەرانبەر دامەزرانی حکومەتی کوردی کۆمەک و یارمەتیمان ئەدەن یان رەشبینن؟!

6

خوێنەری هێژا!

لە 22.07.2007 لەگەڵ هەڤاڵێکی رۆشنبیر و نیشتمانپەروەر سەردانی باڵیۆزخانە ئیسرائیلمان کرد لە ستۆکهۆڵم. خۆم پێناساندن:

ناوم رەفیق مامە سادق ناسراو بە رەفیق پشدەری، کوردم ئاینم ئیسلامە. وتم پێش هەزار ساڵ هێزێکی سوپای ئیسلامی لە کەنداوی عەرەبستانەوە رووە و کوردستان هات کە ئایینی ئیسلام بڵاوکاتەوە تاکوو گەیشتە شارۆچکەی "جەلەولا"، کە ئەوەد کیلۆمیت دوورە لە بەغداد، سەرلەشکری سوپاکە وتارێکی ئاراستەی ئامادەبوان کرد، بەم سێ خاڵانەی خوارەوە کۆتایی بە کۆبوونەوەکەی هێنا:

1. ناوی خۆتان و گوندەکانتان بگۆڕنە سەر زمانی عەرەبی لە شێوەی قورئاندا.

2. لە پێناو ئەوەی بێنە سەر ئایینی ئیسلام هەر یەک لە ئێوە سێ جار شەهادەت بهێنن.

3. ئەتانەوێ بچنە بەهەشت، سەلەشکرەکە فەرمانی دا بە سوپاکەی کە کارەکە جێبەجێ بکەن کتوپڕ دە هەزار هاووڵاتیانی کوشت ئینجا شارەکەی تاڵان کرد و نێر و مێی بۆ خۆیان برد و حەڵاڵیان کرد.

بەندە ئەوە و شتی کەش ئەزانم ئینجا رۆژی پێنج جار نوێژ دەکەم و رۆژووش دەگرم، ئەمە میراتی باوک و دایکمە بۆم ماوەتەوە، وە کە سەفەری ئیسرائیلم کرد مزگەوتی قودس زیارەت دەکەم.

ئەمە یەکەم جارە کوردێکی سیاسی خەتی سوور بچڕێنێت بە ئاشکرا سەردانی ئیسرائیل بکات لە پێناوی بەرژەوەندی کورد و جوولەکەدا، رێژەی ژمارەی ئیسلام نیزیکەی یەک میلیارد و چوارسەد و پەنجا ملیۆنە، زۆرینەیان ئامادەن ئەگەر بارو دۆخێک رووبدات حکومەتی ئیسرائیل لە ناو بەرن...

نەتەوەی کورد بە گشتی ئەو هەڵوێستەی نییە بەرانبەر ئیسرائیل.

ئەگەر بەراوردی مانگی چواری ساڵی 2003 لەگەڵ ئێستای ساڵی 2007 بکەیت،( بە هۆی ئەو پەیڕەوەی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی کە دیکتاتۆریەت و خێڵەکییان بەکار هێنا(فەسادی ئیداری و دارایی، گەندەڵی ئەخلاقی) و تەسلیم بە ئیرادەی کۆماری ئیسلامی ئێران و تورکیا و سوریا بوون)، بوو بە هۆی ئەوەی بۆشاییەکی گەورە درووست بوو لە نێوان جەلال و مەسعود لەگەڵ شەقامی گۆڕەپانی کوردستان، لە ئایندە دەسەڵات دەکەوێتە دەست جەماوەر، هەڵوێست وو پلان و ستراتیژییان جیاوازە، دژی داگیرکەرانی کوردستان رادەوەستن، بارو دۆخەکەم بۆ هەڵسەنگاند کە لەو کتێبە و چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەمریکییەکان نووسراوەتەوە، وە هەر وەها ئەو نووسراوەی کە ئاراستە تۆڵمرتم کرد ئاماژەم پێداوە، دووبارەی ناکەمەوە لێرە.

لە 26.06.2007 گەیشتمە ئیسرائیل، لە 27.06.2007 پەیامێکم ئاراستەی لێپرسراوێک کرد لە رێگەی بەرێز یافا خان.
لە 30.06.2007 بەرێز یافا وڵامی ئەو لێپرسراوەی دامەوە کە بەم جۆرە بوو:

ئێمە رەفیق پشدەری باش ئەناسین، رۆژانە بە چرکە و سەعات لە سەدا سەد ئاگاداری تەواومان هەیە دەربارەی بارو دۆخی هەرێمی کوردستان.

لە 02.07.2007 بە هۆی بەڕێز یافا خان راپۆرتێکم لە 63 لاپەڕەدا ئاراستەی لێپرسراوی حکومەتم کرد. لە 05.07.2007 یافا خان لە زمانی ئەو لێپرسراوە ئاگاداری کردم، وتی ناوەرۆکی راپۆرتەکە زۆر گرینگ و ترسناکە، کاتێکی زۆری دەوێت کە زانا و شارەزایان بابەت بە بابەت کۆبوونەوە و گفت و گۆی لەسەر بکەن جا لە ئێستاوە هەتاکوو چەند مانگێکی کە ئینجا وڵامی راپۆرتەکەی دەدەینەوە، وە خۆشحاڵ ئەبین چاوەڕوانی وڵامەکە بکات.

هەروەها بەڕێز مۆردخای و هاوسەرەکەی یافا خان وتیان ئێرە ماڵی خۆتە، تۆ میوان نیت بۆ بەرژەوەندی کورد بمێنیتەوە باشترە. لە 06.07.2007 گەرامەوە بۆ شاری یۆتۆبۆری. لە مانگی 8ی 2007 بەڕێز یافا خان پێوەندی پێوە کردم و گوتی: راپۆرتەکەت وەکوو خۆی گەڕایەوە ئایا چی لێبکەم، وڵامم دایەوە و وتم پێویستیم پێی نییە لە ناوی بەرن.

خوێنەری هێژا!

بە بۆچوونی خۆم حەتمەن دەزگای هەواڵگری "موساد" دەستی بەسەر راپۆرتەکاندا گرتوە، چوونکی لەگەڵ بار و دۆخی سیاسی ئیمڕۆیان ناگونجێت.

بەندە لە پێناو ئەوەی ئاگاداری رەوتی سیاسەتی حکومەتی ئیسرائیل بم بەرانبەر گەلی کورد ئەوە بوو "رەوتی هەواڵگری- مەخابەراتیم" وەرگرت بەرانبەر دەزگای "موساد"ی ئیسرائیل.

راپۆرتێکم ئامادە کرد پەیوەندیم بە بەڕێز یافا خان کرد و وتم خۆشحاڵ ئەبم کە بە دەستی خۆت ئەم راپۆرتە تەسلیم نووسینگەی خودی شەخسی سەرۆک ئەنجومەنی وەزیرانی ئیسرائیل بکەیت.

یافا خان وتی دڵنیا بە دەگاتە شوێنی دیاریکراو. ئیجا پێوەندیم بە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە ستۆکهۆلم بە "..." کرد و وتم راپۆرتێکم ئامادە کردوە بۆ خودی شەخسی ئۆلمرت، ئایا بۆم رەوانە دەکەن؟

وتی راپۆرتەکەت دەربارەی چییە؟

وتم دەربارەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و ناوەرۆکەکەی ترسناک و زۆر گرینگە.

وتی رەوانەی بکە ئەگاتە دەستی خودی خۆی.

لەگەڵ راپۆرتەکەی ئاراستەم کرد بۆ ئەوەی ئاچاری بکەم "میقداریێ کرۆنم دانا" کە تاکوو پرسیارم ئاراستە بکات.

لە باڵوێزخانەی ئیسرائیلەوە "..." تەلەفۆنی بۆ کردم وتی نووسراوەکەت گەیشت، بەڵام ئەو پارەیە چییە ناردووتە؟

وتم ئەگەر راپۆرتەکەت ئاراستە نەکرد تکایە بەو پارەیە بۆم رەوانە بکەوە، ئەوە بوو پارەکەیان بۆ ناردمەوە ئینجا دڵنیا بووم کە راپۆرتەکەیان رەوانە کردوە.

بۆ ئاگاداری لە 25.09.2007 هەردوو راپۆرتەکەم رەوانە کرد بە هۆی "یافا و باڵیۆزخانەی" ئیسرائیلی و لە ژێرەوە نووسیم دڵسۆزتان رەفیق پشدەری خزمەتکاری کورد و کوردستان.

لە 18.11.2007 بەڕێز یافا خان تەلەفۆنی لەگەڵدا کردم، وتی: ئەمە پەیامی حکومەتی ئیسرائیلە دەربارە وڵامی راپۆرتەکەت: ئێمە رەفیق پشدەری باش ئەناسین، پرۆگرام و سیاسەت و ستراتیژیەتی ئێمە گۆرانکاری بە هیچ شێوەیەک تێدا نییە و دەستکاری کێشەی کورد ناکەین.

دەقی ئەو راپۆرتەی کە لە 25.19.2007 ئاراستەی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی ئیسرائیلم کرد لە پاشکۆی کتێبەکەم ئاماژە پێداوە.

روون کردنەوەیەک:

جیاوازییەکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان جوولەکە و سەهیۆنییەت دا، هەموو هاووڵاتییەکی جوولەکە سەهیۆنی نییە، هەڵوێست و بیر و بۆچوون و ستراتیژیەتی وەک سەهیۆنییەت نییە و فکر ناکاتەوە.

سەهیۆنییەت چییە؟

ترسناکترین دەزگایە وە خاوەن گەورەترین دەسەڵاتە لە سەرانسەری جیهاندا، دوژمنی زۆرینەی نەتەوەکانی جیهانن بە تایبەتی کورد و عەرەب، وە دژی ئایینە ئاسمانیەکانن قورئان و ئینجیل، سەهیۆنییەت و تورانییەت یەک پرۆگرامیان هەیە لە ڕێگای هێزی عەسکەرتاری و داگیرکردنی وڵاتان و تیرۆر کردنی هاووڵاتیان بە کۆمەڵ، وە سەرکەوتنیان لە ڕێگەی سی ئای ئەی و موساد و میتی تورکی جێبەجێ دەکرێت، مەرج نییە هەموو هاووڵاتییەکی تورک تۆرانی بێت.

زۆرینەی هاووڵاتیانی کورد لە هەموو چین و توێژەکاندا لە ڕوانگەی خۆیاندا حیسابێکی تایبەتی بۆ حکومەتی ئیسرائیل ئەکرد کە لە هەموو بوارێکەوە یارمەتی گەلی کورد ئەکەن لە پێناو دامەزراندنی حکومەتی کوردی. منیش یەکێک بووم.

کە گەرامەوە ئەمەم بە ڕاشکاوی بڵاوکردەوە لە ناو هاووڵاتیانی کورد و عەرەب.

هەرچەندە ئەوانەی سەردانی حکومەتی ئیسرائیل) یان کردبوو بۆ نموونە:

مەلامستەفا بارزانی و جەلال تاڵەبانی و مسعود بارزانی) ئەو خیانتکارانە چۆنکی ترسنوک و نفس نزم و پارە پەرستن هەتاکو ئیستاکە ئەو ڕاستیەیان لە شەقامی کوردی شاردوتەوە لەبەر بەرژەوندی تایبەتی خۆیان.

بەندە بەڵگەم هەیە کە لە نیوان بنەماڵەی شیخانی بارزانی و حکومەتی ئیسرائیل لە ساڵی 1972 ئەو پەیوەندیە و گرێبەستەیان کرد هەتاکوو ئیستاکە بەردەوامە.

جا بەندەش لە پێناو ئەوەی کارەکەم جێبەجێکەم و بە سلامەتی بەگەڕێمەوە هەنگاوی (هەوالگەریم) ئەنجام دا:

لە2.6.2007 پەیوەندیم بەو کادرەی دەزگای پاراستن کرد کە لە 10.7.2005 و 20.6.2007 لەلایان مسعود بارزانی) ناردەرابوو وتم: تکایە بارەگای بارزانی پەیوەندیم پێوە بکەن پەیامێکم هەیە ئاراستەی سەروکی بکەم.

لە 5.6.2007 سیخوڕیکی پاراستن بە ناوی (شاخەوان) تەلەفوونی بۆ کردم پرسیاری ئاراستە کردم پەیامەکەت چەیە.

پیشەکی سەلاو ڕێزم هەیە بۆ سەرۆک دوعای تەمەن دەریژی بۆ ئەکەم و هەروەها بۆ کاک نیچیرفان و کاک مسرور وتم: ئەو کێتبانەی بڵاومکردوتەوە ناوی سەروکی کورد کوردستانم هێناوە کە بارزانی سەردانی ئیسرائیلی کردوە، تازە ئەو کێتبانە کوناکرێتەوە، بەڵام وا وردە وردە ناوەروکی کێتبەکانم ئەسرمەوە، ئەمە یەکەم جارە کوردیکی سیاسی خەتی سوور بچرنیت و سەردانی ئیسرائیل بکات.

بۆ جاری دووەم لە مانگی( 10) ساڵی 2008 پەیوەندی تەلەفونیم لەگەڵ ئەو کادرەی دەزگای پاراستن کرد پەیامیکم ئاراستەی سەرۆک کرد:

ناوەروەکەکەی: سکالاکەم پارانەوەو لێبووردن بووکە بە گەورەی خۆی بمبەخشیت.

لە 7.12.2008( هەڤاڵی نیشتیمان پەروەرو و شورشگیر...) پەیوەدی پیوە کردم وتی: چوار میلیشیای مسرور بارزانی هاتوون تیرورت کەن.

وتم: با ئەم هەواڵە بڵاونەبێتەوە.

لە 11.12.2008 پەیوەندی تەلەفونم لەگەڵ ئەو کادرەی دەزگای پاراستن کرد وتم: هاوسەرەکەم هاتە سولیمانی کەی کیشەی خانوویی جیبەجی کرد ئەگەڕیمەوە سولیمانی، و سلاو ڕێزم هەیە بۆ سەرۆک.

لە 14.12.2008 سکاڵایەکم ئاراستەی پولیس کرد دەربارەی بارودوخی ژیانم.

کتوپڕ بە دەنگمەوە هاتن ئامۆژگارییەکی زۆریان کردم. کاتیان بۆ دانام.

لە18.12.2008 کۆبووینەوە: بە دووروو درێژی بارودۆخی خۆم بۆ باسکردن.

وتیان: کورییکی رۆژنامەگەرییت بۆ ئەنجام دەین

وتم: نەخێر بەڵام هاتووم ئاگادارتان کەم ئەگەر تیرور کرام بە فرمانی (مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی)ە

وتی: چیت بۆ بەکەین:

وتم: نامەوێت ئەم هەواڵە بڵاوبێتەوە با نەهێنی بێت تاکوو کیتبەکەم بڵاو دەکەمەوە.

وتی: تو چیت پیی دەکرێت بەرامبەر( مسعود و جەلال)

وتم: من حەزرەتی موسام، چوون کە حەزرەتی مووسا بەرامبەر (فرعون) راوەستاو لە ناوی برد بەندەش بە عەقل بەرامبەریان رادەوستم کورسیەکەیان لە ژێر دەردینم.

وتی: تۆ خۆت چارەی خۆت دەکەی پیوستیت بە یارمەتی نییە.

وتم:ئیمە کیانمان نییە، گەلی کورد شارەزاییکی تەواوی هەیە، من خۆم لە ئیوە گەلیک زیاتر شارەزاییم هەیە دەربارەی هەوالگری پیوستم بە رێنمای ئیوە نییە، دەزانم چوون خۆم بەشارمەوە لە ئیستاوە هەتا چەند مانگیکی کە لە ماڵەوە دەرناچم تەنیا یارمەتیم بدەن خانووکەم بەگوازمەوە.

دانیشتنەکە 3ساعەتی خایاند وەرگیر خوشکی بەرێز (گولزار ئەمین )بوو

تیبینی:

1. پەیوەندیم بە بالیوزخانە کرد و ئاگادارم کردن کە چە ساتیک ئەگەمە ئیسرائیل، ئینجا پرسیارم کرد دەربارەی چاوپیکەوتنو کوبوونەوە لەگەڵ لیپرسراوان(...هتد)

وتی: پەیوەندیت پیوە ئەکەن

2.کە گەیشتم پاسپورتەکەم تسلیم کارمندەکە کرد، بە گەرمەوە بەخیرهاتنی کردم وتی: چەند مانگ ئەمینیتەوە.

وتم یەک مانگ، پرسیار و لیکولینەوەیان لیی نەکردم، و ساکەکەم نەگەران جی سەرسورمان بوو لەلای بەرێزان یافا و موردخای.

3. کەس پەیوەندی پیوە نکردم، و لە وەلامدانەوەی پەیامەکەم زۆر سارد بوون، گەیشتمە ئەو باوەرە دەربارەی دامەزراندنی حکوومەتی کوردی لە ئەرشیفی حکوومەتی ئیسرائیل نییە،پیلانو نەخشەی( موساد) ئەوەیە کە من بچمە ناو بازنەکەیان، فکرم کردەوە چون بە سەلامەتی خۆم رزگار بکەم ئەوە بوو راپۆرتیکم بۆ ئاراستە کردن.

4.کاتی خۆی کە مەلا مستەفا و (جەلال تالەبانی و مسعود) پەیوەندیان کردوە لە پێناوەی بەرژەوەندی کورد و جولەکە کە هاتوونەتە ناو بازنەکە تسلیم بە ئیرادی دەزگای هەوالگری( موساد)بوون، لەبەر چەند هۆیەک خۆیان رزگار نەکردوەو لە ئیسرائیە.

5. ئاگاداریان کردم کە 12 کادری کومپانیای جەلال و مسعود) سەردانی ئیسرائیلیان کردەبوو، جی سەر سورمانە دەزگای پاراستن هەرهەمویان ئەوە دەزانین کە بنەماڵەی شیخانەی بارزانی بەتایبەتی شەخسی مسعود) پەیوەندەی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ دەزگای (موساد) ئەمە بە راشکاوەی ئەزانن ئەلین مسعود بارزانی ئەم سیاسەتە بەرێوە ئەبات لە پێناوی بەرژەوەندی گەلی کوردە و خودیخوشی بەپارزیت، و هەروەها سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان هەرهەمووی ئەوە دەزانن بەڵام لە راست ئەم خەیانەتە بی دەنگن.

